میتۆدەکانی توێژینەوە لە

# کۆمەڵناسی

هەنگاوەکانی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی

ئیبراهیم ئەبراش

و: دیدار ئەبوزێد

دکتۆر ئیبراهیم ئەبراش

# میتۆدەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسی

## هەنگاوەکانی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی

وەرگێڕانی : دیدار ئەبوزێد

پێداچوونەوەی زانستی و بەراوردکردنی :
د. محەمەد شوانی

پێداچونەوەی زمانەوانی :
کارزان گلی

هەولێر/ ٢٠١٣

■ ناونیشانی کتێب: **میتۆدەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسی، هەنگاوەکانی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی**
■ نوسینی: **د. ئیبراهیم ئەبراش**
■ وەرگێڕانی: **دیدار ئەبوزێد**
■ پێداچوونەوەی زانستی و بەراوردکردنی : **د. محەمەد شوانی**
■ پێداچوونەوەی زمانەوانی: **کارزان گلی**
■ تایپکردن: **وەرگێڕ**
■ دەرهێنانی هونەری ناوەوە : **خەلیل هیدایەت مام شێخ/ ٤٩٢٤٢٦٣**
■ نۆرەی چاپ : **یەکەم – هەولێر/ کوردستان ٢٠١٣.**
■ تیراژ: (١٠٠٠) **دانە**
■ نرخ: (٨٠٠٠) **دینار**
■ شوێنی چاپ : **چاپخانەی رۆژهەلات- هەولێر/ ٤٦٣٩٥٣١**
■ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٩) ی ٢٠١٣ پێدراوە.

**لە بلاوكراوەكانی كتێبخانەی ئاوێر ژمارە ( ١١٩ )**

سەرچاوە:

د. ابراهيم ابراش ،المنهج العلمي و تطبيقاته في العلوم الاجتماعية ، عمان، دار الشروق للنشر و التوزيع، ٢٠٠٨.

## ناوەڕۆك

**نوسەر لەچەند دێرێکدا**

- لە غەزە (فەلەستین)لەدایکبووە.
- هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە یاسای گشتی (زانستە کۆمەڵایەتییەکان).
- مامۆستای خوێندنی باڵایە لە کۆلێژی ماف (ئاکدال) و کۆلێژی ماف لە (سوێس) ریبات.

ئەم کتێبانەی خوارەوەی نوسیووە:

- البعد القومي للقضية الفلسطينية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٨٧.
- البحث الاجتماعي، قضاياه، مناهجه، منشورات جامعة القاضي عياض، مراكش ١٩٩٤.
- المؤسسات و الوقائع الاجتماعية، نظرة تاريخية عالمية، مطبعة دار الشمال، الرباط، ١٩٩٤.
- علم الاجتماع السياسي، مطبعة دار السلام، الرباط ١٩٩٧.
- تاريخ الفكر السياسي (من الملوك الالهة الى عصر النهضة)، مطبعة دار السلام، الرباط، ١٩٩٧.
- الحركة العربية القومية في مائة عام (١٨٧٥_١٩٨٢)، عمل جماعي تحت اشراف ناجي علوش، دار الشروق للنشر و التوزيع، عمان ١٩٩٧.

**ئەمە جگە لەوەی چەندین وتار و توێژینەوەی دیکەی نوسیوە لەبارەی هزری سیاسی عەرەبی و پرسی فەلەستینی و پرسە نەتەوەییەکان کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبییەکان بڵاوی کردۆتەوە.**

# بۆ وەرگێڕان

هۆکار و رێگاکانی دەوڵەمەند کردنی کولتوور و بواری رۆشنبیری و ئەکادیمی هەر کۆمەڵگایەك جۆراوجۆرن، هەوڵ و ماندوبونی سەرجەم چین و توێژەکانی گەرەکە، وەرگێرانیش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بە درێژایی چەندی سەدە کاریگەری قوڵی لەسەر بڵاوکردنەوەی کولتورە جیاوازەکان و لەیەکتر گەیشتن و زیاتر لەیەك نزیکبونەوەی نەتەوەکان هەبووە، یارمەتی گەشەسەندنی فیکری مرۆیی داوە، رێگایەك بووە بۆ بەرزترکردنەوەی ئاستی هزری مرۆڤایەتی و پڕکردنەوەی کەلێنی زانستی و مەعریفی و ئەدەبی کۆمەڵگاکان.

قسەیەکی زۆر لەسەر ئەوە هەیە کە ئایا وەرگێڕان پرۆسەیەکی ئەخلاقی و مەعریفی قوڵە، یان بریتییە لە رێگایەك بۆ خستنە سەر کاغەزی ناوی وەرگێڕەکە؟ بۆچی و چی وا دەکات کەسێکی کارێکی دیاریکراو هەڵبژێرێت و بیخاتە سەر سەر زمانی خۆی؟ لەم وڵاتانەی کە نێوەندە ئەکادیمی و رۆشنبیرییەکەیان تاڕادەیەك کەلەپورێکی جێگیر هەیە و ئاستێکی بەرزی بڕیوە، وەرگێڕان بە پرۆسەیەکی مەعریفی رۆشنبیری زانستی دادەنرێت، کە

پایەیەکی بەرزی لە نێوەندەکەدا هەیە، چونکە بە سەرچاوەیەکی گرنگی وەرگرتن و سود مەندبوون دادەنرێت لە سەرچاوە مەعریفی و زانستییەکانی دونیا، میتۆد و تیۆر و چەمك و شێوازی بیرکردنەوەت دەخاتە بەردەست، ئەگەر وەرگێڕان نەبێت خوێنەرەکان تەنیا لە چوارچێوەی یەك تاکە شێوازی بیرکردنەوە و چەند کتێبێکی دیاریکراو دەمێننەوە، وەرگێڕان یارمەتیت دەدا ئاشنا بی بە هزری ئەو بیرمەندانەی کە تۆ ناتوانی بە زمانە رەسەنەکانیان بیانخوێنیەوە. هەرچی پەیوەندی بە هۆکارەکانی هەڵبژاردنی کتێبێك هەیە بە دیاریکراوی، ئەوە زۆرجار پەیوەندی بە خولیا و حەزی وەرگێڕ یان پەیوەندی بەو دەزگایە کە چەند کتێبێك بۆ وەرگێڕەکە هەڵدەبژێرێت، ئەمەی یەکەم حاڵەتی باوە لە کوردستان چونکە ئەو دەزگایانەی کە بەم کارە هەڵدەستن یان ژمارەیان کەمە، یان هاوڕێیەتی و دۆستایەتی رۆڵی تێدا دەبینێ، یان هیچ یارمەتییەکی وەرگێڕ نادەن بۆ ئەوەی بتوانێت کارەکەی ئەنجام بدات، لە ئەزمونی تایبەتی خۆم بۆم دەرکەوتووە، کە ئەگەر تۆ نەتوانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێزت هەبێت لە نێو دەزگاکانی چاپکردن لە کوردستان، باشترین کتێب وەربگێڕی پێویستت بە سێ ساڵ سەرەگرتنە بۆ ئەوەی بە چاپێکی خراپ و بە هەڵەی زۆرەوە بۆت چاپ بکەن، پەتای خزمایەتی و دۆستایەتی هیچ دەزگایەکی چاپی کوردستانی لێ بەدەر نییە.

یەکێك لە ئیشکالیەتەکانی وەرگێڕان ئەوەیە تۆ ناتوانی پێناسەیەکی کۆنکریتی بۆ دابنێیت، چونکە بە گۆڕانی ئەو بوارەی کە تۆ بابەتی تێدا وەردەگێڕی شێوازی وەرگێڕانەکە و ئاستی گەیاندنی مانا و رستەسازی

دەگۆڕێت، بۆ نمونە ئەوەی ڕۆمانێك دەكات بە كوردی دەبێت زۆر وریاتر بێ چ لە گەیاندنی مانا یان دروستکردنی ئەو وێنە و پۆرترێتانەی كە ڕۆماننوس لە ڕۆمانەكەی كیشاویەتی، بەڵام ئەوەی كتێبێكی زانستی وەربگێڕێ، زیاتر پێویستی بە گەیاندنی مانایە ئەگەر هەندێك جار لەسەر حیسابی نەگەیاندنی شێوازی دەبڕینی نوسەرەكەش بێ، بۆیە وەرگێڕان كێشەیە هەم بۆ نوسەر و هەم بۆ وەرگێڕ.

ئەم كتێبەی بەردەستتان یەكێكە لە كتێبە زانستییە وردەكان لەبارەی میتۆدەكانی توێژینەوە لە كۆمەڵناسی، كە بە وردی هەنگاوەكانی توێژینەوە و ڕوماڵكردنی بابەتی لێتوێژراو دەكات، بەشێكی زۆری كەرەستە و ئامراز و ڕێگاكانی توێژینەوە تێدا باسكراوە، یارمەتیەكی باشی توێژەر دەدا بۆ ئەوەی بتوانێت لە هەڵبژاردنی بابەت و كێشە و گرفت و هەنگاوەكانی توێژینەوەكردن دووربێت لە چەند هەڵەیەكی زانستی كە ئێستا زۆرینەی توێژینەوەكانی كۆمەڵناسی تژییە پێی.

لە كۆتاییدا زۆر سوپاسی مامۆستای خۆشەویستم (د. محەمەد شوانی)( مامۆستا لە كۆلێژی ئەدەبیات/ بەشی كۆمەڵناسی) دەكەم كە پێداچونەوەیەكی زانستی وردی بۆ ئەم كتێبەی بەردەستتان ئەنجامداوە، هەروەها پێداچونەوەی بۆ كتێبی (تیۆرە كۆمەڵایەتییە پێشكەوتوەكان)یش كرد كە لە ساڵی ٢٠١٢ چاپكرا، بە یارمەتی ئەو وەرگێڕانەكانم كامڵتر بوون و زیاتر لە هەڵە دووركەوتنەوە. هەروەها سوپاسی هاوڕێی ئازیزم (كارزان گلی)

دەکەم کە بە وردی لەرووی زمانەوانییەوە بە کتێبەکەدا چۆتەوە و لایەنی زمانەوانی کتێبەکەی تۆکمەتر کردووە. کاری زانستی کارێکی دەستەجەمعییە بۆیە بە هەوڵی هەردوو بەڕێز کتێبەکە تەواو بووە.

**دیدار ئەبوزێد**

٢٠١٣/١/١٤

## سەرقەڵەمێک لە جیاتی پێشەکی

ئەگەر بە زمانێکی میکانیکی پێناسەی پرۆسەی پێداچوونەوە بکەین بە هەر وەرگێڕانێکدا، بە کورتی واتە بوونە فیلتەر! لە ئەستۆ گرتنی ئەم بوون بە فیلتەرە لە رووی ئاکاری و زانستیەوە کارێکی ئاسان نییە، بەڵام ئەوەی ناچارمان دەکات شان بدەینەبەر ئەم کارە سەخت و دژوارە، تەنیا و تەنیا هەژاری کتێبخانەی بەشی کۆمەڵناسی و هاندانی لاوە خوێن گەرمەکانمانە بۆ نوسین و توێژینەوەو وەرگێڕان و فێربوونی زمان و کارکردن لە کایەی زانست و رۆشنبیریدا.

یەکێك لە هۆکارەکانی پاشکەوتوویی هەر زمانێك، واتە مەترسی لە ناوچوونی هەر نەتەوەیەك، بەکار نەهێنانی زمانی نەتەوەکەیە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆیە هەمیشە لە پرسیاری پەرەسەندنی هەر زمانێکدا پرسیار لەسەر چەندایەتی ئەوانەی پێی دەنوسن؟ چەندایەتی ئەوەی پێی نوسراوە؟ کاریگەری ئەوەی پێی نوسراوە لەسەر نەتەوە ؟تا چەند بۆ سەردەمەکە گونجاوەو گەشەی کردووە؟؟ ،تا چەند توانای وەرگرتنی هەیەو چەندی وەرگرتووە ؟؟،تا چەند روخسارو سیما تایبەتەکانی خۆی پاراستووە؟ تا چەند لە ژێر کاریگەری زمانەکانی تردایە؟ لە هەمووی گرنگتر

تا چەند پێویستیە زمانیەکانی قۆناغەکە پڕ دەکاتەوە؟، کاتێك زمانێك یان شێوە زارێك لە بوارەکانی ئابوری و سیاسی و کارگێڕی فەرمی و سەربازی وئاینی و توێژینەوەی زاستی و...هتد بەکاردێت، جگە لەوەی بنچینەو پایەکانی بەردەوامی و گەشەکردنی خۆی جێگیر دەکات ،تەکانێك بۆ پێشەوە دەدات و پەرەدەستێنێت، بە تایبەتی زمانی توێژینەوەو زانست، گرنگی و رۆڵی بەهێزی هەیە لەبەرەو پێشبردنی هەر نەتەوەیەکدا ،رێك ئەم وەرگێڕانەی برای بەرێز کاك (دیدار ئەبوزێد)وەلآمێکە بۆ بەشێك لەو پرسیارانەو هێزو گوڕ و تینێکە بۆ بە زیندوو راگرتنی زمانی کوردی ،بەرزکردنەوەی ئاستی بەکارهێنانی ئەم زمانەیە، بۆ بواری توێژینەوەی زانستی لە کۆمەڵناسیدا، بە تایبەتی لەم قۆناغەدا بۆشاییەکی گەورە پڕ دەکاتەوەو دڵنیام ئەم کتێبە تا ماوەیەکی زۆر دەبێتە کتێبی کۆڵەپشتی زۆربەی توێژەرانی کۆمەڵناسی لە خوێندنی بەرایی و خوێندنی باڵآشدا، چونکە تا بە وردی ئەم کتێبە نەخوێنیتەوە نازانیت چ ئاستێکی فێرکردنی تێدایە بۆ توێژینەوە، هەر لە هەڵبژاردنی ناونیشان و پلان و هەنگاوەکانی توێژینەوەو بەکارهێنانی میتۆدو دیاریکردنی نمونەو تا نوسینی راپۆرتی کۆتایی توێژینەوەکە، بۆیە ئەگەر وەرگێڕانەکە، سەرەڕای پێداچوونەوە وبەراوردکردنی، کەموکورتی زۆریشی تێدا مابێت، هێشتا بۆ توێژەرانی کۆمەڵناسی یەکێکە لە کتێبە پێویستەکان، هیوادارم پێداچوونەوەکەم لە ئاستی گرنگی و پێویست بوونی ئەم کتێبە بێت، هیوای تەمەن درێژی و بەردەوامی نوسین و وەرگێڕان بۆ زۆر بەرێزو خۆشەویست کاکە (دیدار)دەخوازم ،کە لەو راستیە گەیشتووە: کۆمەڵگاکەمان چاوەڕوانی هەوڵ

و تێکۆشانی ئێمەیە، ئێمەش لە پێناوی ئەودا نابێت درێغی بکەین، چیمان پێ بکرێت دەبێ بیکەین.

**د. محمد شوانی**

**٢٠١٣/١/١**

## پێشەکی

بەلەبەرچاو گرتنی ئەو پەرەسەندنە خێرا و ڕووداوە چڕانەی کە دوو سیمای جیاکەرەوەی سەدەی بیستەمن، بایەخدانی مرۆڤی هاوچەرخ بە سەرجەم پێکهاتەکانییەوە بە سروشت زیاتر بوو، هەروەها لە خۆی و لەو ناوەندە کۆمەلآیەتیەش تێگەیشت کە تیایدا دەژیت ، چونکە جۆرە کۆنەکانی مەعریفە کە لە پێشوتردا مرۆڤ پشتی پێ دەبەست بۆ ڕاڤەکردنی گەردوون، چیتر لە توانایاندا نەما وەڵامی زۆرینەی پرسیارەکانی ئێستا بدەنەوە، بۆیە نوێکردنەوەی ڕێگاکانی وەرگرتنی مەعریفەو راگەیشتن بەسەرچاوەی مەعریفەی زانستی و رزگاربوون لەو بیربۆچوونە پێشینانەی کۆت و بەندێکیان پێکدەهێنا بەسەر ئەقڵی مرۆییەوە بۆ داهێنان و پێشکەوتن یەکێك بوون لە پێویستیە ناچاریەکان .

دەوڵەتان و دامەزراوە زانستییەکان بایەخێکی زۆریان بە توێژینەوەی زانستی دەدا لەسەرجەم بوارەکاندا، بەشێوەیەك دەکرێت بڵێین مەعریفە و زانستەکان بە سەرجەم لق و توخمەکانی ژیان، بە هۆی زانست بەڕێوەدەبردرێن و ملکەچی بیرکردنەوەی زانستی دەکرێن، کە هێواش هێواش دەستی کردووە بە خۆسەپاندن، خۆشی دووردەخاتەوە لەو زانیاری و شێوازانەی بیرکردنەوە

کە عەقڵییەتی غەیبی ئەفسانەیی کۆنترۆڵی کردووە، لە پاڵ هەندێك شێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی نازانستی.

هەروەها کاتێك دەڵێین بیرکردنەوە و توێژینەوەی زانستی ، ئێمە مەبەستمان بیرکردنەوەی عەقڵی ئەبستراکتی بیرمەند یان زانا نییە، یاخود مەبەستمان ئەو ئەزموونکردنە زانستییە نییە کە زانایان لە تاقیگەکانیاندا ئەنجامی دەدەن، چونکە ئەم شێوازی بیرکردنەوە و ڕەفتارە هەر هەبوون و هەتا لەچاخە کۆنەکانیشدا مەعریفەی ئەفسانەیی و غەیبی و فەلسەفی باو بوون.

ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا بریتیە لەوەی کاتێك بیرکردنەوە و توێژینەوەی زانستی دەبن بە دوو شێواز و سەرچاوەی مەعریفەی باو لە کۆمەڵگاکاندا، ئەمە ئەو بیرکردنەوە زانستییەیە کە لەسەر سۆراخکاری (الاستقرا)دروستبووە، مرۆڤیش بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی خۆی بە کاری دەهێنێت، هاوڕێ لەگەڵ مرۆڤی هاوچەرخدا ڕێ دەکات چۆن بیر بکاتەوەو چی بکات .

هەروەها کاتێك لێردا قسە لە بارەی زانست و بیرکردنەوەی زانستی دەکەین، مەبەستمان زانستە بە چەمکە گشتییەکەی، واتە تەنیا لە زانستە پوختەکاندا کورت نابێتەوە، بەڵکو سەرجەم لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، لە نێویشیاندا لایەنی کۆمەڵایەتی، یان مرۆیی، ئیتر ئەم بوارانەی ژیانیش کەوتوونەتە بەر بیرکردنەوە و توێژینەوەی زانستیەوە ، کەواتە بۆیە سەیر نییە دەبینین ،هەر بە ماوەیەکی کورتی دوای ئەو شۆڕشە زانستی و پیشەسازییەی ئەورووپای

سەدەی هەژدەهەم بە دووای خۆیدا کۆمەڵێك شۆڕشی کۆمەڵایەتی و سیاسی هێنا، ، ئیتر ئەو عەقڵەی لە کۆتەکانی دەرهات دوای ڕزگاربوونی لەهەژمونی لاهوتی و کەنیسەیی، چیتر خۆی لە کایەی زانستە سروشتیەکاندا گرمۆلە نەکرد ، بەڵکو بە نێو سەرجەم بوارە مەعریفییەکان ڕۆچوو ،لە نێویشیاندا لایەنی کۆمەڵایەتی، ئەمە گەیشتە ئاستێك کە بە ڕاستی سەدەی بیستەم ناوبنرێت بە سەدەی دروستبوونی کردەیی زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

کەواتە کاریگەری شۆڕش و بیرکردنەوەی زانستی تەنیا بەسەر ئەو زانستە سروشتییانە کورت نەبووەوە، کە زیاتر میتۆدی زانستی و شێوازەکانی توێژینەوەیان بە کاردەهێنا، بەڵکو ئەم کاریگەرییە بۆ لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی درێژبۆوە بەسەرجەم چالاکی و دامەزراوەکانییەوە، بەمەش میتۆدی زانستی ڕۆچووە نێو ئەو کایانە بە تایبەتی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئیتر مامەڵە لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەك شتگەلێك دەکرا کە دەکرێت تێبینی بکرێن و ئەزموون بکرێن و بکرێن بە ژمارە و بەراورد بکرێن، میتۆدی زاستی توند و وردیان بەسەردا بسەپێنرێت، ئیتر گوێ بیستی کۆمەڵناسی، زانستی سیاسەت و ئابووریناسی و زانستی ئەخلاق و کۆمەڵناسی ئایینی ...هتد دەبووین، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو چالاکیە زانستیەکان فرە بوون و لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان پەرەیان سەند، بەمەش تیۆر و یاسای زانستی کۆمەڵایەتی هاوشێوەی یاسا و تیۆرەکان لە زانستە سروشتییەکاندا دانران.

لەگەڵ هەستکردنی دەوڵەت بە گرنگی و بایەخی زۆری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی، دەستی کرد بە بایەخدان بەم لایەنانە، هەرچەندێك کۆمەڵگا زیاتر بەرەوپێش دەچوو، زیاتر بایەخی بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دەدا، ئیتر سەنتەرەکان و توێژینەوەی تایبەت بەم بوارانە زیاتر بوون.

بە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم لە حاڵەتی بوژانەوەیەکی گشتگیردان، بۆیە زیاتر پێویستیان بە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی و شێوازەکانیەتی لە کۆمەڵگاکانیاندا، بە مەبەستی پەرەپێدانی بونیادە کۆمەڵایەتییەکانیان و شوێنکەوتنی کۆڕەوی خێرای شارستانییەت، کە تیایدا زانست بەرێزو پێشڕەوە، هەر ئەمەشە وا دەکات زانست ببێتە بەشێك لە کولتوور و بەهای کۆمەڵگا، بەڵکو لەمە زیاتر ببێتە پێکهێنەری سەرەکی کولتووری کۆمەڵگا.

ئەوەش زانراوە کە توێژینەوەی زانستی و پراکتیکردنی میتۆدەکانی تەنیا شتێکی ئەکادیمی نییە، یاخود ماددەیەك بێت بۆ قوتابیان لە زانکۆکان، بەڵکو بۆتە پێداویستییەکی ژیان لە کۆمەڵگاکاندا، ئەو توێژینەوە زانستییانەی کە پسپۆڕان ئەنجامی دەدەن لە بوارە جیاجاکاندا، بۆتە رێبەرێك و رێنیشاندەرێك بۆ وەزارەت و دامەزراوەکان لە کار و چالاکییەکانیاندا، بەشێوەیەك زانیاری دروست کۆ دەکرێتەوە لە بارەی کۆمەڵگا و کێشە و کەموکوڕی و پێداویستییەکانی، هەرچەندە توێژینەوەکە

کەڵەکەبێت مەعریفەی گشتگیری مرۆڤ لە کۆمەڵگا زیاتر دەبێت، بەمەش چارەسەر بۆ سەرجەم کێشەکان دەدۆزێتەوە.

خوێندنی بابەتی میتۆدی توێژینەوە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە زانکۆکاندا، بە ددانپێدانێکی فەرمی دادەنرێت، لە لایەن دەوڵەتەوە بە گرنگی توێژینەوەی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و ددانپێدانێکە بەوەی کە دیاردە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان چیتر بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕاڤە ناکرێت، یاخود ملکەچی ڕاڤەکردنە غەیبییەکان ناکرێت، بەڵکو وەك شتگەلێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، کە هۆکار و پاڵنەری خۆیان هەیە، دەکرێت ئاڕاستەکەی دیاری بکرێت و کۆنتڕۆڵ بکرێت و لایەنە نێگەتیڤەکانی لەناو ببردرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین کە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە توێژینەوەی کۆمەڵگا تایبەتمەندی و کێشەی خۆی هەیە، کە جیاوازە لە زانستە سروشتییەکان، مرۆڤ کە لێرەدا بابەتی توێژینەوەیە بێ گیان نییە، بەڵکو بونەوەرێکە هەستی هەیە و ناکرێت بەردەوام پێشبینی بکرێت، بەهۆی ئەوەی کە توێژەری کۆمەڵایەتی بەشێکە لە کۆمەڵگا، ڕووبەڕووی تەحەدایەك دەبێتەوە لە مامەڵەکردن بەشێوەیەکی بابەتی لەگەڵ ئەو پرسانەی کە بۆی جێگای گرنگییە، بەر بوون و ئینتیمای دەکەوێت لە پاڵ ئەوەی کە پابەندبوونی ڕاستەقینە لە بواری توێژینەوە کێشەی و گرفتی خۆی هەیە، بە تایبەتی لەو کۆمەڵگایانەی کە کۆت لەسەر ئازادی ڕادەبڕین دادەنێن.

بێگومان بابەتی میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، تەنیا تەکنیکێکی بێ گیان نییە، بەڵکو بابەتێکی زیندووە و ئەوە بەسەر توێژەری جیددی دەسەپێنێت کە ڕووبەڕووی واقیعی کۆمەڵایەتی ببێتەوە بە سەرجەم پێکهاتە و لایەنە نێگەتیڤییەکانی، ئینجا چ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لایەنی تیۆری ئەبستراکت لەبەرچاو بگرێت، یاخو پەنا بۆ توێژینەوەی مەیدانی ببات، لە هەردوو حاڵەتدا توێژەر ڕووبەڕوی بەربەستگەلێك دەبێتەوە کە سنوور بۆ ئازادی کارکردنی دادەنێت، وەکو کەسێك کە بەدوای هەقیقەتدا دەگەڕێت، هەموو واقیعێکی کۆمەڵایەتی و کێشەکانی تەنیا دروستکراوی هێزی غەیبی، یاخود دەرەکی نین، بەڵکو چەندین توێژ و هێزی کۆمەڵایەتی هەن کە ڕۆڵیان هەیە لە دروستکردنی ئەو کێشانە، بەم پێیەش بەرژەوەندییان هەیە لە مانەوەی ئەو کێشانە.

لەگەڵ ئەوەشدا توێژەری کۆمەڵایەتی ئەگەر خۆی پڕچەك کرد بە میتۆدی زانستی و دەستی کرد بە گەڕان بەدوای هەقیقەتدا بێ ئەوەی بە هۆی چەند ئامانجێکی تایبەت، یاخود مەبەستگەلێکی سیاسی دەستەیی پاڵی پێوەنرابێت، بێگومان بە تێگەیشتنە ڕێژەییەکەی بە هەقیقەت دەگات، بۆ ئەو شانازی شیکردنەوەی واقیع (یاخود بەشێك لێی) و گەیشتنی بە هەقیقەت و گەیاندنی بە لایەنی مەبەستدار بەسە.

لە کۆتاییشدا دەتوانین بڵێین گرنگی بابەتی میتۆدەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، خۆی نابینێتەوە لە ئەزبەرکردنی تیۆر و چەمك و

ڕێوشوێنەكانی توێژینەوە بە پشت بەستن بە میتۆدە زانستییەكان، بەڵكو گرنگییەكەی لەوەدایە كە ئامرازێكە بۆ گۆڕان، گۆڕانی عەقڵ و شێوازی بیركردنەوە پێش گۆڕانی واقیعی كۆمەڵایەتی، هزر لە پێش مومارەسە، واقیعی كۆمەڵایەتیش لە لایەن عەقڵی نا عاقڵ ناگۆڕێت، كە ناكرێت گفتوگۆی لە بارەیەوە بكرێت، هەروەك بە هۆی هزرگەلێك ناچێتە ڕێوە كە كاتی بەسەرچووە.

تیۆر و میتۆدەكانی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی تەنیا وتەگەلێك و كەرەستەیەك نین كە هاوردە بكرێن، بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی هەڕەمەكی پراكتیزە بكرێن، بەڵكو تێكەڵن بە پێكهاتەی كۆمەڵگا، بەها، سیستەم، كولتوور و تیۆر. میتۆدی ڕاست گونجاوترین شت نییە لە ڕووی پێكهاتە و چەمكەكانی، بەڵكو بە تواناترینە لە گوزارشتكردن لە واقیعی كۆمەڵگا، زیاتر توانای مامەڵەكردنی هەیە لەگەڵ تایبەتمەندییەكان بۆ گەیشتن بە هەقیقەت.

زۆرجار ئەو خەسڵەتە جیهانییەی كە تیۆر و میتۆدەكانی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی جیادەكاتەوە، دەبێتە بەربەستێك لە بەردەم تێگەیشتنی كۆمەڵگا، ئاشكراكردنی كێشەكانی، هەرچی سەبارەت بە دۆخی گۆڕاو و جیاوازە، ڕەهەندی جیهانی بوونی نییە، پەرەسەندنی ڕووداوەكانی جیهانی سێیەم سەلماندییان كە قەیرانی زانستە كۆمەڵایەتییەكان لەو دەوڵەتانەیە كە ئەو زانستانەی تێدایە.

ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنجە ئەمەیە کە دەوڵەتە عەرەبییەکان لە کاتی کرانەوەیان بە ڕووی چاخی ڕێنسانس و بەریەککەوتنی بە شارستانییەتی ڕۆژئاوا، تەنیا بەرهەمە ماددییەکان و تیۆر و ئایدیۆلۆجیا و هەندێك مەعریفەی لێ وەرگرتووە، بەڵام بایەخی نەداوە بە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی، کە چاکەی یەکەمی پێشکەوتنەکانی بۆ دەگەڕێتەوە لە شارستانییەتی ڕۆژئاوا بە بەرهەمە ماددی و ڕەمزییەکانی، بەرهەمەکانی بردوون، بەڵام بایەخی بە ڕەگ و ڕیشە و تۆوەکان نەداوە کە بنەمای ئەو مەعریفانەن، متیۆدەکان بریتین لەو تۆوەی کە بەرهەم دروست نابێت بێ ئەو؟ هیچ زانکۆ و وەرگێڕ و توێژەرێك بایەخیان بە گرنگی میتۆدە زانستییەکان نەداوە، تەنیا دوای چەندین ساڵ نەبێت لە هەوڵی شکستخواردوو بۆ گواستنەوە و لاساییکردنەوەی زانیاری و مەعریفەی ئەوانی دیکە. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بایەخ بە میتۆدەکانی توێژینەوە بدرێت، کە هیواداریین ببێتە بابەتی خوێندن بۆ قوتابییەکان لە دوای قۆناغی خوێندنی ناوەندی، یاخود بەلایەنی کەم لە ساڵەکانی یەکەمی خوێندن لە هەموو پسپۆڕییەکاندا، نەك تەنیا بەسەر قوتابییەکانی قۆناغی چوارەم و تەنیا یەك پسپۆڕ کورت ببێتەوە.

پێویستە لێرەشدا ئاماژە بەوە بکەین کە گرنگترین و مەترسیدارترین شت ڕووبەڕووی میتۆدە زانستییەکان دەبێتەوە لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا، بریتییە لە نائامادەیی ئازادی، ئازادی توێژینەوە و توێژینەوەی ئەکادیمی و نائەکادیمی. ئەو توێژەرە زانستییەی کە دەیەوێت لە ڕاستی واقیعی کۆمەڵایەتی تێبگات و ئاشکرای بکات، ئەگەر بێت و گەرانتی و مەرجەکانی بۆ

دابین نەکرێت لە ڕووی ئازادی کار و ئازادی بڵاوکردنەوەی ئەنجامەکانی توێژینەوەکەی، ناتوانێت کارەکانی ئەنجام بدات، یاخود ئەنجامەکانی توێژینەوەکەی دەنگۆی نابێت، بەمپێیەش کارەکەی بەهای زانستی لە دەست دەدات، بەهای زانستییانەی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی وەردەگیرێت، ئەگەر ئەو ئەرکە ئامادەیی نەبوو، زانستیبوونەکەشی ئامادەیی نابێت.

# دەروازەی یەکەم

# میتۆدی زانستی

# پرس و چەمکەکانی

## بەشی یەکەم: مەعریفەی زانستی و قۆناغەکانی پەرەسەندنی

## بەشی دووەم: یاسا و تیۆرە زانستییەکان

## بەشی سێیەم: میتۆدی زانستی

## پێشەکی

میتۆدی زانستی لە توێژینەوەی کۆمەڵگا، تەنیا تەکنیکێك و ئامرازێکی بێ گیان نییە، هەروەك بە تەنیا بەس نییە تاوەکو توێژینەوەیەکی زانستی بابەتی ئەنجام بدەین لە هەلومەج و باروودۆخێکی گونجاودا، بەڵکو بەشێکە لەرێڕەوی (کۆنتێکست)ی چەمکی و توێژینەوەیی گشتگیر و گشتیتر، توێژینەوەی زانستی لە بۆشاییدا لێ نادرێت یان ناڕوێت ، بەڵکو لە زەمینەیەکی چەمکی و مەعریفیەوە دەست پێ دەکات بریتییە لە زانست و مەعریفەی زانستی، هەروەك مەرج و یاسا و تیۆرگەلێکی هەیە وپێویستە پابەند بێت پێیانەوە.

لەبەرئەمە هەر توێژەرێك لە میتۆددا و لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا لەسەری پێویستە ئاگاداری ئەم چەمك و پرسانە بێت، چونکە توێژینەوەی زانستی گشتێکەو پارچە پارچە ناکرێت ، یان سیستەمێکی بە یەکەوە بەستراوە و ناکرێت بەشەکانی لە یەکتر جیا بکرێنەوە، تەنیا بە هۆی پێویستی توێژینەوەی زانستی نەبێت.

لەم دەوازەیەدا ئەمانە باس دەکەین:

**بەشی یەکەم: مەعریفەی زانستی و قۆناغەکانی پەرەسەندنی**

**بەشی دووەم: یاسا و تیۆرە زانستییەکان**

**بەشی سێیەم: میتۆدی زانستی**

# بەشی یەکەم

## مەعریفەی زانستی و قۆناغەکانی پەرەسەندنی

بێگومان مەعریفە بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدا هەبووە، لەگەڵ بوونی مرۆڤ لەسەر زەویی مەعریفەش بونی هەبوە، هەر مەعریفەشە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە، مرۆڤ ئاژەڵێکی عاقڵە بەو مانایەی کە دەتوانێت عەقڵی خۆی بەکاربهێنێت بۆ باشترکردنی شێوازی ژیانی، لە پاڵ تێگەیشتن لە دیاردەکانی دەوربەری بۆ ئاسانکردنی کاروبارەکانی، یاخود بەکارهێنانیان لە بەرژەوەندی خۆیدا.

مەعریفەی مرۆڤی هاوچەرخ، بریتییە لە (کۆمەڵێك مانا و وێنا و بۆچون و بیروباوەڕ و هەقیقەت کە لای مرۆڤ دروست دەبێت لە دەرەنجامی هەوڵە دووبارەکانی بۆ تێگەیشتن لە دیاردە و شتەکانی دەوروبەری[1]. زۆرجار بە پەرەسەندن و پێگەیشتوویی دەناسرێتەوە، چونکە مەعریفەیەکی ڕێکخراو و میتۆدییە و لەسەر بیرکردنەوەی زانستی وەستاوە، هەرچی مەعریفەی مرۆڤی یەکەمە (تەنانەت بەشێك لە مەعریفەی مرۆڤی هاوچەرخیش) لە قۆناغی

---

[1]- عبدالباسط محمد حسن، اصول البحث الاجتماعي، القاهرة، مكتبة وهبة، ١٩٧٧، ص ٢٠.

منداڵێتی مەعریفەدا (ئەگەر گوزارشتەکە ڕاست بێت) مەعریفەیەکی هەستەکی ئەزموونییە پاشان مەعریفەیەکی فەلسەفییە.

کەواتە مەعریفە، بە پشت بەستن بە پرەنسیپی پەرەسەندن، لەگەڵ پەرەسەندنی عەقڵی مرۆیی پەرەی سەندووە، چونکە مەعریفە بەرهەمی ئەو عەقڵەیە، هەر ئەمەش حوکم بەسەر ڕادەی تێگەیشتن و پێگەیشتوویی عەقڵی مرۆیی دەدات.

زۆربەی فەیلەسوف و بیرمەندەکان، بە پشت بەستن بە پرەنسیپی پەرەسەندن، بایەخیانداوە بە پەرەسەندنی مەعریفەی مرۆیی، پەیوەندی نێوان عەقڵی بیرمەند، یاخود بکەر بە شێوازەکان و رەفتاری لە ژیان، بۆ نموونە ئەوکاتەی ئیبن خەلدون قسە لە بارەی گۆڕانی ژیانی دەوارنشینی بۆ ژیانی شارنیشینی دەکات، بە گۆڕانی شێوازی بیرکردنەوە دەیبەستێتەوە، بە شێوەیەك پەیوەندییەکی دیالێکتیکی هەیە لە نێوان مەعریفەی باو و ئەوەی ئەو پێی گوت ئاوەدانی مرۆیی.

لە سەدەی نۆزدەدا ئۆگۆست کۆنت (١٧٩٨_١٨٥٧) لەسەر ڕێچکەی مامۆستاکەی سان سیمۆن (١٧٦٠_١٨٢٥) تیۆرێکی دانا بۆ پەرەسەندنی مەعریفەی مرۆیی بە پشت بەستن بە پەرەسەندنی عەقڵی مرۆی، ئەوانیش:

_ قۆناغی لاهوتی

_ قۆناغی میتافیزیکی

_ قۆناغی پۆزەتیڤیزم

زۆرینەی توێژەرەکان لە کاتی باسکردنی مەعریفەی مرۆیی لەسەر ئەو دابەشکردنە ڕۆیشتن، بەشێوەیەك مامەڵەیان دەکرد کە لە جەوهەرەکەی لا نادات. گرنگی ئەو دابەشکردنە خۆی دەبینێتەوە لەوەی کە بۆمان

دەردەخات مەعریفەی مرۆڤی هاوچەرخ بریتییە لە قۆناغێکی پەرەسەندوو لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی مەعریفەی مرۆیی، ئەمە بەرهەمی هەلومەرجی بابەتی و مێژووییە. لێرەدا بە باشی دەزانین چاوێك بە شێوازەکانی پێشووی مەعریفەی مرۆییدا بخشێنین .

# باسی یەکەم

## مەعریفەی هەستەکی، یاخود مەعریفەی شارەزایی خودی

## (Empircial Knowledge)

بە کۆنترین جۆری مەعریفەی مرۆیی دادەنرێت، بە هۆی سروشتی تایبەتی، بەوەی کە مەعریفە و وێناکانی دەوەستێتە سەر ئەوەی کە هەستەکانی مرۆڤ دەرکی پێدەکەن لە بارەی دیاردە سروشتی و ئەوانی دیکە. مەعریفە لەم قۆناغەدا تەنیا لە تێبینیکردنی سادەی دیاردەکاندا کورت دەبێتەوە، بێ ئەوەی مرۆڤ هەوڵبدات قوڵبێتەوە لە پشت هۆکار و پەیوەندییەکانی پشت دیاردەکان. بە مەعریفەی هەستەکی ناوزەد دەکرێت، چونکە پشت بە هەست دەبەستێت. ئەوەی بەردەست دەکەوێت، یان چاو دەیبینێت، یاخود گوێ دەیبیستێت، بۆ نمونە تێبینی کەسێکی ئاسایی بۆ بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژ، یاخود هەڵکشان و داکشان، لەم قۆناغەدا مرۆڤی ئاسایی تێبینی ئەم دیاردانە دەکات، بەڵام هەوڵ نادات ملکەچی ئارگۆمێنت و بەڵگەی زانستی بکات بۆ ئەوەی بزانێت ئەو دیاردانە بۆچی و چۆن ڕوودەدن؟

هەروەها زۆرجار بەو مەعریفەیەش دەگوترێت مەعریفەی شارەزایی کەسی (Experiential Knowledge)، چونکە دەوەستێتە سەر شارەزایی مرۆڤ و ئەو ئەزموونانەی پێشووی کە بەدەستی هێناوە، مرۆڤ سوود لەم ئەزمونانە وەردەگرێت لە بەڕێوەبردنی ژیانی خۆیدا، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك نەخۆش بێت ئەزمونی شارەزایی کەسیی فێری کردووە پەنا بەرێت بۆ جۆرێك ڕووەك، ئەگەر ئاسمان تەمومژاوی بوو چاوەڕوانی باران بارین دەکات...هتد، بەڵام ئەوەش زانراوە کە شارەزاییە هەستەکییەکانی مرۆڤ سنووردارن و بێتوانان لە ڕاڤەکردنی هەموو دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکاندا. مرۆڤ لە قۆناغی مەعریفەی هەستەکیدا بۆی دژوار بوو پێشبینی ڕوودانی بومەلەرزە، یاخود گرکان بکات، ئەگەرچی دەیتوانی بەشێوەیەکی میتافیزیکی هۆکارەکانی ڕوودانیان ڕاڤە بکات، وەك ئەوەی بۆ جنۆکە، یاخود بۆ هێزی نادیار، یاخود بۆ هێزی دیکەی سەیروسەمەری نەبینراوی دەگەڕاندەوە. مرۆڤی بەرایی لە ڕاڤەکردنی دیاردەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ هێزی خورافی نەبینراو لە منداڵ دەچێت لە کاتی ڕاڤەکردنی هۆکارە سروشتییەکان و شتی دیکەش، هەروەك چۆن منداڵ مەعریفەکانی خۆی گەشەپێدەدات لەگەڵ ڕۆیشتنی کات و بەعەقڵانی دەکات، بەشێوەیەك زیاتر پێگەیشتوو دەبێت، مرۆڤایەتیش مەعریفەکانی خۆی پەرەپێداوە و زیاتر عەقڵانی کردووە.

مرۆڤ لە بەشێکی زۆری مێژووی خۆیدا (واتە پێش ئەوەی بیرکردنەوە و مامەڵەکردنی زانستی بۆ دیاردە و شتەکان باو بێت) پەنای بردووە بۆ ڕاڤەکردن و وێنای سادەی خودی لە ڕاڤەکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ شت و

دیاردەکاندا، لە جیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی بێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە توانا عەقڵیی و مەعریفییەکانی مرۆڤ نەگەیشتۆتە پلەیەك لە پێگەیشتن کە بەس بێت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی واقیع و تێپەڕاندنی خودێتی لە ڕاڤەکردنی شت و دیاردەکاندا، هەروەك هێشتا مرۆڤ کەرەستە و ئامراز و میتۆدگەلی توێژینەوە و شیکردنەوەی دانەهێنابوو کە یارمەتی بدات بۆ مامەڵەکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ شتەکاندا، لە پاڵ گەڕان بەدوای هۆکارەکانی پشت ڕوودانی ئەو شتانە.

بۆ ماوەیەکی دووروودرێژی مێژوویی مرۆڤ ،لە راڤە کردنی ئەوەی دەیبینی و لە بەرچاویدا روویدەدا ،لە جیاتی زانست و میتۆدی زانستی خەیاڵ و هەڵچوونەکانی ، هەروەها ئەفسانەو خورافاتی بەکار دەهێنا و پێی وابوو ئەمەش راڤەکردنێکی راست و درووستە[٢].

## باسی دووەم: مەعریفەی فەلسەفی

ئەو مەعریفەیەی لە ڕێگای هەست، یاخود ئەزموون و شارەزایی کەسیەوە وەردەگیرێت مەعریفەیەکی سنووردارە، تەنیا لە چەند دیاردەیەکی سروشتیدا خۆی دەبینێتەوە، یان لە ڕاڤەکردنێکی ڕووکەشی هەندێك پرس و دیاردەگەلی کۆمەڵایەتیدا کورت دەبێتەوە، ئەمەش وادەکات چەندین پرسی دیکە بمێنن لە دەرەوەی توانای هەستدا دەرکی پێ بکات، بە تایبەتی پرسەکانی سروشت و میتافیزیك، ئەو پرسانە تەنیا عەقڵ دەتوانێت

٢- احسان محمد الحسن، الاسس العلمية لمناهج البحث العلمي، بيروت ١٩٨٢، ص ٧.

چارەسەریان بکات. هەروەها کاتێك مرۆڤ دەستی بە بیرکردنەوە کردووە لەم پرسانە، بەم دەستپێکردنەش بە دڵنیاییەوە سەرەتای چوونە نێو قۆناغێکی دیکەیە لە بیرکردنەوە بۆ وەرگرتنی مەعریفەی تازە، ئەویش بریتیە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی، یان لۆژیکی.

مرۆڤ دەستی بە پشکنینی ئەو دیوی سروشت کرد بە دووای بوون و هەبوون (الوجود و الموجود) و هەموو پرسە میتافیزیکییەکانی دیکە. هزری ئایینی یەکێکە لە رووەکانی ئەو جۆرە مەعریفەیە، هزری لاهوتی ماوەیەکی زۆر بەسەر هزری ئەوروپی باڵادەست بوو، هەژموندار بوو بەسەر هزری ئەوروپی لە ماوەی نێوان سەدەکانی پێنجەم و حەڤدەیەم، گۆستاڤ لۆبۆن باسی لەم قۆناغە کردووە و دەڵێت (لاپەڕەی مێژووی سەدەکانی پێنج بۆ هەژدە هەڵبدەنەوە دەبینین کە لاهوتناسی باڵادەستە بەسەر ڕۆحی مرۆییدا، ئاراستەی دەکات و مۆرکێکی لاهوتییانەی پێدەبەخشێت، بەردەوام لە ڕوانگەیەکی لاهوتی لە پرسە سیاسی و فەلسەفی و مێژووییەکان دەڕوانرێت، ڕۆحی لاهوتی لە چەند لایەنێك بریتیە لەو خوێنەی کە بە دەمارەکانی زانستی ئەورووپی دەجوڵێت تەنانەت ئەمە بۆ بیکۆن و دیکارتیش ڕاستە)[٣].

---

[٣]- غوستاف لوبون، فلسفة التاريخ، ترجمة عادل زعيتر، مصر، دار المعارف، ١٩٥٩، ص ٥٦_٥٧.

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەبکەین کە فەلسەفە سێ مانای هەیە: فەلسەفەی فیزیك، کە توێژینەوە لەبارەی وەڵامە گشتییەکان دەکات بەڵام لە نێو سروشتدا، فەلسەفەی میتافیزیك بەدوای وەڵامەکانی سروشت و گەردووندا دەگەڕێت بەڵام لەدەرەوەی سروشتدا، بیرکردنەوەی ئایینیش هەیە کە شێوەیەکە لە میتافیزیکا بەڵام عەقل تیایدا پابەندە بە بیرکردنەوەی ئایینی و کۆتی لەسەر دانراوە.

لێرەوە دەبینین کە شۆڕشی ئایینی، یاخود یەکلاییکردنەوەی ململانێ لە نێوان دەسەڵاتی ئایینی و دونیایی لە بەرژەوەندی دووەم، زەمینەساز و ڕێگا خۆشکار بوو بۆ چاخی ڕێنسانس و شۆڕشی زانستی پیشەسازی لە ئەوروپادا.

**١.پێناسەی مەعریفەی فەلسەفی (بیرکردنەوەی لۆژیکی):**

پرسە فەلسەفەییەکان جیادەکرێنەوە بەوەی کە دژوارە بیانگەڕێنینەوە بۆ واقیع و بیانخەینە بەر تەرازووی واقیع، یاخود بیانخەینە بەر ئەزموون، چونکە ناچێتە ژێرباری دەرککردنە هەستەکییەکان، بە گشتێتی و هەمەکیبوون جیادەکرێنەوە، هەروەك بۆچونەکانی فرەن لە بارەی یەك پرس، هەر ئەمەش سیفەتێکی گشتی بە پرسە فەلسەفییەکان دەبەخشێت، کە بۆتە هۆی دروستبوونی ڕێبازی فەلسەفی لە کاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە و لە فەیلەسوفێکەوە بۆ یەکێکی دیکە.

لەبەر ئەوەی پرس و بیرکردنەوەی فەلسەفی بە گشتگیری و هەمەکییبوون جیادەکرێنەوە، بۆیە هەموو مرۆڤێك فەلسەفەیەکی تایبەتی خۆی هەیە لە بارەی ژیان و سیستەمی هزری و ئایدیۆلۆجی تایبەتی، یاخود گروپێك هەیە ئینتیمای بۆ دەکات، زۆربەی جار فەلسەفەی کەسێك یان ئایدیۆلۆجیاکەی لە هزر و بیروباوەڕی ئەو کۆمەڵگایە وەرگیراوە، کە تێیدا دەژیت و کارلێکی لەگەڵدا دەکات، ناتوانین وێنای بوونی مرۆڤێك بکەین بێ ئەوەی هزری سەرقاڵ نەکردبێت بە پرسگەلێکی میتافیزیکی، یاخود بە وێناکردن و چەند

بیرکردنەوەیەکی کەسییانە. فەلسەفەی مرۆڤە ئەو ڕاڤەکردنە دیاری دەکات کە بۆ دیاردەکان ئەنجامی دەدات، مرۆڤ هەر لە شارستانییەتە کۆنەکانەوە لە ئەفریقی و یۆنانی و چینییەکانەوە...هتد ڕووبەڕووی سیستەمگەلێکی فەلسەفی تەواو بۆتەوە بۆ ڕاڤەکردنی سروشت و ڕەفتاری مرۆیی و میتافیزیك، هەروەك چەندین فەلسەفە هەن کە بنەمای لۆژیکیان داناوە بە هەموو شێوە جیاوازەکانییەوە لە پێناو ڕێکخستنی ئامرازەکانیان بۆ مەعریفە و لێکدانەوەی گەردوون.

کەواتە فەلسەفە بنەماکەی عەقڵی ئەبسراکتە، جیاوازە لە واقیعی ماددی، هەقیقەت، یاخود مەعریفەی واقیع نییە، بەڵام وێناکردنی هزرن لە بارەی ئەو واقیعە. لەگەڵ ئەوەشدا فەیلەسوفەکان بۆ دوو بەش دابەشبوون: بەشێکیان دەستیان گرت بە بابەتگەلێکی تیۆری ئەبستراکت، خەیاڵی خۆیان ئازاد کرد و لە واقیع دوورکەوتنەوە، بەشێکی دیکەشیان هزر و واقیعی بەرهەستی بە یەکەوە بەستایەوە، کەچی بەردەوامبوون لەوەی کە پێشینەیی لە ڕێکخستن و دروستکردنی مەعریفە هەر بە توخمگەلی هزری بەتی ببەخشن.

سەرچاوەی مەعریفەی فەلسەفی تێگەیشتن و عەقڵە، کە لەسەر هەڵهێنجاندن( استنباگ) و پێوانی لۆژیکی دەوەستێت، میتۆدی پێوانەکردنی ئەرستۆیی هەر وەك میتۆدێکی پەیڕەوکراو مایەوە بۆ دەستگەیشتن بە مەعریفە بۆ ماوەی چەندین سەدە، ئەم میتۆدەش بایەخ بە شتە هەندەکییەکان (الجزئی) نادات، پشت بە بوونی هەقیقەتی بەڵگەنەویست و

زانـراو، یـاخود پرنسـیپگەلی زانسـتی هەمـەکی دەبەسـتێت، کـە بێگومـان دەرەنجامەکانی خۆی لەسەر دروست دەکات، کەواتـە ئەمـە لـە هەمەکییـەوە (الکلی) بـۆ هەنـدەکی دەچێت، ئەرستۆ پێوانی پێناسـەکردووە بـە: چـەند وتەیەکن شتگەلێکیان لێ دروستدەبێت جیاواز لەوەی کە لەپێشودا هەبوو.

بێگومـان میتـۆدی پێوانـە، یـاخود هەڵهێنجانـدن لـە پرەنسـیپی هەمـەکی بەڵگەنەویسـت دەسـت پێـدەکات، میتۆدێکـە تـەنیا کورتدەبێتـەوە لەسـەر مەعریفەی ڕاستەقینە و واقیعی، مەعریفەی وەرگیراو هـەر بەدەستدەهێنرێت بـەهۆی ئـەوەی کـە هەندەکییـەکان (دەرنجامـەکان) لـە نێـو هەمەکییەکانـدا (پێشینەکان)ـدا هـەن. هـەروەك ئـەو میتـۆدەش هـەوڵنادات پەیوەنـدی و هۆکارەکـان ئاشـکرا بکـات، ئەمـەش هۆکـارێکی کافییـە بـۆ رەخنـەگرتن لـە میتۆدی هەڵهێنجاندن لە لایەن لایەنگرانی واقیعی و میتۆدی زانستی.

دیکـارت (بـاوکی میتـۆدە تازەکـان و بانگەشـەکاری بـەکارهێنانی میتـۆدی زانستییە لـە توێژینـەوەکردنی کۆمـەڵگادا)، وەسـفی میتـۆدی هەڵهێنجانـدنی کردووە بە نەزۆکی، چونکە هیچ شتێك ناخاتە سەر مەعریفە، ڕۆڵەکەی تـەنیا بەسەر ڕاڤەکردن کورت دەبێتەوە، بەڵام نەك ڕاڤەکردنی ئـەوەی کـە نـایزانین بـەڵکو ئـەوەی کـە دەیـزانین، بـە هـەمان ئاڕاسـتەدا جۆبلـۆ ڕۆیشـت، گـوتی ڕێساکانی لۆژیکی وێنەیی (پێوانەیی) نە ڕێگا بە داهێنان دەدات و نە ڕێگـاش بە ئاشکراکردن دەدات، بەڵکو وادەکات زیرەکی زینـدانی مەعریفـەی پێشـوی بێت، هەروەها تەنیا ڕێگای بە زیـادبوونی ئـەو مەعریفەیـە دەدات لـە جیـاتی

ئەوەی کە کار بکات بۆ گەشەسەندنی، هەروەك هیچ ڕێسایەك نییە لە ڕێساکانی لۆژیکی وێنەیی کە بتوانێت پێشکەوتنی مەعریفە ڕاڤە بکات.

لە نموونەی بیرکردنەوەی فەلسەفی، یاخود میتۆدی هەڵهێنجاندن ئەمانەن:

کانزا گەرمی دەگەیەنێت

مس کانزایە

کەواتە مس گەرمی دەگەیەنێت

یاخود زۆرەملێ و ستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری دەبێتە هۆی ڕوودانی شۆڕش.[1]

دەوڵەتی (س) دانیشتوانەکەی لە دەست ستەم و زۆرەملێی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەناڵێنن

کەواتە دەوڵەتی (س) شۆڕشی تێدا ڕوو دەدات.

بەمشێوەیە.....

لەسەر ئەو بنەمایە فەلسەفە پێناسەکراو بەوەی کە: ئەو کۆمەڵە توێژینەوەیە، یاخود تیۆرانەیە کە دەگاتە پلەیەك لە گشتاندنی چەند پرەنسیپێکی سەرەکی، کە دەکرێت بەهۆیانەوە جۆری مەعریفەمان، یاخود مەعریفەی تەواوی مرۆڤایەتی ڕاڤە بکرێت[٤].

### ١. پەرەسەندنی مەعریفەی زانستی (بیرکردنەوەی لۆژیکی)

---

[٤]- عبدلباسط محمد حسن، مرجع سابق، ص ٢٤.

بیرکردنەوەی زانستی بوژانەوەیەکی زۆری بەخۆیەوە بینی، بە تایبەتی لە هزری یۆنانی کۆندا، بەشێوەیەك تیایدا هزری میسالی و پرسە ئەبستراکانی باوبوو، لەم مەیدانەدا هەردوو فەیلەسوفی یۆنانی ئەفلاتون و ئەرستۆ دیاربوون لە بارەی پرسە زانستییەکان و تیۆری سیاسی، کەچی خەسڵەتی زاڵ بەسەر بیرکردنەوەیان هەر فەلسەفەی میسالی بوو، سەرەڕای ئەوەی کە یۆنانییەکان بایەخیاندا بە چەند پرسێکی زانستی وەك ئەندازە و ماتماتیك، کەچی ئەوان هەر پابەندبوون بە جیاکردنەوەی نێوان زانست و واقیع، گوتی زانست هیچ پەیوەندییەکی بە زانستەوە نییە، هەروەك هیچ پەیوەندییەکیان بە جیهانی ماددی نییە، هەروەها عەقڵی زانست شتێکی عەقڵی پەتییە و لەسەر تێڕامانی تیۆری دروستبووە، ئەمەش وایکردوە سنووری جیاکەرەوەی نێوان مەعریفەی زانستی و مەعریفی و فەلسەفی لای یۆنانییە کۆنەکان ببێتە شتێکی قورس، بەمەش فەلسەفە بوو بە سەرچاوەی هەموو زانستەکان، هەر ئەوەیشە (دایکی زانستەکان)، ئەو کارەیش بووە هۆی دواکەوتنی زانستەکان لای یۆنانییەکان، بەمپێیەش دواکەوتنی ماددییانەی شارستانییەت لای یۆنانییەکان.

مەعریفەی فەلسەفەیی لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانییەتی ئەورووپی پێشکەوت، تێکەڵ بە مەعریفەی زانستی بوو، پرسە فەلسەفییەکانیشی بۆ سێ بەش دابەشکرد ئەوانیش:

**١. پرسەکانی متیتافیزیکی، یاخود ئۆنتۆلۆجیا.**

٢. پرسە ئاکاریەکان

٣. ئەوپرسانەی کە پەیوەستن بەتیۆری مەعریفەوە( ئیبستمۆلۆجیا)

مەعریفەی فەلسەفی لە بایەخدان بە میتافیزیکا پلە بە پلە هاتە خوار بۆ سەرجەم بوارەکانی مەعریفە، لەمبارەشەوە فریدریك هیگڵ لە کتێبی (چەند وانەیەك لە بارەی مێژووی فەلسەفە) دەڵێت: (لە هەموو جێگایەکدا فەلسەفە دەستی کرد بە توێژینەوەکردنی میتافیزیکا، بەمەش توێژینەوە و گەڕان بەدوای شێوەی جیهان و ڕێگای دروستکردنی و بنەچە و سروشت و ماهییەتی ڕۆح و پەیوەندیی بە جەستە دەست پێ دەکات، دوای ئەوەی کاتێکی زۆر نوقمی نێو ئەو توێژینەوانە بوو، ئاڕاستەی هزری گۆڕا بۆ گەڕان بەدوای مەعریفە و شوێنەکان، لێرەوە ئیبستمۆلۆجیا سەریهەڵدا کە بایەخ بە دروستی شت و سنوور و پەیوەندی بە لایەنە دیار و نادیارەکان دەدات.

مەعریفەی فەلسەفی پەرەیسەند، بەمەش لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، چەندین قوتابخانەی فەلسەفی سەریهەڵدا، ئەگەرچی ئۆگۆست کۆنت بنەمای فەلسەفەی پۆزەتیڤی دامەزراند (کە دواتر ئاماژەی پێ دەدەین)، دوای ئەو چەندین قوتابخانەی فەلسەفی میسالی سەریانهەڵدا، یاخود ئەوەی پێی دەگوترێت ئاڕاستەی میسالی لە مەعریفە، ئەمەش ئەو ئاڕاستەیە کە پێیوایە هزر لە هەموو فاکتەکانی دیکە گرنگتر و پڕ دەلالەتترە، واقیع هەر بە نێگەتیڤی دەمێنێتەوە، هەر بیرۆکەشە

هەقیقەتەکەی ئاشکرا دەکات، ئەو ئاراستەیەش چەندین قوتابخانەی دیکەی لێبوەوە.

### أ) خەیاڵیی ئەو دیوی بوون (میسالیەتی تراسێندەنتالی)

مانای شتێکی سەروو بوونی ماددییە و لە ئەزموون باڵاترە، هەروەها پێیوایە ئاشکراکردنی هەقیقەتەکەی لە ڕێگای پرۆسەکانی هزری توێژینەوە دەکرێت نەك لە ڕێگای شارەزایی و ئەزموون، لەکەسە دیارەکانیشی فەیلەسوفی ئەڵمانی (ئیمانوێل کانت)ە[٥].

### ب) خەیاڵیی خودی

هەموو مەعریفەکانی لەسەر بنەمای شارەزایی خودی و هەستکردنی تایبەتی کەسەکە دروست دەکات، هیچ شتێك بوونی نییە جگە لەوەی کە دەرکی پێدەکەین، خودی دەرککار (الذات المدركة) دەروازەیە بۆ دەرککردنی جیهان، لە کەسە دیارەکانی جۆرج بێرکلە[٦]. ئەو پێیوایە بابەتەکانی دەرککردنی هەستەکی هیچ نییە جگە هزرگەلێکی نێو عەقڵمان نەبێت بێ بوونێکی سەربەخۆ لە دەرەوەی عەقڵدا.

### ت)خەیاڵیی بابەتی

---

٥- Imanuel kant (١٧٢٤_١٨٠٤) فەیلەسوفێکی ئەڵمانیە و بە یەکێك لە فەیلەسوفە مەزنەکانی جیهان دادەنرێت.

٦- George barkeley (١٦٨٥_١٧٥٣) فەیلەسوفێك و پیاوێکی ئینگلیزیە، پێیوایە هەموو واقیع بەرهەمی هزری خودایە، ئەو بیرمەندە زۆر چالاکانە لەبەرامبەر هزری مولحیدەکان کاری دەکرد.

پێیوایە سەرچاوەی مەعریفە خود نییە، بەڵکو بابەتە و لە دەرەوەی ویستی مرۆڤە، لە دیارترین پێشڕەویشی (فرێدرێك هیگڵە)[٧] کە دیالێکتیکی وەك پرۆسەیەکی پێویست لە پرۆسەکانی عەقڵ و میتۆدێکی فەلسەفی بەکارهێنا. ئەو پێیوایە هۆشیاری تاکی هیچ نییە جگە لە ڕێکەوتێکی ڕووکەش نەبێت لە پەرەسەندنی ڕۆحی جیهانی.

### پ)خەیاڵی نا ئەقڵانی

جەختدەکاتە سەر گومان (حەدس)، یاخود ڕەمەك و مەزەندە، لە سەدەی نۆزدە سەریهەڵدا لە بەناوبانگترین فەیلەسوفەکانی شۆپنهاوەرە[٨]، کە خاوەنی کتێبی (جیهان وەك ویست و بیرۆکە)یە. لەم کتێبەدا باس لە بیرۆکە سەرەکییەکەی دەکات بەوەی کە جیهان پێدراوێکی ڕاستەوخۆیە و پەیوەندی بەو گۆڕانانەیە کە لە ناوەوەی جەستەماندا ڕوو دەدات، ویستیش جەوهەری مرۆڤە وەك شتێك لە خۆیدا[٩]. هەروەها پێیوایە ڕەها عەقڵ نییە، بەڵکو ویستێکی کوێر و ناعەقڵییە، دوای ئەو بیرمەندی دانیمارکی کێرکەگارد (١٨٠٥_١٨٩٠) و جان پۆل سارتەر و چەندانی دیکە سەریانهەڵدا[١٠] و بونیادگەریش سەریهەڵدا لەگەڵ شتراوس و فوکو و چەندانی دیکە[١١]. بەڵام

---

٧- فرێدریك هیگل (١٧٧٠_١٨٣١) فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە و خاوەنی تیۆری لۆژیکی دیالێکتیکی هیگلییە.

٨- شۆپنهاوەر فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە و بە ڕەشبینییە فەلسەفییەکەی بەناوبانگە.

٩- علي ليلة، النظرية الاجتماعية المعاصرة، القاهرة، ١٩٨١، ص ٩٨.

١٠- کێرکەگارد فەیلەسوفێکی لاهوتی دانیمارکیە، و بە دامەزرێنەری فەلسەفی بونگەرایە.

١١- بونگەرایی، فەلسەفەیەکە باس بوونی مرۆڤ دەکات بەوەی کە پێش ماهیەت دەکەوێت واتە مرۆڤ دروستکەری بونی خۆیەتی بە چاوپۆشین لە هەر فاکتەرێکی تر کە کۆنترۆڵی دەکات، کۆلن ویلسۆن فەیلەسوفی ئینگلیزی هاوچەرخ لە کتێبی (ڕووخانی شارستانیەت) بەراوردێك دەکات لە نێوان فەلسەفەی بونگەرایی و

ئەو فەلسەفانە چەندین ڕەهەندی شارستانی مرۆییان هەیە کە دژوارە بڵێین درێژکراوەی فەلسەفەی کلاسیکین، بەڵکو لە ڕوانگەی پێشڕەوەکانەوە بونیادگەری زۆر لە تیۆری زانستی نزیك دادەنرێت، ، نەك لە فەلسەفە.

هەروەك فەلسەفە لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی وەك ئامێزێکبوو بۆ پرۆسەی لە دایکبوونی بیرکردنەوەی زانستی (کۆمەڵناسی لە ئامێزی توێژینەوە فەلسەفەییەکان لە دایکبووە)، تا ئێستاش فەلسەفە بە شێوە و ناوەڕۆکی جیاواز لەگەڵ مەعریفەی زانستی دەژیت، بە تایبەتی لە بوارە کۆمەڵایەتییەکەی، تەحەدای هەموو هێرش و ئەو دژایەتییانە دەکات کە لە دژی هەڵگیرساوە بە ناوی زانستی و واقیعی، لەم سۆنگەشەوە دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان هاتنە دەرەوەی کۆمەڵناسی لە فەلسەفە و نکۆڵیکردنی فەلسەفە، بەشێوەیەك پیترۆنیك پێیوایە: (فەلسەفە بەوپێیەی توێژینەوەیەکە لە سروشتی دەرککردنی مرۆڤ بۆ واقیع، دەکرێت ڕووناکی بخرێتە سەر سروشتی پەیوەندی ئاڵوگۆڕ لە کۆمەڵگا، ئەو هەڵوێستە هەرچییەك بێت کە مرۆڤ وەری دەگرێت سەبارەت بە تێڕوانینی بۆ کۆمەڵناسی، لە کۆتاییدا ناتوانێت گفتوگۆکردن لە بارەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی گشتی لە بواری کۆمەڵناسی دوور ربخاتەوە) (١٢).

---

فەلسەفەی پێشوی ئەو و دەڵێت (ئەو فەلسەفەیەی کە بونگەرایی نەبێت نیوەی فەلسەفە نیە، هەروەك فەیلەسوفی ئەبستراکت نیوە فەیلەسوفە).

کولن ویلسون، سقوگ الحچارە، بیروت، ١٩٧١، ص ٢٧٥.

[١٢]- علي القصير، منهجية علم الاجتماع، القاهرة، ١٩٨٥، ص ٣٦.

هەمان بیرۆکەش لە لایەن زانای کۆمەڵناسی یوگسلافی (زیڤکوڤیچ) دووبارە کرایەوە، کە پێیوایە هاوتابوونی فەلسەفە و زانست لە بواری کۆمەڵناسی بە پرسێکی بەڵگەنەویست دادەنرێت، ئەمەش لە خەسڵەتە جۆرییەکانی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و ناوەرۆکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگا دادەنرێت[13].

ڕەنگە وتەکانی تاهیر و عەزیز لە کتێبەکەیاندا بە ڕوونی گوزاشت لە پەیوەندی زانست و فەلسەفە دەکات (ئەگەر وەك پێشینەکان نەتوانین بڵێین فەلسەفە زانستە، ئەوا ناتوانین نەیچوێنین بە زانست، یاخود نزیك لێی، چونکە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان فەلسەفە و زانستەکان جێگر نییە، لەو ڕووەی کە ناگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو پرسانەی کە ناکرێت بەشێوەیەکی کۆتایی لە بارەیانەوە بڵێین ئەمە پرسێکی زانستی یاخود میتافیزیکییە، بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دیاریکردنیان و هەڵبژاردنی ئەو میتۆدانەی کە ڕێگا دەدات باسیان بکرێت. فەلسەفە هاوشێوەی زانستە لەوەی کە قسە لەگەڵ عەقڵی مرۆیی دەکات. هزری زانستی لە هزری فەلسەفی جیا نابێتەوە تەنیا لەو ڕووەوە نەبێت کە ئەو زیاتر پشتراست دەکرێتەوە بە بەڵگەی بەهێزتر لە بەڵگەکانی فەیلەسوفەکان)[14].

---

[13]- هەمان سەرچاوە، لا ٣٧.

[14]- الطاهر و عزيز، المناهج الفلسفة، المركز الثقافي العربي، ط١، ١٩٩٦، لا ١٢.

## باسی سێیەم: مەعریفەی زانستی

لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئەقڵی مرۆیی، کەڵەکەبوونی مەعریفەی مرۆڤایەتی بە ئەزموون و تێڕامان، لەگەڵ زۆربوونی پێداویستییەکانی ژیان لە سەرجەم بوارەکان، چیتر مەعریفەی نەریتی بە هەردوو جۆرە هەستەکی ئەزمونی و فەلسەفی و تێڕامانی، توانای ئەوەیان نەبوو بچنە ناو قوڵایی سروشت، یاخود کۆمەڵگا، یاخود وەڵامی تەواو بۆ زۆرێك لەو پرسیارانەی کە مرۆڤ دەیوروژاند بدەنەوە، لەگەڵ زۆربوونی بەریەککەوتنی بە واقیع. مەعریفەی زانستی جەختی دەکردەوە لەسەر بیرکردنەوە و توێژینەوەی زانستی بۆ ئەوەی هاوکات بێت لەگەڵ ئەو وەرچەرخانانە و وەڵامی چەندین پرسیار بداتەوە. هەموو ئەوانە بەهۆی ئەو ماددە مەزنەیە، کە مرۆڤ دایهێناوە، ناشزانێت بۆ کوێی دەبات، کە زانستە، هیوا و چاکە لە سەرەتادا و ترس و چاودێریکردن لە ئەنجامەکانییەتی، بۆیە دەبێت دەست بکەین بە پێناسەکردنی زانست، دواتر باسی مەعریفەی زانستی دەکەین.

### أ) زانست

زانست مەعریفەیەکی ئامانجدارە، یاخود ڕێکخراوە، یاخود مەعریفەیەکی میتۆدییە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە زانست مەعریفەیە، بەڵام هەموو مەعریفەیەك زانست نییە، تاوەکو مەعریفە ببێتە زانستی، دەبێت میتۆدی زانستی لە توێژینەوە بگرێتە بەر، ئەو میتۆدە زانستییەش دەبێت پشت بە تێبینیکردن و ئەزموون و بەراوردکردن و سۆراخکاری ببەستێت.

## پێناسەکردنی زانست

کێرلنگەر دەڵێت لە جیهانی زانستدا دوو ڕوانگەی بەرفراوان هەیە لە بارەی چەمکی زانست: ڕوانگەیەکی جێگیر و ڕوانگەیەکی دینامیکی، ڕوانگەی جێگیر ئەو ڕوانگەیەیە کە تاکە ئاساییەکان بە باشتر دەزانێت، بەشێوەیەك لە زانست دەڕوانێت بەوەی کە چالاکییەکە زانیاری ڕێکخراو بە جیهان دەبەخشێت، وەسفی زانای توێژەریش دەکات بەوەی کە کاری ئاشکراکردنی هەقیقەتگەلێکی تازەیە، بڕی مەعریفەش زیاد دەکات، کەواتە زانست کەڵەکەبوونی ژمارەیەك دۆزینەوەیە[15].

لەم سۆنگەیەوە چەندین پێناسە بۆ زانست کراوە، فەرهەنگی ویبستەری تازە دەڵێت زانست: "ئەو مەعریفە ڕێکخراوەیە کە لەسەر تێبینیکردن و توێژینەوە و ئەزموونکردن وەستاوە، کە ئەنجام دەدرێت بە مەبەستی دیاریکردنی سروشت و بنەما و بنەچەی ئەو شتەی توێژینەوە دەکرێت."

هەرچی فەرهەنگی ئۆکسفۆردی پوختەکراوە ئەوا دەڵێت زانست: (ئەو لقەیە لە توێژینەوە کە پەیوەستە بە جەستەیەکی بەیەکەوە بەستراو لە هەقیقەتی جێگیری پۆلێنکراو. کە لەلایەن چەندین یاسایەکی گشتی کۆنترۆڵ دەکرێت و

---

[15]- Karliinger, E.N foundations of behavioral Research (Holt, Rinehart and Winstonm new York, 1970)

وەرگیراوە لە: لويس كوهن و لورانس مانيون، مناهج البحث في العلوم الاجتماعية و التربوية، ترجمة كوثر حسين كوجك و وليم تاضروس عبيد، القاهرة، ١٩٩٠، ط١، لا ٣٤.

چەندین شێواز و میتۆدی باوەڕپێکراو لە خۆدەگرێت بۆ ئاشکراکردنی هەقیقەتی تازە لە چوارچێوەی ئەو توێژینەوەیەدا).

لە فەرهەنگی وەسیت کە بە زمانی عەرەبییە زانست بریتییە لە (دەرککردنی شتێك لەسەر هەقیقەتی خۆی). هەرچی کارل بێرسۆنە لە بارەی زانست دەڵێت (کە مەیدان و بابەتێکی دیاریکراو نییە، بریتییە لە کۆمەڵێك دیاردەی سروشتی لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەموو قۆناغێکە لە قۆناغەانی پەرەسەندنی کۆن، یاخود تازە، هەموو ئەوانە بە بابەتی زانست دادەنرێن).

ئەو پێناسانەی کە ئاماژەمان پێکرد پەیوەستە بە زانست بە مانا گشتیەیکەی، کە زانستە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان لە خۆدەگرێت، یەکەمیان لە چوارچێوەی خۆیدا باس لە دیاردە هەندەکییە سروشتییەکان دەکات، ئینجا چ دیاردەی جێگیر بێت وەك بابەتەکانی زانستی سروشتی و کیمیا و فەلەك....چەندانی دیکەش. یاخود دیاردەی زیندو وەك لە حاڵەتی بابەتەکانی زانستی پزیشکی و زانستی ئەرکی ئۆرگانەکان و چەندانی دیکەش هەرچی دووەمە (زانستە کۆمەڵایەتییەکان) بریتییە لە توێژینەوەیەکی میتۆدی ڕێکخراو کە توێژینەوەی مرۆڤ دەکات لە ڕووی ئەوەی کە تاکێکە، یاخود ئەندامێکە لە گروپ؟ ئەوەش زانراوە کە زانستە سروشتییەکان لە پێش سەرهەڵدانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا. ئەمەی دوایی ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگ بۆتەوە تاوەکو وەك زانست دانی پێدابنێن.

## ئامانجەکانی زانست

ئامانجی سەرەکی زانست ئینجا چ سروشتی، یاخود کۆمەڵایەتی بێت بریتییە لە گەیشتن بە هەقیقەت، دروستکردنی بەڵگە لەبارەیەوە، هەقیقەت پاڵنەری سەرەکی زانستە، بۆیە زانست ئامرازێکە نەك ئامانج، ئامرازێکە بۆ بیرکردنەوە، شێوازێك لە مومارەسە کە مرۆڤ دایهێناوە بۆ زۆرکردنی توانای لە ئاشکراکردنی سیستەمی باو لە گەردوون و تێگەیشتنی یاساکانی سروشت و لایەنی کۆمەڵایەتی، هەموو ئەوانەش بەهۆی یاسا زانستییەکان.

زانا موسڵمانەکان ئەوەیان بەدەرخستەوە کە ئامانجی زانست بریتییە لە گەیشتن بە هەقیقەت و دەرخستنی حەق و بەستانەوەی زانست بە داهێنان، سیفەتی زاناش دەگەڕێتەوە بۆ کۆششکار. حاجی خەلیفە دەڵێت ئامانج لە توێژینەوە و داواکردنی زانست بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری و دەرخستنی. ئەمەش چالاکییەکی زانستییە و هەوڵدانە بۆ دەستگەیشتن بە توانا، کە بەهۆیەوە زانا دەگاتە دەرەنجام[١٦]. ئیبن خەلدون لەسەر هەمان ئاراستەیە، بەشێوەیە دەڵێت (وردبونەوەیە لە زانست و و باڵادەستبوون لەسەری، بەرهەمی توانای روماڵکردنی پرەنسیپ و رێساکانییەتی، هەروەها هەڵوەستەکردنە لەسەر پرس و هەڵهێنجاندنی لقەکانییەتی لە بنەچەکانی،

[١٦]- فرانتز رونتال منهاج العلماء المسلين في البحث العلمي، ترجمة انيس فريحة، بيروت الار العربية للكتاب، ط٤ ، لا ٣٤.

ئەگەر ئەم شتە ئەنجام نەدرێت ئەوا وردبونەوە لەم هونەرە روونادات. ئەم توانا جیاوازە لە تێگەیشتن و هۆشیاری،(١٧).

براسویت لە کتێبی (شرۆڤەی زانستی) دەڵێت (ئەرکی زانست بریتییە لە دروستکردنی ئەو یاسا گشتییانەی کە باسی رووداوی واقیعی و پرسگەلێك دەکرێت کە توێژینەوەی دەکات دواتر یارمەتی دەدات لە بەستانەوەی ئەو مەعریفانەی کە پێیی دەگەین لەو رودانەوە، هەروەها یارمەتیمان دەدات بۆ گەیشتن بە پێشبینی جێگیر لەبارەی ئەو روداوانەوەی کە هێشتا زانراو نیین)(١٨).

ڤان دالین لە کتێبی (میتۆدەکانی توێژینەوە لە پەروەردە و دەروونناسی) سێ ئامانج بۆ زانست دیاری دەکات: (زۆرکردنی توانای مرۆڤ لە شرۆڤەی رووداوەکا وپێشبینیکردن و کۆنترۆڵکردنیانە)(١٩).

### ١. لە بارەی شرۆڤەکردنەوە

چالاکی عەقڵی مرۆڤ نابێتە زانست بە مانا دروستەکەی تەنیا ئەگەر ئامانجی ئاشکراکردن و لێکدانەوەی ئەو پەیوەندییانە بێت کە لە نێوان دیاردەکاندا هەیە، ئەمەش روو نادات تەنیا بە ئاشکراکردنی هۆکارەکان و شرۆڤەکردنی و

---

١٧- ابن خلدون، كتاب العبر و ديوان المبتدأ و الخبر، بيروت، ط٣، ١٩٦٧،لا ٧٦٩.
١٨- محمد علي محمد، مقدمة ي البحث الاجتماعي، بيروت، ١٩٨٢، لا ٤.
١٩- فان دالين، مناهج البحث في التربية و علم النفس، القاهرة، ١٩٨٦، لا ٥٨.

دەرککردنی ڕایەڵەکانی نێوان ئەو دیاردانە نەبێت کە دەمانەوێت شرۆڤەیان بکەین لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە لە پێشووتردا هەیە.

ئامانجی زانست کورتنابێتەوە تەنیا بە سەر وەسفکردنی دیاردەکان، بەڵکو کاریش دەکات بۆ ڕاڤەکردنیان، ئەو بەوەندە ناوەستێت کە ماهییەتی دیاردەکان بناسێت، بەڵکو بۆ ئەو گرنگە بزانێت ئەو دیاردانە چۆن ڕوو دەدەن، بۆ ئەوەی پرسیارنامە ی ڕودانەکە وەربگرێت؟ بزانێت بۆ ڕوو دەدات؟ ئامانجیش لێی تەنیا زانینی تیۆری پەتی نییە بەڵکو دانانی یاسا و تیۆرەکانیشە.

ئامانجی دووری زانست بریتییە لە دانای یاسا کە پلەیەکی زۆری لە گشتاندن و هەمەکییەت هەبێت، باس لە هەموو دیاردە هاوشێوەکان بکات و لە یەک ڕێسادا ڕێکیان بخات، ئەوەش بەڵگەنەویستە کە ڕاڤەکردنی دیاردە و زانستی هۆکارەکانی ڕوودانی مەرجێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتنی.

لە هەمان کۆنتێکستدا ڤیبەر پێیوایە هەموو زانستێکی مرۆیی لە ئێستادا کار دەکات بەهۆی ڕاڤەکردنەوە، پێکهاتەی ئەو ڕاڤەکردنەش لای ڤیبەر خۆی دەبینێتەوە لەو ڕێگا تایبەتەی کە کار دەکات بۆ تێگەیشتن لە مانای چالاکییەک، یاخود هەردیارەیەک و سەرجەم مەدلولە جیاوازەکانی سەبارەت بە یەکتری[٢٠].

[٢٠]- جولیان فروند، سوسولوجیا ماکس فیبر، ترجمة ابي اصبع، بیروت، لا ٢٧.

ڕاڤەکردن لای ڤیبەر بریتییە لە پێکهاتەی زانست، چونکە وا دەکات پرۆسەی تێگەیشتن مومکین بێت، بە هۆی زانستییەوە دەکرێت لە دیاردەکان تێ بگەین، هەروەها پەیوەندییەکی تۆکمە هەیە لە نێوان تێگەیشتن و ڕاڤەکردن، دەکرێت لە هەموو پەیوەندییەك تێبگەین بەهۆی دەرککردن و تێگەیشتن، هەروەها دەبێت لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی هۆکارگەرایی ڕاڤە بکرێن، لێرەوە بە سۆسیۆلۆجیای ڤیبەر دەگوترێت (سۆسیۆلۆجیای تێگەیشتن)، چونکە بایەخیدا بە تێگەیشتن و ڕاڤەکردن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو سۆسیۆلۆجیا لای ئەو بریتییە لە (زانستێك کە ئامانجی تێگەیشتنی چالاکی کۆمەڵایەتییە لە ڕێگای ڕاڤەکردن، بۆ ئەوەی دواتر بە شێوەیەکی هۆکارگەرایی ئەو چالاکییە و دەرەنجامەکانی ڕاڤە بکرێت)[٢١].

## ٢. پێشبینیکردن

زانست تەنیا دیاردەکان ڕاڤە ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات پێشبینیشیان بکات، بەشێوەیەك کە گشتاندنی ئەو ڕاڤەکردنە لە داهاتوودا ڕوبدات. بەوشێوەیەی کە باسمان کرد ئامانجی ڕاڤەکردن بریتییە لە دانانی یاسا و تیۆری گشتی کە بەکەڵك بێت بۆ پراکتیزەکردن لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دیاردانەی کە سەر بەهەمان جۆرن، بۆ نمونە زانا توێژینەوە دەکات لە بارەی هۆکارەکانی بەهەڵمبوون، بۆی دەردەکەوێت کە هۆکار، یاخود ڕاڤەکردنی زانستی بۆ ئەو دیاردەیە بریتییە لە بەرزبونەوەی پلەی گەرما تا پلەیەکی دیاریکراو. لێرەوە

---

[٢١]- جولیا فروند، همان سەرچاوە، لا ٤٨.

یاسایەکی گشتی دەردەکەوێت کە دەکرێت بە هۆیەوە پێشبینی ڕوودانی دیاردەی بە هەڵمبوون بکرێت بۆ شلەکانی یەك جۆر، ئەگەر کەوتە ژێر پلەی گەرمی، ئەمە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش ڕاستە لە چەند حاڵەتێکی سنووردار، ڕەنگە لە نێوچوونی دیموکراسی و ستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری ببێتە هۆی شۆڕش، بەمپێیەش دەکرێت پێشبینیان بکەین، کە شۆڕش یاخود شڵەژانی کۆمەڵایەتی ڕەنگە ڕوو بدات لە هەر کۆمەڵگایەك کە دیموکراسییەتی تێدا نییە، بەمەش هاوڵاتییان لە دەست ستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری دەناڵێنن.

ئەو وێنایە بۆ زانست لە ئەرکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستیش بەشێوەیەکی تایبەت جیانابێتەوە، چونکە ئەرکەکەی تەنیا بەسەر ئێستا کورت نابێتەوە، بەڵکو تەنیا بۆ داهاتووش، ئەمە ئامرازگەلێك دەخاتە بەردەستی مرۆڤ کە وای لێدەکات ڕووبەڕووی مەترسییەکانی داهاتوو ببێتەوە.

کەواتە مانای پێشبینیکردن بەمشێوەیە: دڵنیابوون لە هاوتابونی پرەنسیپ، یاخود ئەو ڕێسا گشتییانەی کە بە چەند حاڵەتێك گەیشتوون لە هەلومەرجی جیاواز لەو هەلومەجەی کەوتۆتە ژێر باس، بەڵام سەر بەهەمان جۆری ئەو دیاردەیە، پێشبینیکردن هەمان ئەرکی هەیە، مەبەستیش لە پەرەپێدانی مەعریفەی زانستی، بەهۆی ئەوەی کە توێژینەوەی زانستی یارمەتیدەرە لە دڵنیابوونەوە لە دروستی زانیارییەکان، ئەگەر پێشبینییەکە ڕاست دەرچوو ئەوا مانای ئەوەیە کە زانیاری و یاساکان ڕاست بوون، بەڵام ئەگەر ڕاستی

ئەو پێشبینیانە بەدەرکەوت ئەوا پێویست دەکات پێداچونەوە بۆ ئەو زانیاری و یاسایانە بکرێت کە بۆ شیکردنەوە پشتی پێدەبەستین.

دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە بکەیت کە توانای پێشبینیکردن لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان کەمترە بەهۆی ئاڵۆزی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان و زۆری ئەو فاکتەرانەی کە تێکەڵ بە یەکتر دەبن، چونکە ڕووداو، یاخود دیاردەی کۆمەڵایەتی بابەتەکەی مرۆڤە، ئەمەش ملکەچی ئارەزوو و مەیل و هەڵچوونە کە ناکرێت کۆنترۆڵ بکرێت و پێشبینی ڕوودانی بکرێت.

## ٣. کۆنترۆڵکردن

مەبەستم لێی کۆنترۆڵکردنی ئەو فاکتەرانەیە کە دەبنەهۆی ڕوودانی شتێك، بۆ ئەوەی بە تەواوی ڕوو بدات، یاخود ڕێگای ڕوودانی بگیرێت، ئەوەی زانراوە کە کۆنترۆڵکردنی هێزی سروشتی، یەکێکە لە ئامانجەکانی مرۆڤ، زانست توانی کۆنترۆڵی بەشێکی زۆری دیاردەکان بکات، ئینجا چ لە زانستە سروشتییەکان، یاخود لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بێت.

بۆ نموونە لە زانستی پزیشکیدا، پزیشك دەتوانێت کۆنترۆڵی زۆرێك لە نەخۆشییەکان بکات، سنورێکیش بۆ هەندێکیان دابنێت، ئەو پزیشکەی کە هۆکاری نەخۆشی شەکرە دەزانێت کە بریتییە لە کەمی ئەنسۆلین، هۆکاری تێکچونە لە پەنکریاس، دەکرێت دەرزی ماددەی ئەنسۆلین لە نەخۆشەکە بدات بۆ قەرەبۆکردنەوەی ئەنسۆلین و کەموکوڕییەکانی. لەپاڵ توانای زۆری

مرۆڤ لە کۆنترۆڵکردنی چەندین دیاردەی سروشتی و سنووردانانی بۆ مەترسی، یاخود دانانی لە خزمەتی مرۆڤ وەك لافاو و با...هتد.

لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا توانای کۆنترۆڵکردن دژوارترە بە هۆی سروشتی دیاردەی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا یارمەتی مرۆڤی داوە بۆ کۆنترۆڵکردنی چەندین دیاردەی کۆمەڵایەتی، ئەگەر بۆ چارەسەرکردنیشی نەبێت، بۆ قوڵکردنی زانیارییەکان و سنووردانانە بۆ مەترسییەکان، وەك لادانی نەوجەوانان و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و سواڵکردن و توندڕەوی ئایینی، ئەوەش ڕوونە کە چەندە توانای تێگەیشتن زۆربێت، توانای کۆنترۆڵکردن زیاتر دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا زانست لە دۆخی ئێستایدا توانای سنووردارە لە کۆنترۆڵکردنی هەموو دیاردەکان ئینجا چ سروشتی، یاخود کۆمەڵایەتی بێت، ئەوە ڕوونە کە لە ئێستادا زانست بێتوانایە لە بەردەم دیاردەی بورکان، یاخود بومەلەرزە. هەروەها بێتوانایە لە دانای سنوور بۆ مەترسییە چاوەڕوانکراوە لە دەرەنجامی کونبوونی پەردەی ئۆزۆن. هەروەك ئەمڕۆ بێتواناشە لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ نەخۆشی لە دەستچوونی بەرگری، لەگەڵ ئەوەش کە سەرکوتوو بوە لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ چەندین نەخۆشی و پەتا کە لە پێشوودا مرۆڤی لە ناوبردووە، هەمان شتیش بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان ڕاستە، بە شێوەیەك تا ئێستاش لە هەندێك بار ئیفلیجە لە بەدەم بڵاوبونەوەی هەندێك دیاردەی کۆمەڵایەتی وەك

ئالودەبوون بە ماددەی هۆشبەر، جەنگی ناوخۆ، بێکاری و توندڕەوی سیاسی و تیرۆر و جەنگە وێرانکارەکان.

هەندێك دەگەنە ئەو ئاستەی کە تۆمەت بخەن پاڵ زانست، نەك تەنیا لەبەر بێتوانایی لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هەموو کێشەکانی ئێستا، بەڵکو بەهۆی بێتوانایی لە کۆنترۆڵکردنی هەندێك کێشە کە سەرچاوەکەی پیسبوون و چەکی ئەتۆمی و کێشەی کۆمەڵایەتین وەك بێکاری و لادان و هەڵوەشانەوەی خێزانی.

مەعریفەی زانستی بریتییە لەو مەعریفەیەی کە زانست لە بەدەستکەوتنی داتای پشتی پێدەبەستێت، ئەگەر سەدەی نۆزدە سەدەی دروستکردنی کردەیی مەعریفەی زانستییە وەك مەعریفەیەکی هەمەکی، ئەمە مانای ئەوە نییە کە پێش مێژوو نا ئامادەییەکی تەواوی مەعریفەی زانستی بێت وەك مەعریفەیەکی هەمەکی، بەڵکو گەلە کۆنەکان چەندین شێوازی مەعریفەی زانستییان هەبووە لە بوارە دیاریکراوەکاندا، بەڵام کاریگەری و بڵاوبونەوەشی سنووردار بووە، بۆ نموونە یۆنانییەکان ئاشنابوون بە مەعریفەی زانستی، دیمۆکرێتیس جەختی کردەوە لەسەر هەموو گۆڕانەکان لە سروشت کە دەگەڕێتەوە بۆ پرۆسەکانی پەیوەندی و جیابونەوە لە نێوان ئەتۆمەکانی بونەوەرێك، ئیبن خەلدون داوای کرد میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا بەکاربهێنرێت، لە پاڵ دانانی بنەمای زانستێکی تازە کە پێی دەگوترێت ئاوەدانی مرۆیی، کەچی بیرکردنەوەی زانستی

لەوکات بەرتەسك بوو بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی، تا ئەوکاتەی کە گورزێکی کوشندە بەر مەعریفەی فەلسەفی کەوت لەسەر دەستی بیرمەندی پۆزەتیڤیزمی وەك فرانسیس بیکۆن (١٧٩٨_١٨٥٧) و ئۆگوست کۆنت و دیڤێد هیوم و چەندانی دیکە.

بیکۆن داوای سەربەخۆیی فەلسەفەی کرد لە زانست، گاڵتەی بە فەیلەسوفەکانی سەدەی ناوەڕاست و کۆن دەکرد کە پێیانوابوو تێڕامانی تیۆری دەکرێت کێشەکانی زانست چارەسەر بکات، هەروەها داوای بەریەککەوتنی کرد لەگەڵ سروشت و ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵیدا، هەروەها هەست و عەقڵ بەکاربهێنرێت لە تێبینیکردن و ئەزموونکردنی واقیع، هەروەها بیکۆن جەختی کردەوە لەسەر توانای پراکتیزەکردن لە زانست، بەمەش بیرۆکەیەکی لە نێوبرد کە بۆ چەندین سەدە لای یۆنانییەکان باوبوو، بەوەی کە زانستی حەق ئەو زانستە تیۆرییەیە کە نابێت پیس بکرێت بە بەریەککەوتن لەگەڵ واقیعەکان، واتە زانست لە پێناو زانست بوو، یاخود مەعریفە لەپێناو مەعریفەدا بوو.

زانست ئامرازێکە لە پێناو بەرژەوندی کۆمەڵگا، زانستێك بەکەڵك نەیەت بۆ پراکتیزەکردنی، شایانی ئەوە نییە پێی بگوترێت زانست، بۆیە بیکۆن داوای کرد پێویستە بە چەند یاسایەك بگەین، کە ڕێکخستنی واقیع سنووردار دەکات و سروشت ئاڕاستە دەکات لە خزمەتی مرۆڤ و هەر ئەویش خاوەنی

وتەیەکی بەناوبانگە کە دەڵێت: (بۆ ئەوەی مرۆڤ سروشت لە خزمەتی خۆی بەکاربهێنێت دەبێت یەکەمجار توێژینەوەی بکات).

هەرچی ئۆگۆست کۆنتیشە (١٧٩٨_١٨٥٧) دامەزرێنەری پۆزەتیڤیزم دادەنرێت و بنەماکەی لە کتێبی (چەند وانەیەك لە بارەی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم) بڵاوکردەوە، تیایدا جەختی کردەوە لەسەر گرنگی هزری زانستی کە لەسەر تێبینکردن و ئەزموونکردن و بایەخدان بە واقیعی بەرهەست وەستاوە، کۆنت جیاوازی کرد لە نێوان سێ قۆناغ لە پەرەسەندنی هزری مرۆیی:

- قۆناغی هزری لاهوتی: تیایدا مرۆڤ بە شێوەیەکی غەیبانی بیر دەکاتەوە، پێیوایە ئارەزووی هێزێکی نادیار سروشت بەڕێوەدەبات، خێر و چاکەش تاکە یاسایە، لەوکات کەس حەتمییەتی نەدەزانی.
- قۆناغی میتافیزیکی کە قۆناغی تێڕامانی عەقڵی ئەبستراکتە.
- قۆناغی پۆزەتیڤیزم، پشت بە ئەزموون و تێبینیکردن دەبەستێت.

بیرکردنەوەی زانستی بۆتە خەسڵەتی جیاکەرەوەی ئەم چاخە، زۆرینەی توێژینەوە و ئاراستەکان بە تایبەتی پۆزەتیڤزم پەیڕەوی دەکەن، کە بە درێژکراوەی مەعریفەی زانستی دادەنرێت و بە پۆزەتیڤیزمیش ناوزەند کراوە، چونکە بەوەی کە هەیە ڕازییە، دەیەوێت لەسەر بنەمای دەرککردنی عەقڵانی ڕێکوپێك واتە بەهۆی زانست ڕێکی بخاتەوە.

ئۆگۆست کۆنت لە گرنگترین ئەو کەسانەیە کە ڕەخنەی توندی لە بیرکردنەوەی میتافیزیکی گرتووە، بەشێوەیەك پێیوایە عەقڵ بێتوانایە لە زانینی هەر شتێکی دەرەکی، مرۆڤیش هیچ شتێکی نییە کە پاڵپشتی دەرەنجامێك بکات دوور بێت لە هەمان شت، واتە هەر بەریەککەوتن بە واقیع و تێبینیکردن و ئەزموونکردنە مەعریفەی دەربارەی شتەکە بەرهەمدەهێنێت، ئەمەش هەمان هەڵویستی داڤید هیومە[٢٢].

پۆزەتیڤیزم ئاڕاستەیەکی هزرییە پشت بە ئەزموون دەبەستێت و پەنا بۆ میتۆدی زانستی دەبات لە وەرگرتنی داتاکانی، ئەم مەعریفەیەش لە مەیدانی زانستە سروشتییەکان درێژبۆتەوە و جیهانی مرۆییشی گرتۆتەوە، کۆنت باس لەوە دەکات کە چۆن پەرەسەندن بەسەر زانستەکاندا هات ئەوکاتەی سنوورێکی بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفی دانا، بە هەمان شێوەش ئەگەر بمانەوێت فاکتی بابەتیمان لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەستبکەوێت، دەبێت خۆمان دوور بگرین لە بۆچوونی کەسی و خۆمان بێ لایەن بکەین.

## ب)خەسڵەت و تایبەتمەندی مەعریفەی زانستی

مەعریفەی زانستی هەروەکو پێشووترا ئاماژەمان پێکرد لە ڕێگای کارکردنی ئەقڵەوە دێت لە واقیع ، واتە لە ڕێگای پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لە نێوان

---

[٢٢]- دافید هیوم (١٧١١_١٧٧٦)، فەیلەسوفێکی ئوسکتلەندییە و لە بانگەشەکارانی زانستی ئەزموونییە، ئەو دەڵێت هەڵبژاردن سەرچاوەی هەموو مەعریفەیەکە و فەلسەفەکەشی دروست بووە لەسەر گەڕاندنەوەی مەعریفەی مرۆیی بۆ ئەزموون کە سود وەردەگرێت لە هستدانەوەی زیهن لە هەموو وردەکارییەکانی نێو واقیع.

ئەقڵ و واقیع نەك لە ڕێگای جیاکردنەوەیان، بەڵام ئەو مەعریفەیە کە پێشینەیی بە واقیع و ئەقڵ دەدات ئەوە لە بیر دەکات. ئەو مەعریفەیەی لە پێش عەقڵی مرۆیی و واقیع هەیە مەعریفەی خوداییە، چونکە پرسەکانی باوەڕ مەرج نییە بخرێتە ژێر کاریگەری عەقڵ و ئەزموون. لێرەوە زانا موسڵمانەکان جیاوازیان کرد لە نێوان مەعریفەی خودایی و مەعریفەی مرۆیی، مەعریفەی زانستی سەر بە جۆری دووەمە[٢٣]، بۆیە لە باسی داهاتوماندا، مەعریفەی زانستی و میتۆدی زانستی باس دەکەین، بەوشێوەیەی کە لە پێشودا هزری زانستی خۆرئاوا بەدەرکەوت و پەرەی سەند، هەورەها باس لە بۆچونی زانا موسڵمانەکان دەکەین لە بارەی هەندێك پرس، کە پرسگەلێکن بەداخەوە زۆرسادە و ساکارن[٢٤]. ئەو مەعریفە زانستییەش بەم خەسڵەتانەی خوارەوە جیا دەبێتەوە.

### ١. دوورخستنەوەی زانیاری نادروست

ئەمەش مانای ئەوەیە کە توێژەر بە دووخستنەوەی هەموو هزرە پێشینەکان دەست بەکاری خۆی دەکات، ئەو هزرانەی کە زانست پشتگیری ناکات و بەڵگە نییە لەسەری، ئینجا چ ئەو هزرانە ئەبستراکت و گشتی بن، یاخود

---

[٢٣]- بۆ نمونە مۆوفی موسڵمان ناتوانێت بەشێوەیەکی ئەزمونی فەرمایشتی حەجکردن و ڕۆژی دوایی و سەفا و مەروا شەیتان ڕەجمکردن بسەلمێنێت، هەمان شتیش بۆ ئەو ڕێورەسمانە راستە کە ئایینداڕەکانی تر مومارەسەری دەکەن.

[٢٤]- لەبارەی ئەو بابەتە بۆ ئەم کتێبە بگەڕێوە:
فرانتز رونتال منهاج العلماء المسلين في البحث العلمي، ترجمة انيس فريحة، بيروت ١٩٨٣، ط٤ .
نبيل محمد توفيق السمالوطى، المنهج الاسلامي فى دراسة المجتمع، المملكة العربية السعودية، دار الشروق، ١٩٨٠، ط١.

گریمانەگەلێك بن کە توێژینەوەکە پێویستی پێ بێت. باوەڕ خەسڵەتێکی سەرەکییە لە خەسڵەتەکانی مەعریفەی زانستی، چونکە زانیاری نادروست، یاخود ئەوانەی کە بە بەڵگە نەسەلمێنراوە دەبێتە هۆی چوونە ناو پێچوپەنا و هەڵە کە لەسەر شەقامی ڕاستی دوورمان دەخاتەوە.

هەموو زاناکان بایەخێکی زۆریان بە پرسی باوەڕ (الیقین) داوە لە مەعریفە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوان دەیانەویست خۆیان لە هەڵە بەدووربخەنەوە کە ڕەنگە مەعریفەی وەرگیراو لە مەعریفەی ئەفسانەیی و فەلسەفەیی دروستی بکات، چونکە باوەڕی تێدا نییە. باوەڕیش بە شتی دیار و بەرهەست کراوە، ئەمەش وایکرد کە کۆنت بڵێت (هەر شتێك بکەوێتە پشت هەستەکان بوونی نییە)، هەروەها جەختی کردەوە لەسەر پێویستی دوورخستنەوەی زانیاری نادروست و جێگای گومان. هەرچی دیکارتی خاوەن (تیۆری گومانی میتۆدیە)، جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە پێویستە توێژەر لە گومانەوە دەست بەکار بکات بۆ ئەوەی بگاتە باوەڕ، هەروەها پشت نەبەستێت بە هزرگەلێك کە نەسەلمێندراوە و ناکرێت بخرێتەژێر عەقڵەوە. ئەوکاتەی دەڵێین دوورخستنەوەی هزری پێشینە، مەبەستمان هزری فەلسەفی و ئەفسانی و هزری نازانستییە، هەرچی یاسا و تیۆری زانستی و گریمانەی زانستییە، پێویستە بۆ توێژەر لە کاتی توێژینەوەدا، ئەمەش بەشێك لە مەعریفەی زانستی پێکدەهێنێت، بەڵام دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان چەمکی باوەڕ لە مەعریفەی زانستی لەگەڵ ئەو مەعریفەیەی کە ئایین و مەزهەبەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەمەی دوایی گومان و

دووبـارە چاوپێخشـانەوە بـە پێـدراوەکان لـەخۆ ناگرێـت، بـەڵکو دەبێـت بـێ گفتوگۆ قبولّ بکرێت. هەرچی باوەڕە لە حاڵـەتی یەکەمـدا، ئەمـە چـەمکێکی گشتیی و سنووردارە بە کات و شوێن، ئەمە ئەو هەقیقەتـە هەنوکەییەیـە کـە بـوونی هەقیقەتـەکانی دیکـە ڕەت ناکەتـەوە، یـاخود توانـای دەرکـەوتنی پێدراوی تازە ڕەت ناکاتەوە، ئەمەش وا دەکـات بڵـێین کـە هەقیقـەت بـوونی نییە بە مانا و تێگەیشتنە وردەکەی، چونکە هەقیقەت یان ڕەها دەبێـت یـان بوونی نابێت.

ماکس ڤیبەریش وەك زانا و بیرمەندەکانی دیکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کـە هەقیقەتی زانستی خەسڵەتێکی گریمانەیی هەیە، هەروەك باس لـەوە دەکـات کە هەموو هەقیقەتەکانی زانستی ئێستا هیچ نین جگـە لـە چـەند گریمانەیـەك نەبێت کە دەکرێت چەندین ڕوانگەی دیکەی بخەینە بەردەم، زانای ڕاستەقینە ئەو زانایەیە کە دان بەوە دەنێت کـە دەکرێـت بۆچـونەکانی تـێ بپـەڕێنرێت، ئەوەش دژی زانستە ئەگەر بڵێت بۆچونەکانی یان ڕەهان، یان بونیان نییە.

### ٢. وردی و بە چەندێتکیردن

وردی و بـە چـەندیکردن لـە مەعریفـەی زانسـتی واتـە بـەکارهێنانی چـەمك و زاراوە و زانیـاری ورد، یـاخود بەشـێوازێکی دیکـە بریتییـە لـە بـەکارهێنانی زمانێکی ماتماتیکی لە توێژینەوە بەهۆی ژمارە و ئامار و خشتەکان.

مەعریفەی زانستی قسەی نا ڕوون و نا ڕۆشن و دەستەواژەی گشتی لەخۆ ناگرێت، بەڵکو توێژینەوەی زانستی ڕاستەوخۆ بەرەو ئامانجەکەی دەچێت، ئەو خەسڵەتەش پێی دەگوترێت پرەنسیپی دەستگرتن بەکات، بیرۆکەکەیشی ئەوەیە کە دەبێت دیاردەکان بە زیاتر لە شێوازێك شیبکەینەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەوکاتەی ڕاڤەکردنی دیاردە پێویستی بە شێوازێکی جیاواز هەبێت نابێت دووبارە دەروازەی دیکەی شیکردنەوەی دیاردە زیاد بکرێت و دەبێتە هۆی زیادەڕۆیی لە قسەکردن. ئەمەش ئەو دیاردەیە کە بەداخەوە لە نووسینە عەرەبییەکان بەربڵاوە و زمانی عەرەبیش یارمەتیدەرە بۆ ئەو دیاردەیە.

تاوەکو مەعریفەی زانستی ورد بێت، پێویستە زمانی ماتماتیك بەکاربهێنرێت، واتە گۆڕانی شت و ڕووداوەکان بۆ ژمارە و خشتەگەلێك کە توێژینەوەکردن و تێگەیشتنیان بە وردی ئاسان دەبێت، زمانی ماتماتیك و ورد هیچ کێشەیەك دروست ناکات لە بوارەکانی زانستە سروشتییەکاندا، ئەمە بە سروشتی خۆی دەکرێت کۆنترۆڵ بکرێت، کەچی کێشەکە ئەوکاتە دروست دەبێت کە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دێتەپێشەوە، بەشێوەیەك هەڵوێستەکان تێکەڵ بە یەك دەبن لە بارەی مەودای بەکەڵکی پراکتیزەکردنی چەندایەتی بەسەر دیاردە مرۆییەکاندا.

ئاراستەیەکی دیکە پێیوایە دیاردەی مرۆیی بە هەموو خەسڵەتەکانییەوە جیاواز، لە دیاردەی سروشتی، کە وادەکات پراکتیزەکردنی زمانی ماتماتیکی

(چەندین شێوانی تێدایە) بەسەر خەسڵەتە جەوهەرییەکانی مرۆڤ کە تـەوەری ئـــەو دیاردەیـــە دژوارە، چـــونکە وەك شـــتی بـــێ گیـــان لەگـــەڵ دیـــاردە کۆمەلایەتییەکان مامەڵە دەکات، هەرچی بەرەی دووەمە، جەخت دەکەنـەوە لەسەر پێویستی بەکارهێنانی ئەو میتۆدە زانستییەی کـە زمـانی ماتمـاتیکی بەکاردەهێنێت لە توێژینەوەکرنی کۆمەڵگا و مرۆڤ ، دیکـارتیش لـە گـرنگترین پێشرەوەکانی ئەم ئاراستەیەیە.

هەرچـــی مـــاکس ڤیبـــەرە هەڵوێســـتێکی نێـــوەنجی هەیـــە، ئـــەو بۆچـــونە رەتدەکاتەوە کـە هـیچ مەعریفەیـەکی زانسـتی دروسـت نییـە ئەگـەر مـۆرکی چەندایەتی نـەبێت، بەشـێوەیەك لـە پێـوان و زمـانی چـەندی دەڕوانێـت وەك میتۆد نەك هیچی دیکە، ئەو گاڵتە بەو زانایانە دەکات کە بەشێوەیەکی ڕەهـا هەموو ژیانی کۆمەلایەتی و هـەموو دیاردەیـەکی سۆسـیۆلۆجی بگۆڕنـە سـەر شێوەی ژمارە. (ئایا ژمارە دەتوانێت چی بخاتە سەر دیاردەیەك کە لـەخۆوە لێی تێدەگەین؟ ڕەنگـە هەڵـە بکەوێتـە نێـو چـەند پرسـێکی ڕوون، هـەروەها سیمایەکی زانستیش بخاتە سەر چەند کارێکی نازانستی).

ڤیبەر دەڵێت پێویستە جیاوازی بکەین لە نێو دوو جۆری بـە چـەندیکردن لـە نێـو توێژینـەوە کۆمەلایەتییەکانـدا، ئـەو چـەندییەی کـە یارمەتیـدەرە بـۆ تێگەیشتنی چەند پرسێکی دیاریکراو، لەگەڵ ئەو چەندییەی کـە زانسـتخوازە

ساختەکان پەنای بۆ دەبن، کە پێیانوایە کێشەکان چارەسەر دەکەن ئەگەر ژمارە و پرۆسەی ماتماتیکی، یاخود هێلکاری بەیانی بخەنەسەر [٢٥].

### ٣. ئەبستراکتبوون

ئەبستراکتبوون خەسلەتێکە و پەیوەستە بە کار، مەبەستمان لێی گۆڕینی دیاردە و شتەکانە بۆ هزر و چەمکی زیهنی کە بەهۆی عەقلەوە دەرك دەکات نەك هەستەکان. بۆ نموونە منداڵ بە تۆپی بچووك فێری ماتماتیك دەبێت، سێ تۆپ+دوو تۆپ= پێنج تۆپ تۆپەکانیش دەخرێتە نێو دەستی بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتن لەم پرۆسەیە لە زیهنیدا، ئەو هاوکێشەیە لەو شتە بەرهەستانە جیادەکرێتەوە کە پێی لکاوە (تۆپەکان)، زانیارییەکەش بە ڕاستی و ئەبسراکتی دەمێنێتەوە، دەکرێت لە تەواوی حاڵەتە هاوشێوەکان پراکتیز بکرێت.

واتە مەعریفە بە تێبینیکردنی هەستی دەست پێدەکات دوای ئەوەی لە میانەی تێبینیکردن و ئەزموونکردن بە چەند خەسلەتێکی شتەکان بۆ ئەوەی بیانگۆڕین بۆ هزر و چەمکی زیهنی ناپەیوەست بە شتی پەتی، بەڵکو بەسەر سەرجەم حاڵەتە هاوشێوەکان پراکتیزە دەکرێت. هەرچەندە زانست پێش بکەوێت و پەرەبسەنێت، زیاتر لەسەر بنەما سەرەکییەکانی دووردەکەوێتەوە کە تێبینیکردنی هەستەکی و ئەزموونە، زانستیش زیاتر لە ڕەمز و ئەبستراکتەکان نقوم دەبێت، بۆ بالادەستبوونی شێوازی زانست بەسەر

[٢٥]- نبیل محمد، هەمان سەرچاوە، لا ٥.

جیهانی بەرهەست و قوڵبونەوە و دەبێت لێیان دوور بکەوێتەوە و لە خەسڵەتە ئاشنا و ئاشکراکانیان دایانماڵێت[٢٦]. هەر ئەمەیش بوو فەیلەسوفی فەڕەنسی گوزارشتی لێکرد ئەوکاتەی گوتی پێویستە لەسەر عەقڵی مرۆیی فێر بێت چۆن لە جیهانی ماددی سەربەخۆ دەبێت.

برتراند راسڵ (١٩٧٢_١٩٧٠) فەیلەسوفی ئینگلیزی لە بارەی بیرۆکەی ئەبستراکتبون دەڵێت: (عەقڵی زانستی شتە هەبووەکانی واقیع چارەسەر ناکات وەك هەیە، بەڵکو وەك ئەوەی چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوی باسیان دەکات هەیە، ئەوکاتەی ئێمە قسە لە بارەی شوێن، یان جوڵە دەکەین وەك قسەکردن نییە لەسەر شوێنی کردەیی، یاخود جوڵە وەك ئێمە دەیناسین لە ئەزمونی خۆمان، بەڵکو ئێمە قسە دەکەین لە بارەی شتێك کە خاسییەتی گشتی ئەبستراکتی هەیە لە شوێن، یاخود لە جوڵەکردندا)[٢٧].

هەروەك ئەمە حاڵی بەچەندێتیکردن بوو لە حاڵەتی پەنابردنیش بۆ ئەبستراکت لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان، ڕەنگە ببێتە هۆی خزان بەرەو ناوچەی ترسناك، بە تایبەتی ئەگەر خراپ بەکارهات، ئاسانی ئەبستراکتبوون بە بەکارهێنانی وتە و چەمکی گشتی، ڕەنگە ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە ئەو

---

[٢٦]- هەمان سەرچاوە، لا ٢٤، هەروەها محمد احمد الزغبي، علم الاجتماع العام و البلدان النامية، مدريد، ١٩٨٥.

هەردوو سەرچاوەی سەرەکی ماکس ڤیەر ئەوانەن:

Weber M. Fssays in Sociology (Rouledge and Kegan Paul, London, 1948).

Weber, The Theory of Social and Econ_mic organization (Fee Press, Gilencoe, 1964).

[٢٧]- فؤاد زكريا، التفكير العلمي، سلسلة عالم المعرفة، عدد ٣، الكويت ١٩٨٨، لا ٥٠_٥٥.

وتانە ڕەنگە بە کردەیی گوزارشت بن لە دیاردەی کۆمەڵایەتی لە سەرجەم دۆخەکانی، ئەمەش لە ڕاستیدا مەحاڵە، چونکە یەک دیاردەی کۆمەڵایەتی جیاواز لە کاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە، لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەردەوام کەلێنێک هەبووە لە نێوان مەعریفە، یاخود هزر لەگەڵ واقیع[٢٨].

## ٤. گشتاندن و گشتگیری

ماکس ڤیبەر پێیوایە مەعریفە زانستیبوونی نابێت ئەگەر هەوڵنەدات لە لایەن هەموانەوە قبوڵکراو بێت، نەک تەنیا بە مەیلی چەند کەسێکەوە کاربکات[٢٩].

گشتگیری وەک خەسڵەتێکی مەعریفەی زانستی مانای ئەوەیە کە: (توێژەر ئەو ئەنجام و یاسایانە دەگشتێنێت کە دادەڕێژێت وەک پوختەیەکی کاری توێژینەوەی زانستی بۆ هەندێ دیاردە و نموونە، بۆ ئەوەی ببێتە چەند یاسایەک و بخرێتەژێر حاڵەتی هاوشێوە. ئەو گشتاندنانەش یارمەتیدەرن لە گواستنەوە لە زانراوەوە بۆ نەزانراو، لەگەڵ پێشبینیکردنی چەند دیاردەیەک کە دەکرێت لە ژێر کاریگەری چەند بارودۆخێکی دیاریکراو ئەنجامبدرێت).

---

[٢٨]- بڕوانە: برتراند راسل، النظرة العلمية، ترجمة عثمان نويه، القاهرة، ١٩٨٥.
_ راسڵ بە یەکێك لە بەناوبانگترین فەیلەسوفە پۆزەتیڤیە شیکاریەکان دادەنرێت، بە توێژینووەکردنی لەبارەی لۆژیك و ماتماتیك ناسراوبو، دوای کتێبەکەی (بنەمای ماتماتیك) بە بەبنەمایەك دادەنرێت بۆ لۆژیکی ماتماتیك، هەروەها بە ناوبانگ بوو بەهۆی بانگەشەکردنی بۆ ئاشتی لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی، هەروەها لە پێشڕەوانی ئەو کەسانە دادەنرێت کە جیاوازی دەکەن لە نێوان زانست و ئایین لە سەر بنەمای هەستەکی لۆژیکی.

[٢٩]- دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان ئەبستراکتی و ئەبستراکت کردن، ئەمەی دوایی یەکسانە بە ئەبستراکتبوون واتە زیادەڕۆییکردن لەسەر حسابی هەقیقەتە بەرهەستەکان.

ئەوکاتەی زانایان ئەوە دەکەنە یاسا کە خێرایی یەکسانە بە ماوەی کات، ئەم هەقیقەتە تایبەتە بە هەموو خێراییەك ئینجا چ ئۆتۆمبێل یاخود فرۆکە یاخود شتی دیکە بێت. هەروەها ئەمە هەموو شتێك دەگرێتەوە، ناکرێت بڵێین تایبەتە بەم کۆمەڵگایە یان ئەوی دیکە، یاخو تەنیا لەسەر کاتی ئێستا پراکتیزە دەبێت، یاخود تەنیا بەسەر ڕابردوو، ئەمە مەعریفەیەکی گشتییە، یاخود باوە، هەر کە بەدەرکەوت، کۆمەڵگا دەبێتە خاوەنی. ئەمە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش ڕاستە، ئەوکاتەی توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان دەڵێن کە نەبوونی هۆشیاری و هەڵوەشانەوەی خێزان لەو فاکتەرانەن کە دەبنە هۆی لادانی کۆمەڵایەتی، ئەو هەقیقەش تەنیا تایبەت نییە بە کۆمەڵگایەکی دیارکراو، بەڵکو دەکرێت بەسەر تەواوی کۆمەڵگاکاندا پراکتیزە بکرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاماژە بۆ مەترسی هەنگاوی گشتاندن بکەین لە بواری کۆمەڵایەتیدا، بە هۆی جیاوازی کۆمەڵگاکان و فرەیی خەسڵەتەکانیانە، جۆراوجۆری ئەو فاکتەرانەی کە بەشدارن لە پێکهاتنی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، ڕەنگە لە هەندێك حاڵەتدا گشتاندن ببێتە هۆی دەرەنجامی نێگەتیڤ و سوودی نەبێت بۆ ئاشکراکردنی ناوەڕۆکی دیاردەی کۆمەڵایەتی، لەمەودوا ئاماژەی بۆ دەکەین ئەوکاتەی باس لە تیۆر و یاسای کۆمەڵایەتی دەکەین.

## ٥. مەعریفەی زانستی مەعریفەیەکی سۆراخکارییە

لە کەموکوڕییەکانی مەعریفەی فەلسەفی ئەوەیە کە مەعریفەیەکی هەڵهێنجاندنی بوو، واتە لەسەر بیرکردنەوەی لۆژیکی دروستبووە، هەر ئەمەش بوو مەعریفەی زانستی کاری لەسەرکرد و مەعریفەی سۆراخکاری خستە جێگای بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەی زانستی.

سۆراخکاری، یان بەلگاندن پێناسە دەکرێت بەمشێوەیە: (بریتییە لەوەی کە زیهن چەند بەشێك توێژینەوە بکات و لەمیانەیانەوە بە چەند حوکمێکی گشتی بگات).

میتۆدی سۆراخکاریش ، لەسەر کۆکردنەوەی چەند بەلگەیەکی ماددی و زانستی دروستدەبێت، کە یارمەتیدەرە لە دروستبوونی گشتاندنگەلێك کە بە ڕاستگۆیی و جێگیری جیا دەبێتەوە، هەروەها ڕێگای بە توێژەر دەدات توێژینەوەی بەشەکانی بکات بۆ ئەوەی بگاتە دەرەنجامێکی کۆتایی کە پەیوەستە بە بابەتی توێژینەوە. بیرکردنەوەی سۆراخکاریش دەستدەکات بە تێبینیکردنی بەشەکانی (واقیعی بەرهەست)، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا ئەنجامێکی گشتی دەربخات، ئەمەش پێچەوانەی هەڵهێنجاندنە کە لە هەمەکییەکان دەست پێدەکات بۆ ئەوەی بگاتە هەندەکییەکان.

**سۆراخکاریش بۆ دوو جۆر دابەشدەبێت:**

**أ. سۆراخکاری تەواو**

دەوەستێتە سەر سنووردارکردنی هەموو حاڵەتە هەندەکییەکان لە چوارچێوەی پرسی لێتوێژراو بۆ ئەوەی بگاتە دەرەنجامێکی گشتی، ئەگەر

سۆراخکاری تەواو ئامرازێك بێت بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەیەك کە جێگای باوەڕ بێت، بە کەڵك نایەت بۆ چارەسەکردنی هەموو کێشەکان، چونکە ئاسان نییە بۆ توێژەر توێژینەوەی هەموو لایەنە هەندەکییەکانی یەك بابەتی دیاریکراو بکات، بە تایبەتی ئەگەر دیاردەی لێتوێژراو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بێت.

### ب. سۆراخکاریی ناتەواو

لێرەدا توێژەر لە میانەی توێژینەوەی هەندێك بەشی دیاردە بە ئەنجامەکانی دەگات، ئەنجامەکەش بەسەر هەموو ئەو حاڵەتە هاوشێوانە دەگشتێنیت کە تێبینیان دەکات، لە توێژینەوەی زانستی، لە بواری کۆمەڵایەتی، سۆراخکاری نا تەواو بە کاردێت زیاتر لە سۆراخکاری تەواو، بەڵام ئیستقرا هەندێك کێشە دروست دەکات، لە نێویاندا ڕاستی حوکمی هەندەکی بەڵگە نییە لەسەر ڕاستی حوکمی گشتی، ئەمەش لە پێشوتردا ئاماژەی بۆ کراوە لە کاتی قسەکردن لە بارەی گشتاندن.

پرسی ئیستقرا وەك یەکێك لە پرسەکانی مەعریفەی زانستی کێشەیەکی دروستکرد لە نێو لایەنگرانی ڕێبازی گریمانەیی و ڕێبازی چەمکی یاسایی، لایەنگرانی ڕێبازی دووەم پێیانوایە یاسای گریمانەیی و ئەگەری، کێشەی بۆ دروست ناکرێت لە لایەن ئیستقراوە، بەڵام کێشە هەیە لەگەڵ یاسای وەسفی کە ددان بەوە دەنێت کە یاسا وەسفی دیاردەکان دەکات، لەم حاڵەتەدا کە دیاردەکان جێگیر نین، ملکەچی پرەنسیپی پەرەسەندن و گۆڕان دەبن، بە

کات و شوێن دەگۆڕێن، بۆیە چۆن حوکم لەسەر ڕاستی یاسای ئێستا بدەین لەسەر حاڵەتی ڕابردوو، یاخود داهاتوو، ئەی چی بڵێین لە بارەی جیاوازی نێوان دیاردەکان بە جیاوازی شوێنەکان؟

لە داهاتودا، لە کاتی قسەکردن لەسەر یاسا زانستییەکان زیاتر لەسەر ئەم بابەتە هەڵوەستە دەکەین ، کاتێك دەگوترێت کە مەعریفەی زانستی لەسەر میتۆدی سۆراخکاری دروستبووە، مانای ئەوە نییە کە بەتەواوی لە میتۆدی هەڵهێنجاندن دوور بکەوینەوە، بەڵکو هەردووکیان تەواوکەری یەکترن، ناکرێت زانست بێ ئەوان بەرەو پێشەوە بچێت. بەڵکو هەریەکەیان پشت بەئەویتریان دەبەستێت، دەکرێت توێژەر بگاتە ئەنجامی کۆتایی لە ڕێگای سۆراخکاری، هەروەها وەك گشتێکی بەڵگەنەویست بەکاری بهێنێت لە بەڵگەناندنی ئیستنباگی، لەوحاڵەتەدا فەلسەفی نابێت لە بیرکردنەوە، یاخود ڕەفتاری، یاخود گشتێتی، یاخود ئەو پرسە گەورەیەی کە لێیەوە دەستی پێکرد بۆ ئەوەی بگاتە دەرەنجامێکی هەندەکی، ئەمە پرسێکە ڕاستییە زانستییەکەی دەرکەوتووە لە ڕێگای‌سۆراخکارییەوە(٣٠).

ئەوەی کە ئیستقرا وەك ئەلتەرناتیڤێك دابنرێت بۆ هەڵهێنجاندن وەك خەسڵەتێکی مەعریفەی زانستی، یاخود مەرجێك بۆی، لە لایەن دیکارت و یوانکاری(٣١) و کارل پۆپەر(٣٢) ڕەتکراوەتەوە، ئەوانە بەرگریان لە

٣٠- سوسیولوجیا ماکس فیبر، هەمان سەرچاوە، لا ٢٥.
٣١- بۆ وردەکاری زیاتر بڕوانە: یعرف فهمي سعید، طرق البحث، بغداد ١٩٧٥، لا ٧٧_٨٠.
٣٢- کارل بوبر، علم المذهب التاریخي، دراسة في مناهج العلوم الاجتماعیة، ترجمة عبدالحمید صبرة، الاسکندریة، ١٩٥٩، لا ١٦٣.

هەڵهێنجاندن کرووە، دژی ئەوە بوون کە مەعریفەی زانستی مەعریفەیەکی سۆراخکاریی بێت، پۆپەر ئەو ڕوانگەیە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: باوەڕ ناکەم ئێمە هیچ کاتێك مەعریفەی سۆراخکاریی بەکاربهێنین بەومانایەی کە ئێمە دەست دەکەین بە تێبینی و دواتر تیۆری لێ دروستدەکەین، من پێموایە زانست بەمشێوەیە بڕوات، جۆرێکە لە فێلکردن لە چاو، چونکە ئێمە لە هەموو قۆناغەکانی توێژینەوە بە شتێك دەست پێدەکەین کە سروشتێکی تیۆری هەیە، وەك گریمانەیەك، یاخود حوکمێکی پێشینە، یاخود کێشەیەك، ئەوانەش تێبینیەکانمان بەشێوەیەکی دیاریکراو ئاڕاستە دەکەن، یارمەتیمان دەدەن لە هەڵبژاردنی ئەو شتەی کە لە بۆچونی ئێمە گرنگە زیاتر لە چەند شتێکی دیکە[٣٣].

### ٦. بابەتیبوون

مەبەست لێی چارەسەرکردنی دیاردەکانە وەك شت کە بوونێکی دەرەکی سەربەخۆیان هەیە لە بوونی مرۆڤ، شتی بابەتیش پەیوەندیی یەکسانە لەگەڵ تەواوی تاکەکان، ئینجا ئەو گۆشەیەی کە لێی دەڕوانین چەند جیاوازیش بێت. مانای پابەندبوون بە بابەتیبوون لە توێژینەوەی زانستی ئەوەیە کە دوو توێژەر یاخود زیاتر هەمان ڕێکار بگرنەبەر لە هەنگاوەکانی توێژینەوەی زانستی بۆ هەمان دیاردە، ئەو ئەنجامەشی کە پێی دەگەن یەك شت بێت.

---

[٣٣]- (Poincare J henre) (١٨٥٤_١٩١٢)، فیزیازان و ماتماتیکناس و زانای فەلەکناسە فەرەنسیە و لە بەناوبانگترین کتێبەکانی ئەوەیە (La Valeur de La Science paris).

ئەوەش زانراوە کە پابەندبوون بە بابەتیبوون بەتایبەتی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا کارێکی ئاسان نییە، لە داهاتوو ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین.

لە میانەی بەدواداچونمان بۆ مەعریفەی مرۆیی، تێبینی ئەوە دەکەین کە مەعریفەی مرۆیی دەربارەی دیاردەی سروشتی و کۆمەڵایەتی لە مەعریفەیەك کە باس لە دیاردەکان دەکات لە سۆنگەی کۆسیستەمی هزری گشتی پێش ئەفسانەیی، ئایینی، ئایدیۆلۆجی، کە لە حوکمی بەهایی و پێودانگی بەسەر دیاردەکان خۆی بیناکردوە و گواستییەوە بۆ مەعریفەیەکی بابەتی ئەزمونگەری کە دیاردەکان توێژینەوە دەکات لە میانەی تێبینیکردن و ئەزموونکردن و بەراوردکردن، پاشانیش گشتاندنی ئەنجامەکان، لەم جۆرە مەعریفە زانستییەدا ڕۆڵی حوکمە بەهاییەکان بەرتەسك بۆتەوە لە بەرژەوەندی حوکمەکانی عەقڵ و واقیع، ئەگەرچی دژوارە بڵێین حوکمە پێوەرییەکان بە تایبەتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی کەمبۆتەوە، چونکە مرۆڤ بە تایبەتی لە جیهانی سێیەمدا لە لایەن حەکومی پێشینەی ئایینی، یاخود ئەفسانەیی، یاخود ئایدیۆلۆجیی ئاراستە دەکرێت[٣٤].

---

[٣٤]- کارل پۆپەر، فەیلەسوفێکی ئینگلیزیە و وەك مامۆستای لۆژیك و میتۆدەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان کاری کردوە لە زانکۆی لەندەن، کتێبێکی نوسیوە بەناونیشانی (The Poverty of Historicism).

## بەشی دووەم

# یاسا و تیۆرە زانستییەکان
# خەسلەت و گرنگییان لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا

کە دەگوترێت زانست لەسەر تێبینیکردنی دیاردە و دواتر ئەزمونکردن وەستاوە، لایەنی تیۆردانان و چەمکی ڕەتناکاتەوە، ئەوا دژی ئەو قسەیە نییە کە دەڵێت چەند جێگیرێك هەن ،بریتین لە ڕێورەسمی سروشتی، یاخود وەك ئێرمان کۆفلیێ دەڵێت (ڕووداوە هەستەکییە کۆمەڵایەتییەکان سیستەمێکی سروشتی پێکدەهێنن، هەروەها سروشتێکی کۆمەڵایەتیشییان هەیە و ملکەچی ڕێساگەلێکن)[٣٥]. تێبینیکردن و ئەزموکردن پەیوەندییەکی دیالێکتیکی تێکچڕژاویان پێکهێناوە لەگەڵ لایەنی تیۆردانان و چەمکی، هەردووکیشیان دوو ڕووی یەك دروان لە هەر توێژینەوەیەکی زانستیدا.

ئەگەرچی زانست بە توێژینەوەکردنی واقیعە هەندەکییەکان دەست پێدەکات، بەڵام ئەو واقیعانە بە تەنیا بەس نین بۆ دروستبونی زانست، بەڵکو دەبێت ئەو یاسا گشتییانە ئاشکرا بکات کە ئەو واقیعە هەندەکییە پراکتیزەکەری ئەون، لە لایەکی ترەوە دەرەنجامە بەدەستاتووەکانی

٣٥- ارمان کوفليه، مدخل الى علم الاجتماع، ترجمة نبيه صقر، بيروت ١٩٨٠، لا ١٩.

تێبینیکردن و ئەزموونکردن لە چەند وتەیەك و چەمکێك دادەڕێژرێن، ئەمەش یان یاسان، یان تیۆرن و وەك یەك گشتاندنیان بۆ دەکرێت.

نابێت یاسا و تیۆر تێکەڵ بە یەك بکەین، یاسا ئەبستراکتتر و گشتیترە لە تیۆرەکان، ناتوانێت پێشبینی ڕەفتار بکات، هەرچی تیۆرە یاسا شرۆڤە دەکات و هەوڵدەدات لێی تێبگات، ئەگەرچی تیۆر لەگەڵ یاساکان دەگونجێت بەهۆی ئەوەی کە ڕێژەیی و نزیکراوەن، کەچی دڵنیایی کەمترە لە یاساکان(٣٦).

## باسی یەکەم
## یاسا زانستییەکان

### أ) پێناسەکردنی یاسا:

ئەوکاتەی زانستمان پێناسە کرد بەوەی کە زانست ئامانجی توێژینەوەکردنی پەیوەندی نێوان دیاردەکانە، بە پەیوەندییە جێگیرەکانیش دەگوترێت یاساکان.

یاسا گوزارشتە لە پەیوەندییەکی پێویست لە نێوان دوو دیاردە یان زیاتر.

یاسا بە توخمێکی سەرەکی دادەنرێت لە توخمەکانی گەردوون، جیهانی سروشتی و کۆمەڵگای مرۆیی بە شێوەیەکی هەرەمەکی بەڕێوەناچێت، یان

٣٦- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٢.

نارێکوپێکی تێدابێت، بەڵکو بە یاساگەلێك بەڕێوەدەچن بۆ پاراستنی سیستەمی جیهانی سروشتی و کۆمەڵگا مرۆیی، ئەو پابەندبونەش بە یاسای گشتی لەگەڵ پەرەسەندن و پێشکەوتن دژییێك نییە، خودی پەرەسەندن بەگوێرەی یاسا بەڕێوەدەچێت، یاسا پێویستە بۆ بوونی ژیان، ئەگەر یاسا بوونی نەبوو، بوونی کردەیش نامێنێت، جیهان لەناو دەچێت ئەگەر یاساکان نەناسرێن، ئەزموونیش بونی نامێنێت، بەمەش تێگەیشتن لە جیهان کۆتایی پێ دێت. جیهان بەتاڵە لە گێرەشێوێنی، چونکە شێوەکانی یاسا لە هەموو شوێنێکدا هەیە[٢٧].

بۆچونەکان جیاوازن لە بارەی سروشتی یاسای زانستی، چوار ڕێباز هەن بۆ ڕوانین لە سروشتی یاسای زانستی لە ڕوانگەی زانستییەوە:

**١. ڕێبازی یاسای پەنهان (شاراوە)**

ئەو ڕێبازە پێیوایە هۆکاری سەرەکی خۆی لە ماهییەتی شت و خەسڵەتە جەوهەرییەکاندا شاردۆتەوە ، ئەگەر لەو خەسڵەتە جەوهەرییە تێبگەین و پەیوەندییەکانی نێوانیان دەرك پێ بکەین، دەبێتە هۆی ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندییانەی کە بە گوێرەی شێوازێك یاخود سیستەمێك بەڕێوەدەچن کە پێیان دەگوترێت یاسا.

[٣٧]- روبرت مكايفر، الجماعة، دراسة في علم الاجتماع، القاهرة، ١٩٦٨، لا ٣٨.

ئەوەی جێگای تێبینییە ڕێبازی پەنهان (شاراوە) ئەقڵ و دەرککردنی مرۆڤ دەسڕێتەوە، چونکە باوەڕ ئەوە نییە کە وایتهێد[(٣٨)] پێی دەڵێت سەربەخۆیی خودییانەی شتەکان، شت ڕاڤە دەکات و دەڵێت: (دوای دەرهێنانی ئەو یاسایانە، مەبەستم دوای دەرهێنانی سیستەمی ئەو پەیوەندییانەی کە شتەکان بە یەکترەوە دەبەستێتەوە، دەتوانین مانای ئەو یاسایانە دیاری بکەین، شتەکانی پێ ڕاڤە بکەین، چیتر پێویستمان بە گریمانەکردنی بوونی بونەوەرێکی ڕەهای جیاواز لە سروشت نییە لە دەرەوەدا، چونکە بەمە سروشت خۆی خۆی ڕاڤە دەکات[(٣٩)]).

## ٢. ڕێبازی یاسای گریمانەکراو

ئەو ڕێبازە دروستبووە لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی ڕێبازی یەکەم، دەڵێت (ئەو پەیوەندییە ناوەکییە ملکەچی ئەو پرەنسیپە پێویستەیە کە لە خۆیدا بەسە، ئەو ڕێبازە لە سۆنگەی تیۆری میتافیزیکییەوە پێیوایە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان بونەوەر، یاخود بونەوەرە باڵاکان و سیستەمی سروشتی، بەشێوەیەك دژوارە ماهییەتی شتەکان ئاشکرا بکەین لە میانەی وەستان لەسەر ئەو پەیوەندییانەی کە ئەو شتانە تێکەڵ بە یەکتر دەکات، هەروەها دژوارە یاسا، یاخود ئەو پەیوەندییانە ئاشکرا بکەین کە ئەو شتانە بە یەکترەوە دەبەستێتەوە لە ڕێگای ماهییەت و خەسڵەتەکانی ئەو شتانە،

[٣٨]- هوایتهید، ئالفرێد نورس (١٨٧١_١٩٤٧) (فەیلەسوف و ماتماتیکزانێکی ئینگلیزی بەناوبانگە، مەیلی هەیە بۆ سۆفیگەری، چەند پۆستی زانستی وەگرتووە لە کۆمەڵە فەلسەفییە ئینگلیزیەکان، بە کتێبی (زانست و جیهانی مۆدێرن) بە ناوبانگبوو) (١٩٢٥)

[٣٩]- محمد فرحات عمر، طبيعة القانون العلمیی، القاهرة، ١٩٦٦، لا ٢١.

هەروەها پێیوایە کاری خودایی لە پشت ئەو پەیوەندییانەیە، بەشێك لە لایەنگیرانی ئەو تیۆرە پێیانوایە ئەو پەیوەندییانە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خودا و حیکمەتەکانی[٤٠].

### ٣. ڕێبازی یاسای وەسفی

لایەنگیرانی ئەو ڕێبازە پێیانوایە یاسا تەنیا وەسفێکە بۆ دیاردەگان دوای ئەوەی تێبینیان دەکات و بەراوردیان دەکات.

ئەو تیۆرە بە سادەیی دەناسرێتەوە و خۆی لە پەناوپێچی میتافیزیکا بە دووردەگرێت، تەنیا تێبینی دیاردەکان دەکات و بەراوردیان دەکات [٤١]. ئۆگۆست کۆنت بە گرنگترین لایەنگیری ئەو ڕێبازە دادەنرێت، چونکە جەوهەری سۆسیۆلۆجیاکەی دەوەستێتە سەر تێبینکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و هەردوو بیرۆکەی یاسای شاراوە و یاسای گریمانەکراوی دوورخستۆتەوە لە چوارچێوەی دوورخستنەوەی میتافیزیکا.

کارل پێرسۆن کە بەیەکێك لە لایەنگیرانی یاسای وەسفی دادەنرێت پێیوایە یاسا بەرهەمی هێزی دەرککردنی مرۆڤ و یادەوەرییەتی، ئەو هێرشدەکاتە سەر تیۆری شاراوە و گریمانەکراو کە پێیانوایە گەردوون (مەملەکەتی خودایە و لە لەوحەیەکەوە دەرچووە، یاساکانیشی سروشت بەڕێوەدەبەن، هەروەك

[٤٠]- محمد فرحات عمر، همان سەرچاوە، لا ١٥، لا ٧٨ و دواتر.
[٤١]- محمد فرحات عمر، همان سەرچاوە، لا ١٣٤ و دواتر.

چـۆن یاسـا مەدەنییـەکان کۆمـەڵگا و خـەڵك بەڕێوەدەبـەن[٤٢]. پێرسـۆن جیاوازی دەکات لـە نێوان یاسای مـەدەنی و یاسـای سروشـتی، یەکـەمیان مانـای فـەرمان و ئـەرکی لـە خۆگرتـووە، کەچـی یاسـای زانسـتی مانـای وەسـفکردنی لـە خۆگرتـووە نـەك ئاڕاسـتەکردن. یەکـەم بنـەما و فـەرمان لەخۆدەگرێت و فەرمانیش بیرۆکەی ئـەرك لـە خۆدەگرێـت و ئـەو مانایانـەیش هیچ بوونێکیان نییە لە چەمکی یاسای زانستی[٤٣].

یاسـا بـە گـوێرەی ئـەو ڕێبـازە گوزارشـتە لـە هەوڵـدانێك کـە مەبەسـت لێـی ڕێکخستنی شارەزاییە هەستەکییەکانمانە، بەشێوەیەك تێبینـی بـوونی لایـەن هاوشـێوەکان دەکـەین، لەوکاتـەی کـە جیاوازیـان پێوەدیـارە، ئەگـەر ئـەو هاوشێوەییە ببینین دەستدەکەین بە گشتاندنی وەك یاسایەك لـە یاسـاکانی سروشت.

## ٤. ڕێبازی یاسای زاراوەیی، یان کارڕایی (أجرائی)

ئەمـــە ئاڕاســـتەیەکی تازەیـــە و لـــە ســـەدەی بیســـتەمدا بڵاوبـــووەوە، ڕەزامەندییـەکی زۆر هـەبوو لەسـەری بـە تایبـەتی لـە لایـەن بانگەشـەکارانی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی، هەروەها لایەنگیرانی قوتابخانەی پراگماتیش[٤٤].

[٤٢]- محمد فرحات عمر، هەمان سەرچاوە، لا ١٣٥.

[٤٣]- محمد فرحات عمر، هەمان سەرچاوە، لا ١٣٨.

[٤٤]- ئەو ڕێبازە شتەکان بە گوێرەی سودمەندی بۆ مرۆڤ دەپێوێت، مەعریفەش ئامێرێکە یان ئەرکێکە لە خزمەتی پێداویستییەکانی مرۆڤ و ژیانە، ڕاستی پرسێك لەوەدایە کە چەند بە سودە، هەروەك باوەڕی بیەوە هەیە کە هزر لە خۆیدا مەبەستدارە.

ئەو ڕێبازە لەسەر بنەمایەك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە كە یاسا ناكرێت جێبەجێ بكرێت، بە مانای هەرگیز یەكنەبوونی یاسا لەگەڵ واقیعێكی دیاریكراوی دەرەكی، ئەو خەسڵەتەی یاسای لای لایەنگیرانی ئەم ئاڕاستەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە یاسا لای ئەوان پرسێك نییە بكرێت شیبكرێتەوە بۆ پرسێكی دیكە، ئەمە ئەو چەمكەیە كە پرسی دیكەی دەچێتە ژێربار، دەكرێت ئەو پرسانەش بە ڕاستی یان درۆ وەسفبكرێت، واتە دەكرێت بچوێنرێت بە جیهانی دەرەكی بۆ زانینی ڕاستییەكەی یان درۆیینەكەی، چونكە واقیعی ڕاستەوخۆن[٤٥].

یاسای سروشت چەند خەملاندنێكن واتە گشتاندنێكی ڕەها نییە، بەڵكو گوزارشتگەلێكی گشتین، گریمانەی ڕاستییان دەكەن لە چوارچێوەیەكی دیاریكراو لە شوێن و كاتدا، بەومانایەی كە یاسا تەنیا دارشتنێكی عەقڵییە و زانایان دایانناوە بۆ ئەوەی لە میانەیەوە لە دیاردەكان بڕوانن بە مەبەستی ملكەچكردنیان بۆ تێگەیشتنمان، هەروەها وەك كەرەستەیەكە ڕێگای توێژینەوەمان بۆ دیاری دەكات.

وایتهێد پێیوایە ڕوانین لە یاسا بەوەی كە گریمانەیەكی عەقڵییە بریتییە لە چەمكێكی شارستانی بۆ یاسا، چونكە لە تێڕامانێكی بونیادنەر و ڕوانگەیەكی تەموح و هزری ئازاد سەرچاوەی گرتووە بۆ ڕاڤەكردنی سروشت[٤٦].

---

٤٥- محمد فرحات عمر، همان سەرچاوە، لا ٢٠٨.

٤٦- محمد فرحات عمر، همان سەرچاوە، لا ٢٠٨.

گرنگترین سیفەتی ڕێبازی یاسا، ئەوەیە کە بیرۆکەی هۆکارگەرایی تێدەپەڕێنێت کە لەپێشودا خۆی سەپاندبوو، هۆکارگەرایی بە گوێرەی ڕاڤەکردنی یەکێك لە لایەنگیرانی ئەو ئاراستەیە کە جۆن دیویە تەنیا ئامرازێکە بۆ ڕێکخستن و گەڕاندنەوە، توێژینەوە لەبارەی بونەوەرێکی دەرەوەی ئەم بوونە ناکات. ئەو لە خۆیدا کارێك نییە لەم گەردوونە، هەموو ئەو حاڵەتانەی کە بە حاڵەتی هۆکارگەراییان دادەنێین لە ڕاستیدا کاروبارێکی پراکتیکین[٤٧].

هەروەها ئەو ڕێبازە بیرۆکەی حەتمییەتیش ڕەتدەکاتەوە کە ڕێبازی شاراوە پەیڕەو دەکرد، حەتمییەت لە ماتماتیك بوونی هەیە هەرچی لە زانستەکانی ترە ئەوا بوونی نییە، ئەگەر بوونیشی هەبێت ئەوا تەنیا بۆ پرەنسیپی ڕێکخستنی مرۆڤە هیچ بنەما و کاریگەرییەکیشی نییە لە جیهانی دەرەکی. ئەو ڕێبازە تازە لە ڕوانگەیەکی تازەوە مامەڵە لەگەڵ پرسی گشتاندن دەکات، بوانکارێ پێیوایە گشتاندن بۆچونێکی پوختی وەسفی لە خۆناگرێت، بەڵکو دەلالەتێکی ئیجرائی هەیە لە بواری توێژینەوەدا، ئەو ئامانجی دەستەبەرکردنی یەکێتییە لە زانستی مرۆیی نەك لە کایەی سروشت، بەمەش ئەرکی گشتاندن تەنیا تێگەیشتن نییە لە سروشت و واقیع بە هەموو درێژکراوە و ڕەهەندەکانی لەنێویشیاندا ڕابردوو، بەڵکو ئەرکی دەبێتە پێشبینیکردنی داهاتوش چونکە یاسا بایەخ بە ڕابردوو نادات.

---

٤٧- محمد فرحات عمر، هەمان سەرچاوە، لا ١٨.

لێرەوە بوانکاریێ بایەخێکی زۆریدا بە ئەزمون (واتە توێژینەوەکردنی دیاردەکان لە ئێستادا) و بە تاکە سەرچاوەی هەقیقەتی دانا، کە سەرچاوەی باوەڕە، تێبینیکردن و ئەزمون و گشتاندن و پێشبینیکردن بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەو پێیەی کە جومگەی سەرەکی زانستن، دەڵێت (واقیعەکان مادەی سەرەتایین سەبارەت بە زانست، وەك بەرد کە مادەی یەکەمی دروستکەری خانوە، بەڵام کۆمەڵێك واقیع زانست دروست ناکەن، هەروەك چۆنیش کۆمەڵێك بەرد خانو دروست ناکەن. ئەزمون شتێکی تری فێرکردین جیاواز لە واقیعی تاکی، شتێك کە ڕێگا بە گشتاندن و پێشبینیکردن دەدات.

دەرککردن بە شتێك پێش ڕوودانی یان پێشبینیکردنی شتێك پێشی ڕوودانی مەحاڵە بێ گشتاندن. چونکە تاکە شتێك کە دەکرێت جەختی لەسەر بکەینەوە ئەوەیە کە بارودۆخی گونجاو واقیعی گونجاویش دروستدەکات، بۆیە بۆ ئە .ەی پێشبینی بکەین دەبێت ئەو گونجانە بڕەخسێنین(٤٨).

یاسا بەگوێرەی ڕێبازی ئیجرائی شێوەیەکە لە گریمانەکردنی ڕێکەوتنخوازی چونکە کۆکردنەوەی تێبینییەکان دەمانگەیەنێت بە گشتاندنێکی گریمانەکراو کە پێشبینی واقیعگەلێکی هاوشێوە دەکات.

بەشێوەیەکی گشتیش یاسا زانستییەکان لە تێگەیشتنە گشتییەکەی بە چەندین خەسڵەت جیادەکرێتەوە گرنگترینیشیان: ئەوەیە کە ڕێژەییە واتە گوزارشتە لە ڕەفتارێکی دیار لە ژێر هەلومەرجێکی دیاریکراودا. هەروەك

٤٨- محمد فرحات عمر، همان سەرچاوە، لا ٢١١.

سنوردارە بە کات و شوێن، چونکە هەر گۆڕانێك کەبەسەر دیاردەیەك ڕوودەدات دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەنجام، بەمپێیەش یاسا دەگۆڕێت، هەروەها شایانی هەموارکردنە. ئەم خەسڵەتەش دەکەوێتە سەر خەسڵەتی پێشوو، گۆڕانی کات و شوێن مەعریفەی هەبوو دەگۆڕێت و ئەمەش وادەکات یاساکان پەرەبسەنن و هەموارین بۆ ئەوەی لەگەڵ شتە تازەکان بگونجێن، ئەو خەسڵەتەش پەیوەستە بە زانست کە بە کەڵەکەبوونی مەعریفە و پەرەسەندنی میتۆدەکانی زانست پەرەدەستێنن، چونکە بەردەوام هەقیقەت شتێکی ڕێژەییە. برتراند راسڵ ئەو مانایە بە وردی باسدەکات و دەڵێت: زانستی ورد بیرۆکەی نزیککردنەوە بەسەریدا زاڵە، ئەگەر کەسێك پێت بڵێت هەقیقەتێك دەزانێت دەبارەی شتێك ئەوا بڕوات هەبێت ئەو پیاوێکی ورد نییە، هیچ مرۆڤێکی زانستی نابینییەوە لە ڕۆحیدا ئەوە هەبێت کە باوەڕەکانی ئێستای زانست ڕاستن، بەڵکو جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە ئەمە قۆناغێکە لەسەر ڕێگای ڕاستی تەواو[٤٩].

لەمەی پێشوودا بەوە دەگەین کە زانست یاساکانی هۆکارگەرایی و یاساکانی حەتمییەتی تێپەڕاندووە بۆ یاسای ئەرکگەری، ڕەخنە لە ئەوەی یەکەمیان گیراوە بەوەی کە قۆناغی یەکەمە لە پەرەسەندنی عەقڵی مرۆیی، هەروەك پەیڕەوکردنی لە توێژینەوەکردنی زانستی ڕەنگە توێژەر بخاتە نێو هەڵە، یاخود بەرەو لایەنگیری و نابەتیبونی ببات، ئەمە پەیڕەوکردنی ڕێگایەکی ئاسانە بە گەڕاندنەوەی دیاردە بۆ خودی یەك هۆکار، کەچی لە واقیعدا

---

[٤٩]- برتراند راسل، النظرة العلمية، ترجمة عثمان نوبة، القاهرة، ١٩٥٦، ل ٥٣.

چەندین فاکتەر، یاخود هۆکار هەن کە تێکچڕژاون و بەشدارن لە پێکهێنانی دیاردەیەك، بۆیە نابێت بڵێین کە یەك فاکتەر هۆکاری ڕوودانی دیاردەیەکە.

برتراند راسڵ پێیوایە یاسای هۆکارگەرایی، واتە ئەو یاسایەی کە گوزارشتە لە پەیوەندییەکی جێگیر لە نێوان دوو دیاردە کە گۆڕان لە یەکێکیانەوە دەبێتە هۆی گۆڕان لەویتریان، شایانی ئەوە نییە پێی بگوترێت یاسا، ئۆگۆست کۆنتیش لەسەر هەمان ئاڕاستەبوو کە پێیوایە زانستی پۆزەتیڤیزم دیاردە و پەیوەندییەکان دەخاتە بەر تێبینیکردن، هەرچی ئاشکراکردنی هۆکارەکانە بە پاشماوەی قۆناغەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی و میتافیزیکی دادەنرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا مانای ئەوە نییە کە تەبەنیکردنی یاسای ئەرکگەری، یاخود یاسای ڕێبازی ئیجرائی گریمانەیی بریتییە لە لە نێوبردنی یاسا هۆکارگەراییەکان، بەڵکو بریتییە لە دووبارە چاوپێخشاندنەوە و پەرەپێدانی مانای هۆکار بۆ ئەوەی لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و میتۆدەکانی توێژینەوە بەرەو پێش بچێت. هۆکارگەرایی چیتر مانای پێویستی و حەتمییەت نییە، هەروەها لەگەڵ مانای یاسای شاراوە ناگونجێت، بەڵکو مانای بەدوایەکداهاتنە، یاخود بەپێی بۆچوونی برتراند راسڵ (هۆکار کۆمەڵێك ڕووداوی بەدوایەکداهاتوون)، هۆکاری گریمانەیی بوونی بیرۆکەی هێز و پابەندی ناکەن کە هۆکار و هۆکار دروستکار بە یەکەوە ببەستێتەوە، کە دەکەوێتە نێو قوڵایی پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام، ئەو پێناسەیەش لەگەڵ

پێناسەکەی جۆن ستیوارت میل دەگونجێت کە دەڵێت هۆکار کۆمەڵێك مەرجی تەواوی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانە، لەگەڵ هەموو بارودۆخێك کە دەستەبەر بوو، بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجامێکی لێ دێتە ئاراوە.

ب)یاسا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا

بە هۆی جیاوازی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە دیاردە سروشتییەکان، بەهۆی ئاڵۆزی ئەوەی یەکەمی و تێکەڵبوون و دژواری پێشبینیکردنی ئاراستەکەی، هەندێك گومانیان هەبوو لە توانای دانانی یاسای کۆمەڵایەتی، یاخود پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگادا. کەچی ئاراستەی باوی ئەمڕۆ هەڵوێستێکی جیاوازی هەیە لە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لەسەر توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا، باوەڕی بە ئەگەری دانانی یاسای کۆمەڵایەتی هەیە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی رێژەیی ئەو یاسایانە لە کات و شوێن و مۆرکە گریمانەیی و ئەگەرییەکەی.

یاسا کۆمەڵایەتییەکان بە پایەیەکی سەرەکی دادەنرێن لە پایەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی. توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەرەو پێشدەچێت هەرچەندە ئەو یاسایانە بدۆزرێنەوە کە کۆنترۆڵی دەکەن و کاریگەرییان لەسەر پەرەسەندنی هەیە. سەرەڕای جیاوازی کۆمەڵگای مرۆیی لە جیاوازی پێکهاتە و دژپێکی و ئەو ململانێیەی کە تیایدا هەیە، لە پاڵ ئەو پەرەسەندنەی کە هەموو کوچەکانی گرتۆتەوە، مەحکومە بە بوونی

چەند یاسایەکی گشتی کە بەهۆیانەوە دەکرێت لە کۆمەڵگا تێبگەین و دواتریش ڕاڤەی بکەین.

ویستی مرۆیی پێگەیەکی جیاوازی داگیرکردووە لە نێو گفتوگۆکان لە بارەی تایبەتمەندی یاسای کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەك سروشتی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتییەی کە تەوەرەکەی مرۆڤە ڕێگای داوە بە دداننان بە ڕۆڵی ویستی مرۆیی لە دارشتن و هەمووارکردنی یاسای کۆمەڵایەتی، ئینجا چ ویستێکی هۆشیار، یان ناهۆشیار بێت. هەروەها یاسا کۆمەڵایەتییەکان لە یاسا سروشتییەکان جیاوازن بەوەی کە ئەمەی دوایی بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئازادترە لە ژێر کاریگەری کات و شوێن، بەمەش دەکرێت گشتاندنی بۆ بکرێت، هەرچی یەکەمە سنووردارە بە کات و شوێن، بە مانایەکی دیکە ئەگەر دروست بێت بڵێین یاسا سروشتییەکان خەسڵەتێکی جیهانیان هەیە، یاسا کۆمەڵایەتییەکان خەسڵەتێکی تایبەتیان هەیە، بەمپێیەش ناکرێت هەناردە یان هاوردە بکرێت، بە هۆی بانگەشەی جیهانیبوونی زانست و یاسا زانستییەکان، هەروەها خەسڵەتی بابەتیبوون لە یاسا کۆمەڵایەتییەکان جێگای گومانە، یاخود کەمتر جێگیرە لە بابەتیبونی یاسا سروشتییەکان، لە کۆتاییشدا ئەگەر بەژمارەکردن، یاخود پێوەری چەندێتی بە یەکێك لە خەسڵەتەکانی یاسا سروشتییەکان دابنرێت دژوارە یاسا کۆمەڵایەتییەکان بخرێتە ژێر باری پێوانی چەندێتی بەبێ سنور[٥٠].

---

[٥٠]- ئەوکاتەی باس لە سنورەکانی میتۆدی زانستی دەکەین لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا، ئەوا بە بەرفروانی هەڵوەستە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین.

چاکەی ئەمەش بۆ مۆنتیسکۆ (١٦٨٩_١٧٥٥) دەگەڕێتەوە، بەوەی کە بیرۆکەی یاسای خستۆتە نێو بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لە کتێبی (ڕۆحی یاساکان) (١٧٤٨)دا دەنوسێت (یاسا بە مانای فراوانی وشەکە پەیوەندیگەلێکی پێوستن کە لە سروشتی شتەکان دروست دەبن، بەم مانایەش هەموو شتێکی هەبوو یاسای تایبەتی خۆی هەیە... ئەو پێناسەیەش جەخت لەسەر بابەتیبونی یاساکان دەکاتەوە). مۆنتیسکۆ پێیوایە مێژووی هەر گەلێك هیچ نییە جگە لە حەتمییەتی یاسا کۆمەڵایەتییەکانی نەبێت. یاساکانیش لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە جیاوازن، بەشێوەیەك فاکتەرە سروشتییەکان لەمەدا ڕۆڵ دەبینن وەك ئاو و هەوا و خاك، لەگەڵ فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی وەك نەریت و چڕی دانیشتوان و ئایینەکان، فاکتەرە سیاسەییەکانی وەك سیستەمی فەرمانڕەوایی، هەموو ئەوانە یاسا پێکدەهێنن و هەمواری دەکەن، لێرەوە مۆنتیسکۆ هۆشیار بوو بەوەی کە چۆن (فرەیی کولتووری) مرۆیی دەبێتە هۆی فرەیی یاساکان، بەشێوەیەك دژوار دەبێت یاساگەلێکی کۆمەڵایەتی دابنرێت کە بکرێت بەسەر سەرجەم کۆمەڵگاکاندا پراکتیزە بکرێن[٥١].

[٥١]- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١.

# باسی دووەم
# تیۆر و تیۆردانان لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتییدا

## أ) پێناسەکردنی تیۆری زانستی

پرۆسەی تیۆردانان بە پایەی سەرەکی زانستی مۆدێرن و یەکەی سەرەکی سیستەمی بیرکردنەوەی زانستی دادەنرێت، هیچ زانستێك بێ تیۆری زانستی بوونی نییە ، مەعریفەی ئەزموونی، یاخود مەیدانی سروش لە تیۆرە زانستییەکان وەردەگرێت، هەروەها ئەنجامەکانی دەکرێت بۆ تیۆری زانستی بگۆڕدرێت.

پێناسەکانی چەمکی تیۆر زۆرن ، هەندێکیان جیاوازی دەکەن لە نێوان بەکارهێنانی باو بۆ چەمکی تیۆر کە مانای شتی تیۆری و تێرامانییە، لەسەر وێناگەلێك دروستبووە لەگەڵ مانای مۆدێرنی زانست بۆ تیۆر کە لایەنی تیۆری و واقیعی ئەزموونی بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

تیۆری دابڕاو لە واقیع هیچ نییە جگە لە فەلسەفەیەك نەبێت، یاخود کۆمەڵێك وتە و پەیوەندی و کارلێکیان نییە لەگەڵ واقیعدا، هەرچی تیۆری زانستییە پەیوەندییەکی دیالێکتیکی هەیە لەگەڵ واقیعدا، بەهۆیەوە پەرەدەستێنێت و پەرەش بەو دەدات، بەمەش واقیع دەبێتە پارسەنگی زانستی بۆ جەختکردنەوە لەسەر ڕاستی و زانستیبوونی.

پێناسەی تیۆر هەڵگری بەدگومانییە، بەشێوەیەك پێناسە زانستییەکان بۆ تیۆر تێکەڵ بە یەکتر دەبن لەگەڵ چەمکی باو لای عامەی خەڵك، مێلڤن ئەو ئیشکالییەتەی باسکردووە و دەڵێت (یەکەم: چەمکی تیۆر بەشێوەیەکی گشتی بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەدان بە لایەنی پەیوەست بە شارەزایی واقیعی، هەروەها دووەم: بەکاردەهێنرێت بە مانای هەموو پرەنسیپێکی گشتی ڕاڤەکاری، وەك باوە ئەم جۆرە تیۆرانە لە پرسێك پێکدێن کە پەیوەندی ئەرکگەری لە نێوان گۆڕاوەکانیدا هەیە، ئەوکاتەی چەمکەکان لە واقیع نزیکدەبن بە چەمکی یاسا دەڵێن پرەنسیپە گشتییەکە، بەڵام ئەوکاتەی ئەبستراکت دەبێت زۆربەی جار چەمکی تیۆری بۆ بەکاردەهێنرێت.

سێیەم، تیۆر بریتییە لە کۆمەڵێك یاسای بە یەکەوە گونجاو، ئەمەش بۆتە بەکارهێنانی نموونەیی، چونکە ئەو وتەیە لەگەڵ ئەو زانستانە دەگونجێت کە هەنگاوێکی زۆر پێشکەوتویان بڕیوە، هەروەها پەیوەستە بە چەمکی سیستەم کە ڕێکخستنێکی دیاریکراو لە خۆدەگرن بۆ پرسە تیۆرییەکان، چوارەم و کۆتاییش بەکارهێنانێکی بەرتەسکی هەیە بۆ ئاماژەدان بە گوزارشتی پوختکراو، کە وێنەی کۆمەڵێك یاسا وەردەگرێت لە دەرەنجامی توێژینەوەی ئەزموونگەری پێی گەیشتوون[٥٢].

چەندین پێناسە بۆ تیۆر کراوە، بۆ نموونە تیۆر (بونیادێکی وێناکردنە و هزر دروستی دەکات بۆ ئەوەی پرەنسیپ و دەرەنجامە دیاریکراوەکان بە یەکەوە

---

[52]- Ross, A. Theory and method in the social science Minnesote, the university press, 1954 p 95.

بەستێتەوە)، هەروەها تیۆر (چوارچێوەیەکی هزرییە و کۆمەڵێك فاکتی زانستی ڕاڤە دەکات، دەیخاتە نێو سیستەمێکی زانستی بەیەکەوە بەستراو)، تیۆر (ڕاڤەکردنە بۆ دیاردەیەکی دیاریکراو لە میانەی سیستەمێکی هەڵهێنجاندنیە)، تیۆر کۆمەڵێك پرسە کە بەشێوەیەکی ڕێکخراو و زانستی بە یەکەوە بەستراون، کار دەکەن بۆ دیاریکردنی پەیوەندی هۆکارگەرایی لە نێوان گۆڕاوەکان). لە کۆتاییشدا تیۆر پێناسە دەکرێت بەوەی کە (گوزارشتە لە کۆمەڵێکی بە یەکەوە بەستراوی چەمك و پێناسە و پرسەکان، ڕوانگەیەکی ڕێکخراون بۆ دیاردەکان لە ڕێگای دیارکردنی پەیوەندییەکانی نێوان گۆڕاوەکان بە ئامانجی ڕاڤەکردن و پێشبینیکردنی دیاردەکان).

هەرچی ئارنۆڵد ڕۆسە لە کتێبی (تیۆر و میتۆد لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا) پێناسەی تیۆر دەکات و دەڵێت (بونیادێکی تەواوە، چەندین پێناسە، گریمانە و پرسی گشتی لە خۆدەگرێت کە پەیوەستە بە دیاردەیەکی دیاریکراو، دەکرێت بە شێوەیەکی لۆژیکی کۆمەڵێك گریمانەی لێ بەرهەمبێت کە دەکرێت ئەزموون بکرێت)[٥٣].

هانز ڕێتەربێرگ لەگەڵ ڕۆس کۆکە لەسەر هەنگاوە بەرفراوانەکانی ئەو پێناسەیە، بەشێوەیەك پێیانوایە توخمە پێکهێنەرەکانی تیۆر ئەمانەن:

---

٥٣- پرسەکان، پرۆسەی شیکردنەوی عەقلی یان هزرییە، یاخود بە گوزارشتێکی وردتر پرۆسەی بەلگەهێنانەوە، هەروەها دەکرێت پرسێك دابەش بکرێتە سەر یەکەیەك کە لۆژیککزانەکان پێی دەڵێت تێرم، پرس بە گوێرەی لۆژیککزانەکان وتەیەکی بەسودە و ڕەنگە ڕاست یان درۆ بێت، یاخود کۆمەڵێك دەستەواژەیە تیایدا حوکم بوونی هەیە، ئەمەی دوایش بۆ پرس سوودی هەیە کە ڕەنگە درۆ یان ڕاست بێت.

١. چەمكە سەرەتاییەكان یاخود سەرەكییەكان، ئەوانەش كۆمەڵێك پێناسەن لە ڕێگای كۆمەڵێك نموونە پێشكەشیان دەكەین كە ماناكەی دەردەخەین.

٢. چەمكە وەرگیراوەكان: چەند چەمكێكن، لە ژێر ڕۆشنایی چەمكە سەرەكییەكان دیارییان دەكەین.

٣. گریمانەكان: ئەوانەش چەند پرسێكن پەیوەندی نێوان ئەو چەمكانە دیاری دەكەن كە دەستنیشانكراون.

٤. بەڵگەنەویستە تیۆرەكان: ئەوانەش كۆمەڵێك گریمانەی بە یەكەوە گونجاون لەگەڵ یەكتردا، دەكرێت پرسەكانی دیكەیان لێ وەربگیرێت.

كەواتە تیۆر ئەو چوارچێوە وێناكردنەیە كە توانای ڕاڤەكردنی جیهانی شارەزایی واقیعییە هەیە، واتە دیاردە و پەیوەندییەكان ڕاڤە دەكا بە ئامانجی توێژینەوەی هۆكار و پێشبینیكردنیشیان، یاخود وەك تیماشیف دەڵێت تیۆر كۆمەڵێك پرسە[٥٤] كە دەبێت ئەو مەرجانەی تێیدا هەبێت:

یەكەم: دەبێت ئەو پرسانەی كە باسی دەكات گوزارشت بێت لە چەند پرسێكی دیاریكراو و ورد.

دووەم: دەبێت پرسێك لە پرسێكی دیكە وەربگیرێت.

سێیەم: لەسەر شێوەیەك دابنرێت كە دەكرێت گشتاندنگەلێكی لێ بەرهەم بێت بەشێوەی هەڵهێنجاندن.

[٥٤]- نیقولا تیماشیف، نظریة علم الاجتماع، ترجمة محمد عودة و اخرون القاهرة، ١٩٧٨، ل ٣٧.

چوارەم: دەبێت ئەو پرسانە بەپیت و بەرهەمدار بن بۆ ئەوەی ڕێگایەك بدۆزرێتەوە بۆ تێبینیکردن کە دوورتر و گشتیتر بێت لە بواری مەعریفەدا[٥٥].

تیۆری زانستی یارمەتیدەرە لە تێگەیشتنی واقیع، لەگەڵ ئەوەشدا زانای کۆمەڵناسی رۆبێرت میرتۆن رەخنەی لە تێکەڵبوونی ڕاڤەکردنی دیاردەی کۆمەڵایەتی لە لایەك و تیۆری سۆسیۆلۆجی لە لایەکی دیکە گرتووە، بە شێوەیەك پێیوایە دەبێت تیۆر لە پێش ڕاڤەکردن بێت و ئاراستەی بکات[٥٦].

هەروەك لە کاتی باسکردنی یاساکاندا ئاماژەی بۆ کراوە کە تیۆرە زانستییەکان چیتر ئەو وتە، یاخود پرسانە نین کە ڕاستی ڕەها، یاخود باوەڕی دڵنیایان هەبێت، بەڵکو ئەوانە چەند وتەیەکی ڕێژەین، گشتاندن دروست دەکەن، تیۆرەکان دانانرێت لە پێناو گەیشتن بە باوەڕ، بەڵکو هەوڵدەدات بگات بە مەعریفەی ڕێژەیی کاتی، لێرەوە هەندێکجار وەك گریمانە مامەڵە لەگەڵ تیۆر دەکرێت، چونکە دڵنیایی کەمترە لە یاساکان.

پێشکەوتنی زانست نەبۆتە هۆی زیاتربوونی باوەڕ بە مەعریفەی زانستی، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆتە هۆی وروژاندنی گومان لە بارەی دڵنیایی و باوەڕ بە مەعریفەی زانستی، ئەمەش بە ڕۆڵی خۆی کاریگەری هەبوو لەسەر تیۆری زانستی، چەمکی تیۆر کە بە باو دادەنرێت بەوپێیەی کە سیستەمێك لە

---

٥٥- هانز موس، الفكر الاجتماعي، نظرة تاريخية عالمية، ترجمة السيد الحسيني و جهينة سلطان، القاهرة ١٩٨٠، لا ٢٣٠.

56- Sullivan J. the Limiations of science Mentrorbooks New York, 1949, P 158.

یاسای دڵنیا، لەژێر هەڕەشەی لە دەستدانی مانایەتی، لەم نێوكۆیەدا چەندین زانا گوزراشتیان لە گومانی خۆیان كردوە لە بارەی باوەڕ بە تیۆرە زانستییەكان، ئۆگۆست كۆنت دەڵێت (مانا ڕەهاكان پێدەچێت مەحاڵ نەبێت تا ئەو پلەی كە سەرەڕای بەڵگە ڕاستەكانی نیو تیۆری ڕاكێشان، من هێشتا ناتوانم مانەوەی گرانتی بكەم). لە هەمان چوارچێوەدا سۆلیڤان لە كتێبی (سنوری زانست)دا دەڵێت[٥٧] (تیۆری زانستی ڕاست هیچ نییە جگە لە گریمانەیەكی گشتی ڕاست نەبێت، ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە كە هەموو تیۆرە زانستییەكان هەڵە بن).

هەرچی كارل پۆپەرە، گریمانەبوونی زانست و ڕێژەیی تیۆری بە یەكەوە بەستاوەتەوە و تیۆر و زانستی لە یەكتر جیاكردۆتەوە لە ئاین و باوەڕ، ئەمەی دوایی خەسڵەتی ڕەها و باوەڕداری هەیە و گفتوگۆ، یاخود دووبارە تێڕوانین هەڵناگرێت، هەرچی كلۆد بێرناردە، وەسفی چەمكی تیۆری كردووە بەوەی كە تەنیا پلەن و لەگەڵیدا هەست بە ئارامی دەكەن تاوەكو لە توێژینەوەكامان بەرەو پێشەوە بچین، ئەو گوزارشتە لە دۆخی هەنوكەیی مەعریفەی ئێمە، بۆیە نابێت باوەڕی پێ بكەین وەك بیروباوەڕی ئایینی، دەبێت بە گوێرەی پێشكەوتنی زانست هەموار بكرێت[٥٨].

كەواتە تیۆری زانستی و تیۆری ڕێژەیی دەكرێت هەموار بكرێت و بگۆڕێت بە پەرەسەندنی دۆزینەوە زانستییەكان و ژیانی كۆمەڵایەتی و مەعریفەی

---

[٥٧]- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، ٤٥_٥٦.

[٥٨]- محمد سبیلا، حوارات في الفكر المعاصر، الرباط: ١٩٩١، لا ٧٢.

مرۆیی، مادام عەقڵی مرۆیی لە حاڵەتی پەرەسەندندایە، بۆیە ناکرێت بە تیۆرگەلێك سنووردار بکرێت کە سەردەم و مەعریفەی تازە تێیپەڕاندووە. هەر چ پێشکەوتنێکی زانستی لە کایەیەك لە کایەکان دەبێتە هۆی دووبارە چاوپێشاندنەوەی تیۆرەکان لە هەمان کایەدا، هەروەك شکستهێنانی تیۆر لە جێگیرکردنی هەقیقەت، یاخود دەرکەوتنی هەقیقەتی دیکە کە دژێکە لەگەڵیدا لە میانەی بەریەککەوتن لەگەڵ واقیع پێویستە شوێنی خۆی بۆ تیۆری دیکە چۆڵ بکات کە بە تواناتر بێت لە جێگیرکردنی هەقیقەت و مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع. ململانێ لە نێوان تیۆرەکان لە سەرجەم بوارەکاندا سیمایەکە لە سیماکانی پەرەسەندنی مەعریفی و مەرجێکە بۆ پەرەسەندنی مەعریفەکانی مرۆڤایەتی، چونکە پرەنسیپی مانەوە بۆ بەهێزترین و گونجاوترین ناوبژیوانە لەم بوارەدا.

دانانی تیۆر لەسەر پارسەنگی کردەیی و توانای لە تەحەداکردن و وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانی واقیع، مەرجی سەرەکییە لە مەرجەکانی تیۆری زانستی، تیۆر ئەو خەسڵەتە بە گرنگ دانانێت تەنیا لەپێناو گونجان و هارمۆنییەتی لۆژیکی لە نێو ئارگیۆمێنتەکان و داتاکان، بەڵکو ئەمە دەچێتە ئاستی توێژینەوەی زانستی کە بەرهەمی تاقیکردنەوەی بەڵگە و گریمانەکانە، بەشێوەیەك پشت بە ئەزموون و پێوانەکردن و چەندان پرسی دیکەی توێژینەوەی زانستی دەبەستێت. ئەمەش بوو لە لایەن کارل پۆپەر جەختی لەسەرکرایەوە لە زیاتر لە شوێنێکی نووسینەکانی، بەشێوەیەك پێیوایە تیۆری زانستی بریتییە لە تیۆرێك کە دەکرێت ئەزموون بکرێت (واتە دەتوانین

بەدرۆی بخەینەوە، ئەو هەوڵانە لێهاتوون بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بەڵگە بهێنرێتەوە، نەك لەسەر ئەوەی کە تیۆر ڕاستە، (کە ئەمە مەحاڵە) بەڵکو بە ڕاستی توخمێك لە هەقیقەت لە خۆدەگرێت)[٥٩].

## ب)تیۆری کۆمەلایەتی

دەرکەوتنی تیۆری کۆمەلایەتی بە بەراورد بە سەرهەڵدانی تیۆر لە زانستە سروشتییەکاندا دوواتر کەوتووە ، دەکرێت سەدەی ١٨ بە سەرەتای سەرهەڵدانی هەوڵێکی سەرەتایی دابنرێت بۆ سەرهەڵدانی تیۆری کۆمەلایەتی لەسەر دەستی کۆمەڵێك بیرمەند، کە هەوڵیاندا کۆمەڵگا بە شێوەیەکی میتۆدی عەقلانی توێژینەوە بکرێت بە سروش وەرگرتن لە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی، بەلام ئەو بوارەی کە لەسەرەتادا بۆ یەکەمجار تیۆری تێدا بەدەرکەوت بریتییە لە توێژینەوە فەلسەفی، ڕووە سیاسییەکانی پەیوەست بە تیۆری دەوڵەت لە ڕووی بنەچەی سەرهەڵدانی، لەگەڵ ئەو شێوانەی کە لە میانەی پەرەسەندنی سەرهەڵدەدەن.

---

[٥٩]- لە کتێبی (بزاوتی کۆمەلایەتی)، سۆرۆکین، تیۆری کۆمەلایەتی بە مانا تەسکەکەی دەخاتەڕوو، واتە لە چەند پرسێکی گشتی دەست پێدەکات و پرسی تری لێ بەدەست دەهێنێت کە دەکرێت لە راستییەکەیان دلنیابینەوە:

١. هەموو کۆمەڵگایەك لقی لێ دەبێتەوە و ئەو لق لێبونەوەشە بەهۆی دابەشکردنی کارە.

٢. ئەو لق لێ بونەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بەردەوام دەبێت بەهۆی چەندین میکانزیمەوە.

٣. لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا دوو فاکتەی سەرەکی بۆ بەردەوامبوونی ئەو دیاردەیە سەرەوە هەیە، ئەوانیش خێزان و قوتابخانەن.

٤. ئەگەر ئەو دوو دامەزراوەیە بە ئەرکی خۆیان هەلنەستن بە باشترین شێوەیە ئەوا چەندین چاوەڕوانی کۆمەلایەتی لای گەنجەکان دروست دەبێت کە کۆمەڵگا خۆی بە بێتوانا دەبینێتەوە لە تێرکردنیان.

تیــۆری کۆمەڵایــەتی ئیشــکالییەتێکی زۆر دروســت دەکــات لــە ڕووی پێناســەکردن، یــاخود لــە ڕووی مــەودای گونجــانی لەگــەڵ واقیــع، چــونکە کەلێنیکی گەورە هەیە لە نێوان واقیعی بەرهەست و مەعریفەی عەقڵی لە زانســتە کۆمەڵایەتییەکانــدا، ئەگەرچــی تیــۆری کۆمەڵایــەتی لەگــەڵ چــەند تیۆریکی زانستی دەگونجێت لـە ڕووی بونیـاد و ئەرکەوە لـە زانسـت، بـەڵام جیاوازە لێی لـە ڕووی نـاوەڕۆکی جیـاوازی ژیـانی کۆمەڵایـەتی لەگـەڵ بـوارە سروشتییەکەی.

چەندین نووسەر ئاماژەیان بۆ ئەو ناڕوونییە کردووە کـە تیـۆری کۆمەڵایـەتی دروستی دەکات، دەبینین میرتۆن لە کتێبی (تیـۆری کۆمەڵایـەتی و بونیـادی کۆمەڵایەتیدا) دەڵێت: (زانای کۆمەڵناسی مەیلی هەیە بۆ بەکارهێنانی وشــەی تیۆر وەك هاومانای ئەو وشانە:

١. بەسیستەمکردن
٢. هزرەکان
٣. شیکردنەوەی چەمکەکان
٤. ڕاڤەکردنی داهاتوو
٥. گشتاندنی ئەزموونیەکان
٦. وەرگــرتن (دروســتکردنی دەرەنجــام کــە بەرهــەمی پێشــبینیگەلێکە کــە لەپێشــودا باســکراوە) و وردبینیکــردن (توێژینــەوە بــە هــۆی دەرەنجــامی

پێشبینی گشتی کە ڕێگا بە گەیشتن بە دەرەنجامی گریمانەی تایبەت دەدات کە لەپێشودا ئاماژەی بۆ کراوە)

٧. تیۆر (بە مانای بەرتەسکی وشەکە)

فەرهەنگی ڕەخنەیی کۆمەڵناسی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تیۆری کۆمەڵایەتی، ئەگەر ماناکەی بە تیۆری ئاماژە بۆکراو سنووردار نەکرێت، بەم ڕادە ناڕوونییە نییە کە میرتۆن ئاماژەی بۆ کردووە.

دانەری فەرهەنگەکە دەڵێت چەمکی تیۆر لە کۆمەڵناسی دوو شێوە وەردەگرێت: (یەکەم: مانای تەسکی وشەی تیۆر[٦٠]، دووەمیش نموونەیە، کە (کۆمەڵێك پێشنیار، یاخود حوکمی میتاتیۆرییە کە پەیوەستە بەو زمانەی کە پێویستە بە کاربهێنرێت بۆ چارەسەکردنی هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان، زیاتر لەوەی کە پەیوەستە بێت بە هەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی[٦١].

چەمکی مۆدێل یان میتۆدی تیۆری، یاخود ئاڕاستەی تیۆری لە کۆمەڵناسی باوبوو لە جیاتی چەمکی نموونە کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە، بەمشێوەیە میتۆدە تیۆرییەکان جۆراوجۆر دەبن بە جیاوازی کۆمەڵگا و نووسەر و ئایدیۆلۆجیا و بەرژەوەندییەکان، بەشێوەیەك ئایدیۆلۆجیاکان ڕۆڵێکی مەترسیدار دەگێڕن لە داڕشتنی تیۆرێکی کۆمەڵایەتی، ئەوەی جێگای تێبینییە تیۆری کۆمەڵایەتی خۆرئاوا بێ لایەن نییە، بەڵکو مۆرکێکی

---

٦٠- بودون و ديوريكو، المعجم النقدي لعلم الاجتماع، بيروت، ١٩٨٦.

٦١- لویس کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

ئایدۆلۆجی مەزنی هەیە، ئەو کێشەیەی کە ڕووبەڕوی بونیادی تیۆری کۆمەڵایەتی دەبێتەوە دەکرێت ڕاڤە بکرێت و قبوڵ بکرێت کە ئەمەش کێشەیەکی ئایدیۆلۆجییە زیاتر لەوەی زانستی بێت[٦٢].

نموونە، یاخود میتۆدە تیۆرییەکان بۆ چەندین بەش دابەش دەبن، فەرهەنگی ڕەخنەیی کۆمەڵناسی بۆ ٣ بەشی دابەشدەکات، ئەوانیش:

١. نموونەی دەرککردن، یاخود پۆلێنکاری.
٢. نموونەی پێوەری.
٣. نموونەی شێوەیی (شیکردنەوەی ئەرکگەری یەکێکە لەم نموونانە)، بەڵام ئەوانەی بایەخ بە تیۆری کۆمەڵایەتی دەدەن، پابەند نابن بەم پۆلێنکردنە و هەندێکیان تیۆرێك، یاخود نموونەیەکی پێ باشترە لە یەکێکی دیکە، ماکس ڤیبەر تایپ ئایدیالی پێ باشە، هەندێکی دیکە وەك ولیام جێمس و جۆن دیوی کارلێکی ڕەمزی بە باشتر دەزانن، توێژێکی دیکەیان بونیادی ئەرکگەریان پێ باشترە، هەندێکی دیکە ئاڕاستەی ڕەفتاری، هەندێکی دیکە هەن قوتابخانەی ململانێیان پێ باشە لە پێشڕەوەکانی والتەر بارگۆت و راتزنهۆڤەر، لە پاڵ هەڵوەشانەوەگەرایی لای دریدا...هتد.

چاودێرانی نووسین لە بواری کۆمەڵایەتی تێبینی ئەوە دەکەن کە زۆربەیان بە تایبەتی ئەوانەی هەڵگری ناونیشانی تیۆری کۆمەڵایەتین[٦٣] کەمێکیان

---

٦٢- لەوانەش بڕوانە: النظريات السوسيولوجية المعاصرة، سوروكين ١٩٢٨، النظرية الاجتماعية و البناء الاجتماعي ١٩٥١ نيقولا تيماشيف، نظرية علم الاجتماع، لة كتێبة عةرةبيیةكانيش، بروانة: النظرية الاجتماعية المعاصرة، سمير نعيم احمد، النظرية في علم الاجتماع.

نەبێت کە ئاماژە بۆ تیۆر دەکەن بە مانا بەرتەسکەکەی، ئەوانی دیکە باس لە هەموو ئەو شتانە دەکەن کە دەچێتە ناو چوارچێوەی تیۆردانانی کۆمەڵایەتی، واتە هەموو شیکردنەوە و ڕاڤەکردنەکان لە بارەی دیاردەی کۆمەڵایەتی کە لە لایەن پسپۆڕ و تایبەتمەندەکان هاتۆتە ئاراوە، بێ ئەوەی سەرچاوەکەی توێژینەوەی مەیدانی ئەزموونی بێت، بەم مانایەش تیۆری کۆمەڵایەتی جیا دەبێتەوە لە بەرامبەر توێژینەوەی مەیدانی ئەزموونی. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان تیۆری کۆمەڵایەتی و توێژینەوەی مەیدانی، هەردووکیان تەواوکەری یەکترن، توێژەرێکی مەیدانی ناتوانێت لە بۆشایی دەست پێبکات، بەڵکو زۆربەی جار تیۆر وەك ڕێبەرێك وەردەگرێت، هەزرە کۆمەڵایەتییەکان ڕێگای ڕۆشن دەکەنەوە، هەروەك ئەنجامەکانی توێژەر لە زانستێك لە زانستەکان پێویستی بە تیۆرێك هەیە ئاڕاستەی بکات لە کاتی کۆکردنەوەی واقیعە پەیوەستەکان بەو دیاردەیەی کە دەیەوێت توێژینەوەی بکات، هەروەها بۆ هەڵبژاردنی ئەو گریمانەیەی کە دەیەوێت ڕاستییەکەی تاقی بکاتەوە و لە کاتی هەڵبژاردنی ئەو میتۆد و کەرەستانەی کە بۆ توێژینەوەکردن بەکاری دەهێنێت[٦٤].

لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی کە تیۆری کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە بینییەوە، هێشتا کورتدەهێنێت لە باسکردنێکی چڕوپڕ بۆ ئەو دیاردانەی کە توێژینەوەیان دەکات، ڕەنگە وا بکات لە هەندێك دیاردە تێبگەین، کەرەستەی تیۆری بخاتە

---

[٦٣]- سمير نعيم احمد، النظرية في علم الاجتماع، القاهرة ١٩٨٣، لا ٤٧.
[٦٤]- محمد وقيدي، العلوم الانسانية و الايديولوجيات، بيروت ١٩٨٣، لا ١٣٨.

بەردەم توێژەر کە یارمەتی باسکردن دیاردە و توانای ڕاڤەکردن و پێشبینیکردن بدات، کەچی توانای لە ڕاڤەکردن و پێشبینیکردن کەمتر جێگای باوەڕە لە تیۆرەکانی زانستە سروشتییەکان، لە ڕاستیدا ئەو تیۆرە کۆمەڵایەتییەی کە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە هیچ نییە جگە لە لاساییکردنەوەی نەریتی بوونی تیۆر نەبێت لە زانستە سروشتییەکاندا(٦٥).

هەروەها سروشتی گۆڕاوی دیاردەی کۆمەڵایەتی و جیاوازی دیاردەی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، وا دەکات دانانی تیۆر تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت بێت، هەر ئەمەش بوو کە میرتۆن جەختی لەسەر کردەوە، داوای کرد تیۆری ماوە ناوەند دابنرێت لە جیاتی دانانی سیستەمی تیۆری زۆر گشتی و ئەبستراکت، هەروەها میرتۆن لایەنی تیۆردانان و توێژینەوەی مەیدانی بە یەکەوە بەستایەوە، بە بۆچوونی ئەو تیۆر هیچ نییە جگە لە شێوەیەك لە ڕێسادانان نەبێت، بەو مانایەی ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە دانانی تیۆر بۆ گشتاندنی ئەزموونی کە دەکرێت پێی بگەین لە میانەی توێژینەوەی وێنەی کۆمەڵایەتی جیاواز بۆ ڕەفتار، بۆیە دەبێت ئاگاداری ئەو کێشە تیۆرییانە بین کە زانایانی کۆمەڵناسی پێشوو فەرامۆشیان کردووە، بۆیە دەبێت گریمانەی تازە دابڕێژین لە میانەی

---

٦٥- هانزموس، الفکر الاجتماعي، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٠_٢٣١، بڕوانە: سوسولوجیا ماکس فیبر، لا ٥_٦.

پرۆسەی ڕێسادانان، ئەو گریمانانە یارمەتیمان دەدات بۆ دڵنیابوونەوە لە تیۆر لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوە لە داهاتودا(٦٦).

ئەو تێبینییەی میرتۆن باسی کرد، بە تایبەتی سەبارەت بە کۆمەڵگاکانی جیهانی سیێ کە تایبەتمەندی خۆیان هەیە و جیاوازن لە کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا لە ڕاستی نزیکە، چونکە تیۆری کۆمەڵایەتی، یاخود ئەو گشتاندنە ئەزموونییانەی کە ئەو تیۆرانە گوزارشتی لێ دەکەن، ئەگەر زانستی و دروست بێت، ڕاستی ئەوە بەسەر دیاردەکە، یاخود دیاردەی کۆمەڵایەتی لێ توێژراو سنووردار کراوە، بەڵام ڕەنگە ئەو گشتاندنە، یاخود تیۆرانە بەهای زانستی خۆیان لە دەست بدەن ئەگەر بمانەوێت بەسەر کۆمەڵگای جیاوازدا پراکتیزەیان بکەین.

بە شێوەیەکی گشتی تیۆرە خۆرئاواییەکان لایەنگیرن و زۆر ڕوون نین، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو زۆرجار پێچەوانەن ئەگەر بێ وردبونەوە یاخو پێداچونەوە وەریان بگرین، واقیعی کۆمەڵایەتی بە ناوبژیوان دەمێنێتەوە، چەندین زانای خۆرئاوا دانیان بەوەداناوە کە تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان ئایدیۆلۆجیایان بەسەردا زاڵە، ئەمەش مانای ئەوە نییە لێیان دابڕێین، بەڵکو دەکرێت وەك ئامراز بەکاریان بهێنین، میتۆدەکانی شیکردنەوە و ڕاڤەکردنیش وەك کەرەستەگەلێك بۆ توێژینەوەکردنی واقیع بەکاربهێنێن، بێ

66- L. moskvichov, The End Idiology, illusions and reality Prosress publishers, Moscow, 1974, pp 41-40.

ئەوەی توێژەر پابەند بێت بەو ئەنجام و گشتاندنانەی کە ئەو تیۆرانە پێی گەیشتوون لە کۆمەڵگاکانی دیکەدا.

ئەو قسەیەش خەسڵەتی زانستیبونی تیۆری کۆمەڵایەتییەکان ڕەتناکاتەوە هێندەی هەقیقەت زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەخاتە نێو چوارچێوە دروستەکەی خۆی، بەوپێیەی کە هەقیقەتگەلێکی ڕێژەیین، نەك ڕەها، سەرەڕای ئەوەی کە کارل مانهایم گومان دەخاتە سەر هەقیقەتی ڕێژەیی، بەشێوەیەك پێیوایە هەقیقەت یان هەیە یان نییە، لە ڕوانگەی ئەودا تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان هەقیقەتێکی ڕەهایان نییە، کەواتە تەنیا چەند بۆچونێکن و تایبەتن بە توێژێك یان چینێك، بەمپێیەش تەنیا مەعریفەیەکی ڕێژەیی پێشکەش دەکەن، واتە بەشێوەیەکی ئەرکگەری پەیوەستە بە دۆخی کۆمەڵایەتی چینەکان و بەرژەوەندی ئابووری و سیاسییان، بەمپێیەش مەعریفەیەکی شێواو دەبێت(٦٧).

هەندێك کەس هەڵوێستێکی زۆر پەرگیریان هەیە و تیۆری کۆمەڵایەتی ڕەتدەکەنەوە، بەوەی کە پێیانوایە خاوەنی تیۆرە ئەبستراکتەکان تەنیا لە قۆناغی نمایشکردنی چەمك و وێناکان بەشێوەیەکی بەیەکەوە گونجاو دەوەستن، بەڵام ئەوەندە خۆیان ماندوو ناکەن بەشێوەیەکی واقیعی و زانستی تاقی بکەنەوە بە پشت بەستن بە چەند گریمانەیەکی ڕوون. لێرەوە جۆرج هۆمانز پێیوایە ڕەنگە چەندین تیۆری کۆمەڵایەتی بۆ شتێك بگونجێت

[67]- G. humans: Social behavior, its elementary forms N.Y. Harcourt brace and world, p 10.

و بەڵام هەرگیز بۆ ڕاڤەکردنی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە نەگونجێت کە ئامانجی یەکەمییەتی. دوای ئەوەی تیۆری کۆمەڵایەتی بەراورد دەکات بە تیۆری زانستە سروشتییەکان، دەگاتە ئەوەی کە بڵێت هیچ تیۆرێك نییە لە کۆمەڵناسی کە تەواوی مەرجە پراکتیکییەکانی تێدا هەبێت.

# بەشی سێیەم

## میتۆدی زانستی ( Scientific Method )

### ١. پێناسەکردن و قۆناغەکانی پەرەسەندن

وشـــەی میتـــۆد لـــە کـــردەی ڕێگـــا و شـــێواز وەرگـــیراوە ،مانـــای گرتنەبـــەر ، ڕێگاگرتن، بەدوواداچوون دەگەیەنێت. فەرهەنگی فەلسەفی بە زمانی عەرەبی میتۆدی بەوە پێناسەکردووە: (شێوازێکی ڕوونە بۆ گوزارشتکردن لـە شـتێك، یاخود لە کاری شتێك، یاخود لە فێربونی شتێك بە گـوێرەی پرەنسـپگەلێکی دیاریکراو، بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو).

وشـــەی عـــەرەبی بەرامبـــەر وشـــەی میتـــۆدی ئینگلیـــزی واتـــە ڕێگـــا، یـــاخود سیستەمێك، وشەکە لە بنچینەدا لای یۆنانییە کۆنەکان بە مانـای توێژینـەوە، یاخود مەعریفە بەکار هاتووە.

بەشـێوەیەکی گشـتی میتـۆد ئـەو ڕێگایەیـە کـە توێـژەر دەیگرێتـە بـەر بـۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە گرفتی بابـەتی توێژینـەوە دەیوروژێنێـت، ئەوکاتـەی توێـژەر یـاخود مرۆڤـی ئاسـایی ڕووبـەڕوی پرسـیارێك دەبێتـەوە،

دەستدەکات بە بیرکردنەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە، ئینجا یان ڕێگای چارەسەرەکە نازانستی دەبێت واتە پشت بە ئەفسانە و بیرکردنەوە پیشینیەیی بێ بەڵگە دەبێت، بێ ئەوەی بۆ واقیعی دیاردەکە بگەڕێتەوە بەهۆی تێبینیکردن و ئەزموونکردن و بەراوردکردن، لەم حاڵەتەدا لە بەردەم میتۆدێکی نازانستین، یاخود بەپێچەوانەوە لە تێبینیکردن و ئەزموونکردن دەسپێدەکەین و کەرەستەکانی توێژینەوەی زانستی بەکاردەهێنین، لێرەوە ئێمە لە بەردەم میتۆدی زانستین.

بەدڵنیاییەوە جیاوازی میتۆدی پەیڕەوکراو بۆ گەیشتن بە چارەسەر دەبێتە هۆی جیاوازی لە ئەنجام، یان چارەسەرەکان، بەڵکو دەکرێت بڵێین پاساوی بوونی زانستە مۆدێرنەکان سەرهەڵدانی بابەتە تازە دۆزراوەکان نیە، یاخود بوونی تیۆر و یاسای تازە نییە، بەڵکو میتۆدێکی تازەیە کە توانای زیاترە لە ئەوانی دیکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتگەلێکی دیاریکراو کە سەر بە هەمان جۆری مەعریفەن، لەمبارەیەوە پێرسۆن دەڵێت: (یەکێتی هەموو زانستێك پشت بە میتۆد دەبەستێت نەك بابەت، ڕووداوەکان خۆیان لە خۆیاندا زانست درووست ناکەن ، بەڵکو ئەو میتۆدەی لە ڕێگایەوە توێژینەوە لەسەر ڕووداوەکان دەکرێت ).

میتۆدی زانستی لە مەعریفەی زانستی جیا نابێتەوە، ئەمە تەکنیکێکی مەعریفییە، کە پایەی مەعریفەی زانستییە، ئەوەی دوایی بەدەستناهێنرێت تەنیا بە میتۆدی زانستی نەبێت، بەمپێیەش یەك مێژووییان هەیە، چونکە لە

پاڵ تیۆر و یاسا زانستییەكان بنەما و ناوەڕۆك و سیستەمی بیركردنەوەی زانستیین.

ئەگەر میتۆد مانای ئەو شێواز و دەروازانە بێت كە توێژەر لە سەرجەم داتا پێویستەكانی توێژینەوەكەیدا بە كاریان دێنێت، دوواتر بەهۆیانەوە دەگاتە دەرەنجام، یاخود ڕاڤەكردن، یاخود پێشبینی، یاخود تیۆرەكان، چەمكی میتۆدلۆژیا هەمەكییترە لە چەمكی یەكەم و واتای زانستی میتۆدەكانە، (كابلان) جیاوازی نێوان ئەو دوو چەمكە ڕووندەكاتەوە و دەڵێت:

(ئامانجی میتۆدۆلۆژیا لە توێژینەوە بریتییە لە وەسفكردن و شیكردنەوەی میتۆدە بەكارهاتووەكانی توێژینەوەكە ، تیشكدەخاتە سەر سەرچاوە و توانا و سنوورەكان، دوواتر ئەوەی بەرایی (بەڵگەنەویست)و گریمانەی لەسەر دروستدەبێت ،لەگەڵ دواهات و پێشبینیەكان ڕووندەكاتەوە، لە میانەی ئەمەوە میتۆدۆلۆژیا تواناكانی میتۆد لە ژێر ڕۆشنایی دووا دۆزراوەكانی زانستدا ڕوون دەكاتەوە ، لەو بوارەی كە توێژینەوەی لەسەر دەكرێت بە پشت بەستن بە سەركەوتنی وردی میتۆد و تەكنیكی كۆكردنەوەی داتا بەكارهاتووەكان، پراكتیكی تازە بۆ توێژینەوە پیشكەش دەكات، هەروەها پرەنسیپ و بنەمای لۆژیكی و هەستەكی ئاشكرا دەكات كە گرفتەكانی چارەسەر دەكات و شێوازی تازە دەخاتەڕوو)[٦٨].

[68]- Kaplan, A. the conduct of Inquiry (internext books. Alesbury), 1973.

میتۆدی زانستی دامەزراو لەسەر زانست، کە ئامانجی گەیشتنە بە هەقیقەت، بە پشت بەستن بە کۆمەڵێك ڕێسای گشتی و ڕێکخراو تەنیا لە چاخی ڕێنسانس دەرکەوت، واتە پەیوەست بوو بە بیرکردنەوەی زانستی ڕزگاربوو لە بیرکردنەوەی غەیبی و هزری هەمەکی پێودانگی و بەهایی، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵگەلێك دەبینین بۆ میتۆدی زانستی لە لایەن بیرمەندە موسڵمانەکانەوە، بە تایبەتی ئیبن خەلدون (١٣٣٢-١٤٠٦)([69])، کە سەرەڕای ئینتیمای بیرکردنەوەی بۆ شێوازی بیرکردنەوەی فەلسەفی، کەچی ئەوەی هێنایە ئاراوە، شێوازێك بوو بۆ توێژینەوەکردنی مێژوو و ئاشنابوون بە واقیع بە تایبەتی لە دەوڵەتانی باکووری ئەفریقیا ئەمەش وای لێ دەکات ببێتە حاڵەتێکی جیاواز لە چاخی خۆی.

ئیبن خەلدون ئەوەی ڕەتکردەوە کە وەك زانستێك لە زانستە شەرعییەکان لە مێژوو بڕوانێت ، یان وەك زانستێك لە زانستە ئەقڵییەکان، ئەو وەرچەرخانەش وای کرد ئیبن خەلدون ڕەخنە لەو میتۆدانە بگرێت کە لە چاخەکەیدا باوبوون، بەمەش وێنایەکی ئەلتەرناتیڤی خستەڕوو، مێژوو بە بۆچوونی ئەو، لە ڕووخساریدا هیچ نییە جگە لە هەواڵگەلێك لە بارەی ڕۆژگار و سەردەم و دەوڵەتان و ڕابردوی سەدەکانی ڕابردووەوە، تێیدا گێڕانەوەکان گەشە دەکەن، وێنەو نمونەکان تێیدا ونن،بەلام لە ناخیدا لەوە قوڵترە

[69] تێبینی : لەسەرچاوە عەرەبییەکەدا لە دایك بوون و مردنی ئیبن خەلدوون بە ساڵی کۆچی نوسراوە ،بەهەر شێوەیەك بەراورد بکرێت لەگەڵ مێژووی زاینیەکە یەك ناگرێتەوە بۆیە لێرەدا بە مێژووی زاینی نوسراوة .

،تێـروانین و توێژینەوەیــە، دۆزینــەوەی هۆکــاری بونــەوەر و پرەنســیپە وردەکانیەتی، زانستی چۆنییەتی ڕووداوەکان و هۆکارە قوڵەکانییەتی[٧٠].

ئەو وێناکردنە بۆ چۆنییەتی تێگەیشتن لە مێژوو بەوەی کە مێژوویەکە و وتـە و لێکدانەوەکان بەسەریدا زاڵە، واتە ئایدیۆلۆجیا بە شێوەیەکی گشتی، بۆتـە واقیعگەلێك کە سـوودیان هەیـە بۆ داهـاتوو وەك پەنـد، ئەمـەش شۆڕشـێکی میتۆدییە، شۆڕشێکە لە دژی گواستنەوەی دامەزراندنی میتۆدی توێژینــەوە و وردبونەوە بۆ جەختکردنەوە لە هاویـەکبوونی ئـەوەی دەگوترێـت لـە بـارەی سروشـتی بـارودۆخی ئاوەدانکردنــەوە و شــارەکان، ئەمــە هەوڵــدەدات بـۆ گەڕانەوەی واقیعەکان بۆ هۆکارەکانی.

ئیبن خەلدون پێیوایە ئاشکراکردنی هەڵەکانی مێژوونوسان وەك دەروازەیەکی زانســتییە بــۆ توێژینــەوەی کۆمەڵایــەتی، گــرنگترین ئــەو ڕەخنانــەی کــە ڕووبەڕووی مێژونووسان دەبێتەوە ئەوانەن:

١. ڕۆیشـــتنی مێـــژوونوس بـــە دوای مـــەیل و ئـــارەزووی کەســـی خـــۆی، مەراییکردنی بۆ ئەوانەی لە دەسەڵاتدان.
٢. نەناسـینی ئـەو یاسـایانەی کـە دیـاردە سروشـتی و کۆمەڵایەتییـەکان ملکەچییانن، کە پێی دەڵێت سروشتی ئاوەدانی.

---

[٧٠]- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، بیروت، ط٣ ١٩٦٧، ل ٤٣.

لە بەرامبەر ئەوەدا بانگەشەی کرد بۆ پێویستی بە هێند وەرگرتنی تێبینیکردن و میتۆدی بەراودکردن لە توێژینەوەی کۆمەڵگادا، خاڵە سەرەکییەکانی میتۆدی ئیبن خەلدونیش لەم چەند خاڵە کورتدەبێتەوە:

١. بەهێندوەرگرتنی تێبینیکردنی ڕاستەوخۆی مەبەستدار بۆ دیارەی لێتوێژراو.
٢. بەدواداچونی یەك دیاردە لە سەرجەم قۆناغە جیاوازەکانی پەرەسەندنی لە مێژوودا ،لە هەر کۆمەڵگایەك، پابەندبوون بە ڕاستگۆیی و وردی لە مامەڵەکردن لەگەڵ گێڕانەوەکاندا.
٣. بەراوردکردنی دیاردەکان بەو دیاردانەی کە پێیەوە پەیوەستن لە هەمان کۆمەڵگادا یان لە کۆمەڵگاکانی دیکەدا.
٤. بەهێند زانینی لایەنی دینامیکی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە پاڵ لایەنی ئیستاتیکی.
٥. دوای کۆکردنەوەی ماددەی سەرەتایی پەیوەست بە دیاردەی لێتوێژراو لە ڕێگای تێبینیکردنی هەستەکی و توێژینەوەی مێژوویی و بەراودکاری، دەکرێت لۆژیکی شیکاری بەکاربهێنرێت بۆ گەیشتن بەو یاسا گشتییانەی کە دیاردە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان بەڕێوە دەبات[٧١].

لۆژیکزانەکانی سەدەی شانزدەیەم بەشداریان لە بایەخدان بە میتۆددا کردووە، دەبینین ڕامۆس (١٥١٥_١٥٧٢) لۆژیك بۆ چوار لق دابەش دەکات:

---

٧١- عبدالباسط، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٤.

وێناکردن، بڕیاردان بەڵگەهێنانەوە، میتۆد، بایەخدانی بە میتۆد وای کرد جەخت لەسەر ڕەوانبێژی و ئەدەب بکات ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بایەخی تەواو بە تێبینیکردن و ئەزموونکردن نەدات، کە لە پێداویستییە بنەڕەتیەکانی میتۆدی زانستین، بەڵام بەشداریی کردنی بووە هۆی راکیشانی سەرنج بەلای گرنگی میتۆدەوە ، لەگەڵ پەرەسەندنی لۆژیك لە (لۆژیکی وێنەیی)ـییەوە کە پەیوەندی نییە بە واقیعە دەرەکییەکان بۆ لۆژیکی ماددی، یاخود فەلسەفی وایکرد زیاتر بایەخ بدرێت بە پرسی میتۆدی زانستی، ئەو لۆژیکە ماددییەی کە ئەندرێ لالاند ئاماژەی پێکردووە، وایکرد بایەخ بدرێت بەو یاسایانەی کە بەهۆیەوە ڕێککەوتنی هزر لەگەڵ واقیع دروست دەبێت، ئەو پەیوەندییە دالێکتیکییەی لە نێوان هزر و واقیعدایە گرنگترین ڕێسای میتۆدی زانستییە، بەمشێوەیە دەبینین کە پەرەسەندنی لۆژیك بووە هۆی دەرکەوتنی میتۆدی زانستی، لۆژیکی کۆن (ئەرستۆیی)لە میانەی زمانەوە توێژینەوەی لەسەر پەیوەندی هزر دەکرد بە خۆیەوە، لێرەوە بە لۆژیکی وێنەیی یان تیۆری ناوزەند کرا، هەرچی لۆژیکی زانستە تازەکانە، توێژینەوەی پەیوەندی هزر لەگەڵ شتەکان دەکات، ئەگەر خەسڵەتەکانی لۆژیکی کۆن بەمشێوەیە بێت: شێوەیی و گشتی و ڕەها، خەسڵەتەکانی لۆژیکی ئێستا، واتە لۆژیکی میتۆدی زانستی بەمشێوەیەیە: بابەتی، تایبەت، ڕێژەیی.

لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا مانای زاراوەیی بۆ وشەی میتۆد هاتەئاراوە و میتۆدیش بوو بە پێداویستییەکی زانستی و ئامانجێك بۆ هەموو زانا و توێژەرەکان.

فرانسیس بیکۆن(١٥٦١–١٦٢٦)ی پێشڕەوی یەکەمی میتۆدی ئەزموونگەری وبانگەشەکاری دڵسۆزی پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەی مرۆیی، کتێبەکەی بە ناونیشانی (ئامرازی تازەی زانستەکان) (١٦٢٠) پوختەی بۆچوونی خۆی لە بارەی ئەم بابەتەوە خستۆتە ڕوو.

بیکۆن چەندین پرەنسیپی داناوە کە میتۆدی زانستی لەسەر دەوەستێت ئەوانیش:

١. پێویستی خۆ ڕزگارکردنی زانست لە هزرە پێشینەکان، یاخود پێگە و ملکەچکردنی بۆ تێبینیکردن و ئەزموون.
٢. کورتنەکردنەوەی توێژینەوەکان لە توێژینەوەی تیۆری و پێشەکییە لۆژیکییەکان، پێویستی پشت بەستن بە ئەزموونکردن کە یارمەتی دەرهێنانی یاساکان دەدات، بەلآم دەستپێکردن بە هەڵهێنجاندن توێژەر گومڕا دەکات ،لە هەڵەیەکی دیاریکراوەوە بۆ هەڵەیەکی گشتیی دەبات.
٣. دەبێت ئەزموونی زانستی لە سەرەتادا زانیاری لە بارەی واقیع کۆ بکاتەوە لە ڕێگای تیبینی کردنەوە.
٤. دووای کۆ کردنەوەی زانیاریەکان لە میانەی تێبینی دەرەکی بابەتییەوە، پێدراوەکان ڕێك دەخرێن،بەراورد لە نێوان زانیاریەکان دەکرێت بۆ

دیاریکردنی چیی جەوهەرییە یان رووکەشە لە ناویاندا ، دواتر ئەو زانیاریانە لەگەل گریمانەکان بەراود دەکرێن تا بزانین کامیان لەگەڵ گریمانەکان وکامیان لەگەڵیاندا نین ، دوواتر یاساکان دادەنرێن و لە رەوشێکی نوێدا توێژینەوە لەسەر راستی وناراستیان دەکرێت.

هەروەها بیکۆن بۆ تێبینیکردنی زانستی بنەمای دیکەی داناوە ، کە دەوەستێتە سەر خۆرزگارکردن لە چەندین وەهم:

١. خۆ ڕزگارکردن لە وەهمی مرۆیی کە پەیوەستە بە کەموکوڕی عەقڵی مرۆیی، وەك ئارەزووی تایبەت و باوەڕکردن بە خورافات.
٢. خۆ ڕزگارکردن لەو وەهمانەی بۆ زمان و ئامرازەکانی دەگەڕێنەوە ،(بیکۆن پێیان دەڵێت وەهمەکانی بازاڕ)، ئەمەش بۆ بێتوانایی زمان دەگەڕێتەوە لە گوزارشتکردن لە کاروبارەکان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست.
٣. خۆ ڕزگارکردن لە وەهمی بیروباوەڕەکان ، پێی دەوترێت وەهمەکانی ئەشکەوت واتە عەقڵ، یاخود ڕەفتار دەبێتە دیلی نەریت و بارودۆخی پەروەدەیی جیاواز.
٤. وەهمەکانی شانۆ، ئەوانەش هەڵەی تایبەتی زانا و فەیلەسوفەکانن کە خەڵك ڕێزیان لێدەگرێت و بێ بیرکردنەوە بە بەڵگەنەویستی دەزانن[٧٢].

[٧٢]- محمد عیسی، البحث الاجتماعي، القاهرة، ١٩٦٣، ل ٢٤٨_٢٤٩.

لە هەمان کاتدا زانایان جیاوازییان لە نێوان میتۆدی بەڵگاندن، یاخود هەڵهێنجاندن لەگەڵ میتۆدی ئەزموونی کردووە، یەکەمیان بەوە پێناسە کردووە (ئەو بەڵگەیەی بە پرسی بەڵگەنەویست دەست پێ دەکات، بەرەو پرسی دیکە دەچێت کە ئەنجامەکەیەتی، بێ ئەوەی پەنا بۆ تێبینیکردن بەرێت و دواتریش گریمانە و توێژینەوە بەهۆی ئەزموونکردن، پاشان بە یاسا دەگات کە پەیوەندییەکانی نێوان دیاردەکان ئاشکرا دەکات).

هەرچی میتۆدە، بەوە پێناسە کراوە کە (هونەری ڕێکخستنی دروستە بۆ زنجیرەك هزری جۆراوجۆر، ئینجا چ لە پێناو بەدەرخستنی هەقیقەتێك بێت ئێمە نایزانین، یان بۆ سەلماندنی ئەو هەقیقەتە بێت بۆ کەسانی تر کە ئێمە دەیزانین).

لەو قۆناغەی پەرەسەندنی مەعریفەی زانستیدا، دیکارت[٧٣] بەدەرکەوت، کتێبێکی بەناوبانگی نووسی بە ناونیشانی (وتارێك لە بارەی میتۆد) (١٦٣٧)، باس لەوە دەکات کە میتۆد بەشێکە لە مەعریفە، دەڵێت مرۆڤ تەنیا خاوەنی دوو جۆری مەعریفەیە.

یەکەم: مەعریفە بە گومان (حەدس)[٧٤]، ئەو پرۆسە زیهنییەیە کە لە ڕێگایەوە دەرك دەکەین و پشکنینی عەقڵی سادە و ڕاستەوخۆ بۆ هەندێك

---

[٧٣]- رینێ دیکارت، فەیلەسوف و ماتماتیکزانێکی فەرەنسیە، بە گرنگترین دامەزرێنەری فەلسەفەی مۆدێرن دادەنرێت.

[٧٤]- حەدس، بریتییە لە دەرککردنی ڕاستەوخۆ بە بابەتی بیرلێکراوە، کاریگەری هەیە لەسەر پرۆسە زیهنییە جیاوازەکان، بە حەدس دەرك بە هەقیقەتە ئەزمونگەرییەکان و هەقیقەتە عەقلییەکان دەکەین.

هەقیقەت دەکەین بە شێوەیەك کە جێگای باوەڕ بێت و نەکرێت لەناو ببردێت.

دووەم: دەرەنجام (ئەو پرۆسەیەیە لە میانەیەوە پێشوەختە بە سەلماندنی بەڵگەهێنانەوە تەواوی ئەو ئەنجامانە بەدەستبێنین کە دەکرێت لەو بابەتانەی خستومانەتەروو بە دەست بێن).

هەروەها دیکارت پێناسە میتۆدی کردووە،بەوەی (ڕێساگەلێکی تۆکمەیی ئاسانە کە ڕێکخستنە وردەکەی ڕێگا لەوە دەگرێت ناراست بە ڕاست دابنرێت، خودیش بە مەعریفەی ڕاست دەگەیەنێت بە هەموو ئەو شێوانەی کە دەتوانرێت دەرکی پێبکرێت، بێ ئەوەی کۆشش بە هەدەر بدەین، بەڵکو زیاتر لەمە مەعریفەی خودیش بەمێژوو زیاتر دەکات)[٧٥].

دیکارت سوود لە میتۆدی ماتماتیکی وەرگرتووە بۆ گەیشتن بە یەك میتۆد کە دەبێت لە توێژینەوە جیاوازەکان بەکاربهێنرێت بە ئامانجی گەیشتن بە هەقیقەت، بەشێوەیەك بەڵگە ماتماتیکییەکان ئەوەیان ئاشکراکرد کە زیاتر جێگای دڵنیایی و باوەڕن، بە ئەنجامێك گەیشت کە دەڵێت، ئەگەر هەر زانستێك ئەو میتۆدەی کە ماتماتیك بەکاردەهێنێت پراکتیزە بکات، زانستەکە لە ڕووی جبێگیری ئەنجامەکانیان دەگات بە پلەی ماتماتیك، لێرەوەیە دیکات عەقڵی لۆژیکی کە لە لایەن ئەرستۆوە باسی لێوەکراوە بە عەقڵێکی نەزۆك دادەنێت و عەقڵی ماتماتیکی لە جێگای دادەنێت، بۆیە بایەخدانی دوو

٧٥- رينيه ديكارت، مقال في المنهج، ترجمة محمود محمد الخضري، القاهرة، لا ٢٤١.

لایەنەی دیکارت بە فەلسەفە و ماتماتیك (سەرەڕای دژپێکی نێوانیان) بۆ ئەوەی ئەو میتۆدە دابڕێژێت کە دەیەوێت کاری پێ بکرێت، دیکارت مەبەستدارانە میتۆدی ماتماتیکی توێژینەوەکرد و بە دوای ئەوەدا چوو کە چۆن مرۆڤ مومارەسەی چالاکی عەقڵی دەکات لە بواری مەعریفەی ماتماتیکی، دەکرێت بەشێوەیەکی عەقڵی بە ئەنجام بگەین لە ڕێگای پێوانەکردنەوە، بەڵام دیکارت هەر بە دڵسۆزی مایەوە بۆ میتۆدی بەڵگاندن لەڕێگای هەڵهێنجاندن بەشێوەیەك هەوڵدانی بۆ گەیشتن بە باوەڕ لە ڕێگای بەڵگاندن یاخود حەدس ئەنجام دەدرا، ١٨ بنەمای داناوە کە بە گرنگترین بنەمی شێوازی شیکاری دادەنرێت لە توێژینەوە، گرنگترین ٤ دانەشیان ئەوانەن:

أ) بنەمای بێ گومانی، هیچ شتێك بە هەق دانەنێم ئەگەر بە دڵنیاییەوە نەمزانی ئەوە هەقە، بەومانایەی کە خۆم لە هەڵچوون و بڕیاری پێشینە بەدووربخەمەوە، هیچ شتێك نەخەمە ناو بڕیاردانم جگە لەوەی کە بە ڕوونی لە بەردەم عەقڵمدا بەدەردەکەوێت، بە شێوەیەك هیچ بوارێك نەمێنێتەوە بۆ گومان دروستکردن لەسەری.

ب)بنەمای شیکاری: بە گوێرەی ئەو بنەمایە، دەبێت ئەو گرفتەی کە دەمانەوێت چارەسەری بکەین بۆ چەند بەشێکی سادە دابەش بکەین بە شێوەیەك دەتوانێت لێی تێبگەین و دواتریش چارەسەری بکەین.

ت)بنەمای لێکدان و پێکهێنان: دیکارت پێناسەی دەکات و دەڵێت: (بیرکردنەوەی خۆم سیستماتیك ببەم بەڕێوە، لە سادەترین و ئاسانترین

ناسراوەوە دەست پێ بکەم ، تا هێواش هێواش بگەم بە ناسینی بنەمای پێکهاتنی، لەوەش زیاتر کاروبارەکان رێك بخەم تاوەکو هیچیان بە پێش یەکتر نەکەون).

پ)بنەمای سۆراخکاری تەواو، یاخود توێژینەوەکردن: بەو مانایەی کە جوڵەیەکی هزری بکەین بۆ ئەوەی هەموو ئەو بابەتانە کۆ بکەینەوە کە پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە.

ئەگەر میتۆدی زانستی لەسەر توێژینەوەکردنی واقیع لەسەر تێبینیکردن و ئەزموونکردن و بەراوردکردن دەوەستێت، ئەمە مانای ئەوە نییە کە میتۆد تەنیا تەکنیکێکی ماددی پەتییە، چونکە مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردەکان تەنیا سیما ماددییەکانی دایدەماڵێت لە رەهەندە فەلسەفی و ناوەرۆکە نەبینراوەکانی، بۆیە ئەمرۆ میتۆدی زانستی لایەنی تەکنیکەی ماددی لە توێژینەوە بە لایەنی تیۆری فەلسەفەی دەبەستێتەوە، ئەمەش خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی مەعریفەی زانستی بە مانا مۆدێرنەکەی، کە لە لایەنی دیار و هەستەکی و لایەنی تیۆری، یان ئەبستراکتی پێکدێت.

**ب)چەمکی میتۆد و سنووری لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا**

چاکەی هێنانی میتۆدی زانستی بۆ نێو توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە سەدەی نۆزدەیەم بۆ ئۆگۆست کۆنت دەگەڕێتەوە، سەدەی نۆزدە بە سەدەی دامەزراندنی زانستییانە دادەنرێت بۆ توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان. کۆنت سەر بەو کەسانەیە کە بانگەشەیان کردووە بۆ گرنگی توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا بە

بەکارهێنانی شێوازە بەکارهاتووەکان لە زانستە سروشتییەکان، ئەویش دامەزرێنەری بنەمای قوتابخانەی پۆزەتیڤیزمە.

ئەوەی جێگای سەرەنجە ئەوەیە کۆنت لە ژێر کاریگەری سیمۆن[(٧٦)] دا بوو، ئینجا لە بارەی ئەو تیۆرە سێ قۆناغییە بوو لە بارەی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی، یاخود مەعریفەی مرۆیی، یاخود بەهۆی بانگەشەکردنی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەهەمان ئەو شێوازەی کە مامەڵە لەگەڵ دیاردە سروشتییەکان دەکرێت. لەو کتێبە کە سان سیمۆن لە بارەی زانستی مرۆڤ نوسیوویەتی، پێیوایە فیزیۆلۆجیا (کە زانستی مرۆڤ بەشێکە لێی) دەبێت بە گوێرەی ئەو میتۆدە توێژینەوە بکەین کە زانستە سروشتیەکانی دیکە لەسەری ڕۆیشتوون، سان سیمۆن میتۆدێك، یان تیۆرێکی تایبەت بەخۆی نەهێناوەتە ئاراوە لە بواری کۆمەڵایەتی، بەڵکو ڕوانگەیەکی مێژوویی زاڵبوو بەسەر ڕوانینی بۆ دیاردەکان.

کۆنت بانگەشەی پێویستی توێژینەوەکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی وەسفی شیکاری ڕێکخراو دەکات بۆ بەدەستهێنانی یاساگەلێك کە ئەو دیاردانەی ملکەچی دەبن، جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە شێوازی میتافیزیکی لە بیرکردنەوە مەرجێکە بۆ هەموو خەڵکێك بۆ تێگەیشتن لە

[٧٦]- سان سیمۆن (١٧٦٠_١٨٢٥)، فەیلەسوفێکی سۆسیالیستی فەرەنسیە و بە نوسینە کۆمەڵایەتییەکان بەناوبانگ بوو، بەتایبەتی ئەو نوسینانەی کە ڕەخنە لە دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی دەگرێت، تا ئەو ئاستەی کە داوا دەکات ئەمەی دوایی لە نێو ببردرێت.

هەقیقەتی دیاردەکان، ئەویش خاوەنی ئەو وتەیە کە دەڵێت شتەکانی پشت هەست بوونیان نییە.

کۆنت لەو ڕوانگەیە دەسی پێکردووە کە بەدەستهێنانی هەقیقەتی بابەتی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا ڕوونەدات تەنیا ئەگەر سنوورێك بۆ بۆچونی و تێڕامانی خودی فەیلەسوفان دابنرێت، هەروەها پێویستە پابەند بین بەبێ لایەنی. ئەو جەختی کردەوە لە سەر جیاوازیکردن لە نێوان حوکمی بەهایی و واقیعی، لە ڕوانگەی ئەو زانستی پۆزەتیڤی تەنیا بایەخ بە واقیعی بەرهەست دەدات، ئینجا چ واقیعی سروشتی، یاخود کۆمەڵایەتی بێت. لێرەوە داوای کرد تێبینیکردن و ئەزموونکردن و بەراودکردن و شێوازی مێژوویی بەکاربهێنرێت بۆ ئەوەی بتوانین لە مێژوو و ئەو یاسایانە تێبگەین کە ڕێکی دەخات.

گیندنز ئەو بەشدارییەی کە قوتابخانەی پۆزەتیڤیزم بۆ میتۆدی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێشکەشی کردووە لە دوو بواردا دەستنیشانی دەکات:

١. ئەو ڕێکارانەی لە توێژینەوەی زانستە سروشتییەکاندا پراکتیزە دەکرێت، دەکرێت لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش پراکتیزە بکرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەتوانین تێبینی کۆ بکەینەوە لە بارەی جیهانی کۆمەڵایەتی و لە هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان دڵنیابین.

٢. ئەو دەرەنجامانەی کە زانای زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێی دەگەن، دەکرێت بەشێوەیەکی یەکسان و هاوسەنگ دابڕیژرێن وەك چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەنجامەکانی زاناکان لە زانستە سروشتییەکان دەکرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەو ئامرازانەی زانای کۆمەڵایەتی بەکاری دەهێنێت، دەبیت لەسەر شێوەی یاسا یاخود هاوشێوەی یاسا لە گشتاندن بێت، وەك ئەوەی سەبارەت دیاردە سروشتییەکان دەیبینین، لێرەدا پۆزەتیڤیزم لە جیهانی کۆمەڵایەتی دەڕوانێت وەك شیکەرەوە یاخود شرۆڤەکاری بابەتی توێژینەوەکەی[٧٧].

بەشدارییەکانی پۆزەتیڤیزم بێ ڕەخنەی سیاسی تێپەڕ نەبوو، بە کۆنزەرڤاتیڤی تۆمەتبار کرا، تەنانەت پۆزەتیڤیزم مانای قبوڵکردنی ئەوەیە کە هەیە و پاراستنیتیشی، ئەو مانایە لە بارەی پۆزەتیڤیزم لە لایەن هێربێرت مارکیۆز ڕوونکراوەتەوە، بە ڕزگارکەری ئایدیۆلۆجیای دۆخی هەبوو دادەنرێت، هەروەها ئەو ئاراستەیە پەرەچەکردارێکە سەبارەت هزرە ڕوخێنەرەکانی سۆسیالیزم و عەقلانییەتی هیگلی واتە لە ڕووی عەقڵ و شۆڕش دەوەستێتەوە[٧٨].

هەروەك پنتی لاواز دەردەکەوێت لەوانەی بەسەر توێژینەوەی ڕەفتاری مرۆیی پراکتیزە دەکرێت، بەهۆی ئالۆزی زۆری سروشتی مرۆیی، لە پاڵ

---

[77]- Giddins, A. (ed) positivism and sociology (heineman Educational Book, London, 1975).

[٧٨]- هربرت ماركوز: العقل الثورة، ترجمة فؤاد زكريا، بيروت: المؤسسة العربية للدراسات و النشر، ١٩٧٩، لا ٣١١.

فرەیی ئەو گۆڕاوانەی لە دروستکردنی واقیعی کۆمەڵایەتدا بەشداری دەکەن ، دوای کۆنت زانایانی کۆمەڵناسی چەمکی پۆزەتیڤزمیان بە چەندین شێوە بە کارهێنا، بەشێوەیەك دژوار بوو ماناکەی بەشێوەیەکی جێگیر و ورد دیاری بکرێت.

بەکارهێنانی میتۆی زانستی بۆ توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا لەسەر دەستی ئەمیل دۆرکهایم پەرەی سەند، کتێبی (ڕێساکانی میتۆد لە کۆمەڵناسیدا) (١٩٠١) بە پوختەی هزرەکانی لە بارەی کۆمەڵناسی و ئەو میتۆدانە دادەنرێت کە پێویستە لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە کاربهێنرێت.

دۆرکهایم لە توێژینەوەکانیدا بە پێناسەکردنی دیاردەی کۆمەڵایەتی دەست پێ دەکات کە لای ئەو دوو خاسیەتی هەیە: جەبری و بابەتیبوون، بەو مانایەی کە بوونێکی هەیە لە دەرەوەی هەستکردنی تاکەکان، ئەمەش لە پێش بوونی فەردییانە مرۆڤ هەیە[٧٩]، هەروەك بانگەشەی پراکتیزەکردنی سۆراخکاری کرد لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا. لەبەر ئەوەی میتۆدی سۆراخکاری پشت بە تێبینیکردن دەبەستێت، بۆیە دۆرکهایم بایەخێکی زۆر بە تێبینیکردنی دیاردەی کۆمەڵایەتییەکان داوە، ڕێسای تایبەت بە تێبینکردنی و یەکێکیی دیکەی بۆ ڕاڤەکردنی داناوە.

لە بارەی ڕێساکانی تایبەت بە تێبینیکردنی دیاردە کۆمەڵایەتیبەکانەوە بریتین لە:

٧٩- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٥.

أ. تێبینیکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەك شتگەلێك.
ب. خۆ ڕزگارکردن لە هزری لە پێشینە لە بارەی دیاردەی لێتوێژراو.
ت. سنووردارکردن و دیاریکردنی بابەتی توێژینەوە لە ڕیزی ئەو دیاردە تایبەتانەی کە پێشوتر لە میانەی خەسڵەتە دەرەکییە هاوبەشەکانیانەوە پێناسە کران.
پ. تێبینیکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەو ڕووەی کە جیاوازە لە سیما تاکییەکانی.

هەرچی لە بارەی ڕێساکانی ڕاڤەکردنی دیاردەی کۆمەڵایەتییە بریتین لە:

١. گەڕان بەدوای هۆکاری بوونی دیاردە و ئەرکی لە کۆمەڵگادا، لەگەڵ جیاوازیکردن لە نێوان هەر دوو شت و تێکەڵنەکردنیان.
٢. دەبێت دیاردەی کۆمەڵایەتی بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دیکەی هاوشێوە ڕاڤە بکرێت ناکرێت تاك ببێتە بنەمایەك بۆ ڕاڤەکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان.

دۆرکهایم پییوایە دەبێت سۆسیۆلۆجیا شێوازی تایبەتی خۆی دابڕێژێت و بەباشی شارەزای بێت پێش ئەوەی هەر چالاکییەکی دیکە ئەنجام بدات، نابێت بەشێوەیەکی هەرەمەکی توێژینەوەی دیاردە مرۆییەکان بکات.

**ت. پۆلێنکردنەکان لە میتۆدەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا**

بە دڵنیاییەوە پەرەپەوکردنی ڕێگا زانستیەکان بووە هۆی گەیشتن بە هەقیقەت لە بواری دیاردە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان و ناوزەد کردنی ئەم ڕێگایانە بە میتۆدی زانستی ، لەم سۆنگەیەوە میتۆد دوو مانای دەبێت: تێگەیشتنێکی ئیبستمۆلۆژی بە مانای ڕێگاکانی شیکردنەوەی دیاردەکان بە دەستپێکردن لەسەر بنەمای مەعریفەی زانستی، تێگەیشتنێکی دیکەی کارڕایی (ئیجرائی)یە کە بریتییە لەو ڕێکارانەی توێژەر پەنای بۆ دەبات لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەر دیاردەیەك لە هەر زانستێکدا، تیایدا پرەنسیپە گشتییەکانی مەعریفەی زانستی بە کاردەهێنرێت، دەکرێت بڵێین کە میتۆدەکان جیاوازن لە تەکنیکەکان لە ڕووی ڕادەی گشتێتی کە وای لێدەکات بەکەڵك سەرجەم زانستەکان یاخود بەشێکیان بێت[(٨٠)] . بۆیە دەکرێت جیاوازی بکەین لە نێوان میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و میتۆدەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کە بریتییە لە گواستنەوە لە پرەنسیپە گشتییەکان بۆ تەکنیکە تایبەتەکان.

لەسەر ئەو بنەمایەوە پۆپەر باس لە یەکێتی میتۆد دەکات، ئەو لەگەڵ دانپێدانانی بە بوونی چەندین میتۆد بە پێی جۆراوجۆری زانستەکان، هەروەها فرەیی دیاردەکان لە یەك زانستدا، بەڵام ئەو دەڵێت هەمو ئەو میتۆدانە سەر بە یەك میتۆدی زانستین، بە شێوەیەك هەموویان بۆ ڕاڤەکردنی زانستی و هەڵهێنجاندن و پێشبینیکردن و ئەزموونکردن دەگەڕێنەوە.

---

[80]- Kaplan, op cit p 23>

بوونی کۆمەڵێك پرەنسپ و ڕێسای تایبەت بە میتۆدی زانستی مانای ئەوە نییە کە هەموو زانستەکان پابەندن بە بەکارهێنانی یەك میتۆد، بەڵکو چەندین میتۆد هەیە، تەنانەت سەبارەت بە یەك زانست و یەك دیاردە دەکرێت پەنا بۆ زیاتر لە یەك میتۆد ببردرێت، میتۆد هیچ نییە جگە لە کەرەستەیەك بۆ دەستەبەرکردنی بابەتیبون و گەیشتن بە هەقیقەت، لەسەر توێژەر پێوستە تەنیا پابەند بێت بە یەك میتۆد، بەڵکو دەکرێت میتۆد یاخود میتۆدەکان بەکاربهێنێت کە لەگەڵ سروشتی ئەو زانست و دیاردەیە دەگونجێت کە کاری تێدا دەکات و مامەڵەی لە تەکدا دەکات، ئاساییە بەمشێوەیە کار بکات مادام هەموو ئەو میتۆدانە پابەندی بە بنەمای میتۆدی زانستی و پرەنسیپە گشتییەکان نەك هەندەکییەکان.

هەر ئەوەی کە ئێمە چەمکی میتۆدی زانستی بەکاردەهێنین هیچ نییە جگە لە جیاکردنەوەی نەبێت لە ڕێگا نازانستییەکانی دیکە، بەڵام کە دەڵێیت پابەند بین بە میتۆدی زانست مانای گەیشتن نییە بە باوەڕی ڕەها، بەڵکو گومان و گۆڕان و پەرەسەندن لە سیما سەرەکییەکانی زانستن و بەسەر میتۆدیش پراکتیزە دەبن، گرنگی بەکارهێنانی میتۆدی زانستی بە مانا گشتییەکەی خۆی دەبینێتەوە لە جیاکردنەوەی لە میتۆدە نازانستییەکانی دیکە، لەمبارەیەوە کۆهن و ناجیل دەڵێن میتۆدەکانی دیکە بێ گیانن، بەو مانایەی کە نابینین یەکێکیان دانبنەوە دابنێت کە ئەمە دەبێتە هۆی هەڵە، دواتر هەموویان گەرانتی پێویست نادەن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، هەرچی ئەوەیە کە پێی دەگوترێت میتۆدی زانستی لە جەوهەردا جیاوازە

لێی، بەشێوەیەك هانی گومان کردن دەدات، تا ئاستێکی زۆریش یارمەتی گەشەپێدانی دەدات، بۆیە ئەوەی دەمێنێتەوە دوای ڕووبەڕووبونەوەی ئەو گومان بەردەوام پاڵپشتیکراونەیە بە باشترین بەڵگەی بەردەست، ئەگەر بەڵگەیەکی دیکە، یاخود گومانێکی دیکە، جەوهەری میتۆدی زانستی دەیکاتە بەشێك لە خۆی (واتە دەیکاتە بە بەشێك لە مەعریفەی بەردەست)، کەواتە ئەو میتۆدە یارمەتی پەرەپێدانی زانست دەدات، چونکە هەرگیز زیاتر لە قەبارەی خۆی باوەڕ بە ئەنجامەکان ناکات[٨١].

لە ڕاستیدا یەك میتۆد نییە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەڵکو میتۆدەکان فرەن بە فرەیی مەبەست و بوارەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەك فرەن بە فرەیی ژینگە کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی و ئایدیۆلۆژیاکان، ئەگەر ئامانجی میتۆدی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان گەیشتن بێت بە هەقیقەت، ئەوا هەقیقەت لەم بوارەدا ڕێژەیی و بەئایدیۆلۆجی کراوە.

لەمبارەیەوە تیزینی دەڵێت (ئێمە ئێستا لە قۆناغی فرەیی دەژین و هیچ میتۆدێك ناتوانێت بانگەشەی سەروەری و باڵادەستی و تاقانەیی بکات لە هیچ بوارێکدا، چەندین شت هەیە لە نێوان توێژەر لەم مەیدانە ئاڵۆز و فرەجۆرە لەگەڵ ئەوەی کە شێوازێك بگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە تێگەیشتن و ڕاڤەکردن و توانای پێشبینیکردنی دیاردەکان، پێوەرە میتۆدییەکان لە پارێزراودا نین لە ڕەخنەدا، بەشێوەیەك دەکرێت دووبارەی چاویان

٨١- فان دالین، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤١.

پێدابخشێنینەوە و باشتریان بكەین و بە شتی چاكتر قەرەبۆیان بكەینەوە) (٨٢).

بۆ یەكەمجار كێشەیەك هاتە ئاراوە لەسەر ئاستی ئەوەی كە كامەیان گرنگترە، توێژینەوەی ئەزموونی، یاخود توێژینەوەی تیۆری؟ بۆ نموونە ئەمریكا هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەم بایەخیدا بە توێژینەوە پراكتیكی و ئەزموونییەكان لە بواری توێژینەوەی كۆمەڵایەتی، بە تایبەتی لە بەكارهێنانی میتۆد چەندییەكان، بەشێوەیەك چابین پێیوایە(٨٣) چارەسەركردنی چەندایەتی یارمەتی توێژەری كۆمەڵایەتی دەدات لە مەودای فرەیی دیاردە كۆمەڵایەتییەكان و خەسڵەتە هاوبەشەكانی تێ بگات، چەندین ڕێسای تازە دانرا بۆ دیزایینكردنی ئەزموونی، هەروەها چوارچێوەی ئەزموونەكان بەرفراوان كرا بۆ ئەوەی سەرجەم بوارە كۆمەڵایەتییەكان لە خۆبگرێت.

هەر لە سەرەتای سییەكانەوە چەندین دەنگ بەرزبۆتەوە و هۆشداری دەدات لە قوڵبونەوە لە شتی پراكتیكی یاخود ئەزموونی لە توێژینەوەی دیاردە كۆمەڵایەتییەكاندا، لەو سۆنگەیەی كە توێژینەوەی ئەزموونی پەتی بۆ دیاردەكان لە ڕەهەندە مێژووییەكەی ڕووتدەكاتەوە بە تایبەتی ڕەهەندە مرۆییەكەی، پارسۆنز داوای پێویستی بەستانەوەی سیستەمی تیۆری و

---

٨٢- طيب تيزيني، على الطريق الوضوح المنهجي، بيروت، دار الفارابي ١٩٨٩، لا ٧.

83- Chapin, F. S. Experimental, Designs in sociological Reserch, Harper and row new York, 1947., p 92.

چەمکە کارڕایەکان (ئیجرائییەکان)ی دەکرد، بیرۆکەکەی لەسەر ئەوە وەستاوە کە سیستەمی تیۆری دەبێت تواناکان لەبەرچاو بگرێت لە چوارچێوەی توخم و ئیجرائییە ڕەسەنەکاندا، هەروەك هێواش وایە چەند وتەیەکی تیۆریمان بەدەست بکەوێت کە بە خێرایی و بە ڕێکاری تێبینیکردن بەهای ئەزمونیمان پێی بدات بۆ گۆڕاوە پەیوەندیدارەکان. لە هەندێك کایەی کۆمەڵایەتی زۆر دەگمەندا دەکرێت لەمە نزیك ببینەوە، بەڵام ئەوە دێتەئاراوە بە هەوڵ بۆ پەرەسەندنی لایەنی تیۆری و بەدیهێنانی ڕێکاری ئەزموونی تازە و تێبینیکردن[٨٤].

هەرچی میرتۆنە، پێیوایە جەختکردن لەسەر پرسی میتۆدی ڕەنگدانەوەی ماندوبوونی زانستێکە کە هێشتا پێنەگەیشتووە، هەروەها بانگەشەی کۆ کردنەوەی میتۆدە تیۆری و مەیدانەییەکانی دەکرد، لە کتێبەکەی (تیۆری کۆمەڵایەتی و بونیادی کۆمەڵایەتی)دا (١٩٥١) دەڵێت (نموونەی ئەو تیۆردانەرە کۆمەڵایەتیە ،کە لە ئاسمانی ئەو هزرانەدا دەفڕێت ڕووداوەکان پیسیان نەکردووە بە هەمان خێرایی بەسەرچووە کە دووچاری هەر توێژەرێك دەبێت چەکی دەستی لاپەڕەیەکی رسیارنامەیە ، خەریکی ئامارگەلێکی دابڕاوی بێ مانایە)[٨٥].

ئەو ترسە لە پراکتیزەکردنی میتۆدی ئەزموونی –پراکتیکی ،هەر زوو لە لایەن ئۆگۆست کۆنتەوە ئاماژەی پێکراوە، بەشێوەیەك دەڵێت (ناکرێ

٨٤- احمد القصير، منهجية علم الاجتماع، القاهرة ١٩٨٥، لا ١١٩.

٨٥- احمد القصير، هەمان سەرچاوە، لا ١١٥_١١٦.

توێژینەوە لەسەر میتۆد بکەین بە دابڕاوی لەو توێژینەوانەی تییایاندا ئەم میتۆدە بەکار هاتووە، ئەگەر ئەنجامیشماندا، جگە لە توێژینەوەیەکی مردوو هیچی تر نیە توانای چاکردنی ئەو زەینەی نیە کە سەرقاڵییەتی ،ئەوەی دەکرێت لە بارەیەوە قسەی لەسەر بکەین بە گوتەیەکی واقعی لەوە تێناپەڕێت کە لە چرکە ساتی دەستکردن بە ئەزمونەکە گوتراوە ،گشتاندنە زۆر ئاڵۆزەکان هیچ کاریگەریەکیان لەسەر سیستەمی بیرکردنەوە نابێت ).

لێرەوە کۆنت حەزی دەکرد هەردوو میتۆدی تیۆری و ئەزموونی لە هەمان کاتدا بە کاربهێنێت، واتە گرنگی دەسپێکردن لە واقیعەکان بۆ پرەنسیپەکان و لەپرەنسیپەکانەوە بۆ واقیعەکان لە جارێکی دیکەدا.

بۆردیۆ و هاوبیرەکانی جەخت دەکەنەوە لەسەر وتەکانی کۆنت، دوای ئەوەی بانگەشەکارانی میتۆدی ئەزموونی ڕەخنەی لێ دەگرن، ئەو پێیوایە نابێت ئێمە کەرەستەیەك لە کەرەستە چەمکیی و تەکنیکیەکان فەرامۆش بکەین کە هێز و وردی بە پرۆسەی ڕاستکردنەوەی ئەزموون دەبەخشێت[٨٦].

لێرەوە گرنگە دوو جۆر پێکەوە کۆبکەینەوە، توێژینەوەی پراکتیکی، یاخود مەیدانی کە پێویستی بە چوارچێوەی تیۆری هەیە بۆ ئەوەی لەسەری بڕوات. هەروەها ئەنجامەکانی توێژینەوەی مەیدانی لە چوارچێوەی تیۆری دادەڕێژرێت بۆ ئەوەی لە خزمەتی توێژەرانی دیکە و کۆمەڵگا بەکاربهێنرێت. ناکرێت توێژینەوەی تیۆری لە بۆشایی بخولێتەوە و لە واقیع دوور

٨٦-

بکەوێتەوە، چونکە وەك لە پێشوتر باسمان کرد تیۆری زانستی ناتوانێت مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع جێگیر بکات، لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان تیۆر و مەیدان پەیوەندییەکی دیالێکتیکییە و هەریەکەیان ئەویتریان دەوڵەمەند دەکات. پیاوی مەیدان ناتوانێت توێژینەوەی واقیع بکات بێ ئەوەی پەنا بۆ وێنای تیۆری بەرێت تاوەکو لە دیاریکردنی بابەتی توێژینەوە یارمەتی بدات، لە لایەکی دیکە بتوانێت خۆی دووربخاتەوە لە تێکەڵبون و چوونە ناویەکی شتەکان[87].

هەروەها هەندێکی دیکە هەن جیاوازی لە نێوان میتۆدەکانی توێژینەوە و دەروازە میتۆدۆلۆژیاکان دەکەن ، وەك پێناسەمان کرد میتۆدلۆژیا بریتییە لەو ڕێگایەی کە بە هەقیقەت دەگەین بە بەکارهێنانی کەرەستەی مەعریفی تازە، واتە تەکنیکێکە بۆ توێژینەوە. هەرچی دەروازەی میتۆدۆلۆژیە، یاخود چوارچێوەی میتۆدلۆژییە، هەمەکیترە و مەبەست لێی ڕێسا و نەخشە بەکارهاتووەکانە لە ڕوانین بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان[88].

محەمەد عەلی ئەم دەروازانە بۆ سێ دەروازەی سەرەکی دابەشدەکات، ئەوانیش:

أ. دەروازە کلاسیکیەکان، ئەوەش دابەشدەبێت بۆ: ئاڕاستەی پەرەسەندنی مێژوویی، ئاڕاستەی بەراوردکاری و ئاڕاستەی شێوەیی یان وێنەیی.

---

٨٧- بورديو و اخرون، حرفة علم الاجتماع، ترجمة نظير جاهل، بيروت دار الحقيقة ١٩٩٣، لا ٦.

٨٨- عبدالكريم نزار، (علم الاجتماع في كتب التدريس_ تحليل نقدي) مجلة مستقبل العربي عدد ١٤٦، بيروت، لا ٩٩.

ب. دەروازەی خـودی، لەسـەر بنـەمای تیـۆری تێگەیشـتن وەسـتاوە وەك پرۆسەیەکی مەعریفی کە ناکرێت دەستبەرداری بین.
ت. دەروازەی بابـەتی، لەسـەر بنـەمای شـارەزایی واقیعـی دروسـتدەبێت کـە سەرچاوەی زانیارییەکانە لە تەواوی لقەکانی زانستدا[٨٩].

هەرچـی محەمـەد جەوهـەریی و ئـەوانیترن ئـەوا جیـاوازی لـە نێـوان چـەندین ئاراستە یاخود چوارچێوەی میتۆدۆلۆژی دەکەن ، ئەوانیش:

أ. ئاراستەی مێژوویی: کـە سـەرەتا لـە نووسـینی کۆمەڵناسـە پێشـڕەوەکان بەدەرکەوت. ئاڕاسـتەی بـەراوردکردن، کـە دۆرکهـایم بانگەشـەیی بـۆ دەکـرد، پێیوایە ئەم میتۆدە تاکە ڕێگایەکـە بـۆ سـەلماندنی ئـەوەی کـە دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی هۆکـاری دروسـتبونی دیاردەیـەکی دیکەیـە. ئەمـەش خـۆی دەبینێتەوە لە پشکنینی حاڵەتێك کە ئەو دیاردەیە بـوونی هەیـە و لـە چـەند حاڵەتێکی دیکە بوونی نییە، ئەمەش تاوەکو بەهۆی بەراوردکردنی ڕایەڵەکانی پەیوەندی نێوانیان ئاشکرا بکرێت.
ب. ئاڕاسـتەی ئەرکگـەری: کـە وەك پەرچـەکردارێك هـات بـۆ ئاڕاسـتەی پەرەسەندگەری، لایەنگیرانی ئەو تیۆرە توێژینەوەی ڕۆڵـی سیسـتەم دەکـەن لە پاراستنی کۆمـەڵگا و مانـەوەی بـە چاوپۆشـین لـە ئەندامـەکانی، هـەروەها

٨٩- بەو مانایەی کە دەبێت جیاوازی لە نێوان دوو ئاست بکەین لە پێناسەکردنی میتۆد، ئاستێکیان میتۆدۆلۆجییە کە لایەنی تیۆری یان زانیستی میتۆدەکانە، ئەویتریشیان ئاستی میتۆدە، کە لە بواری توێژینەوەکەمان نزیکترە و مەبەست لێی ڕێگایە، لەگەڵ ئەو پرۆسە ئیجرائی و تەکنیکانەی کە ڕێگا بۆ توێژەر ڕۆشندەکات لە پرۆسەی توێژیەوە و لە پێشوشدا ئاماژەمان پێمە کردووە.

ئەوان ئەو میتۆدە توێژینەوە دەکەن کە بەهۆیەوە بونیادی کۆمەڵایەتی بوونی هەیە و تەواو دەبێت بۆ ئەوەی یەکێتی کۆمەڵگا بپارێزێ وەك سیستەمێکی هەمەکی، یاخود بونەوەرێکی ئۆرگانی[٩٠].

ت. ئاراستەی وێنایی، یاخود شێوەیی: لە ئەڵمانیا پەرەی سەند لەسەر دەستی جۆرج زیمێل، سروشتی کارکردنی ئەو ئاراستەی بریتییە لە توێژینەوەکردنی شێوەی پەیوەندی و گروپەکان و شێوازەکانی کارلێکی کۆمەڵایەتی، بەوپێیەش کە وێنە جیاوازە لە ناوەڕۆکە مێژووییەکەی، لێرەوە مەبەست لە وێنە ئەو توخمەیە کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەستەبەر دەبێت و خەسڵەتی سەقامگیری ڕێژەیی وەردەگرێت، شێوەیەکی جۆری جیاواز لە ناوەڕۆك وەردەگرێت کە بەردەوام دەچێتە ژێر باری گۆڕانی بەردەوام.

پ. ئاراستەی زانستی تازە: ئەو ئاراستەیە چەندین شێوەیان هەیە، کۆمەڵێك زانای کۆمەڵناسی چەمکی زانستی پەتی تەبەنی دەکەن و هەوڵدەدەن بیکەن بە چەمککەلێکی کۆمەڵایەتی، گروپێکی دیکەیان هەوڵی دروستکردنی فیزیای کۆمەڵایەتی دەدات لەسەر بنەما هاوشێوەکانی زانستی سروشتی، گروپی سێیەمیش توێژینەوەی ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا دەکات بە گوێرەی نموونەی ماتماتیکی ئاماری[٩١].

لە لایەکی دیکەوە هەڵە و تێکەڵییەك ڕوو دەدات ئەوکاتەی پۆلێنکردن بۆ میتۆدەکانی توێژینەوە ئەنجام دەدەن، بەشێوەیەك شێواز و جۆرەکانی

---

[٩٠]- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨١ و دواتر.

[٩١]- ئەوەی لێرەدا جەوهەری بە ئاراستە یان چوارچێوەی دادەنێت ئەوا ئەوانیتر ئینجا چ ئاراستەی مێژوویی یان بەراوردکاری یان ئەرکگەری بێت بە میتۆدی دادەنێن و لە دەروازەی داهاتوو بە وردەکاریەوە باسی لێوەدەکەن.

توێژینەوە لەگەڵ میتۆدەکانی توێژینەوە تێکەڵ دەبێت، ئەوەی یەکەمیان لەسەر بنەمای ئامانج لە توێژینەوە دروست دەبێت، بەمپێیەش بە نەرمی و فراوانی جیا دەبێتەوە، وەك دابەشکردنی توێژینەوە بۆ توێژینەوەی کەشفی و توێژینەوەی وەسفی، توێژیەوەگەلێك کە گریمانەی هۆکارگەرایی و چەندان شێوەی دیکەش تاقیدەکەنەوە.

هەرچی میتۆدەکانی توێژینەوەیە وردتر و دیاریکراوترە، بەشێوەیەك دابەشکردنەکە لەسەر بنەمای ئەو شێوازەیە کە توێژەر دەیگرێتە بەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی، لێرەوە توێژەر لە توێژینەوەی وەسفی پەنا بۆ میتۆدێك یاخود زیاتر لە میتۆدێك دەبا کە سوودی هەیە بۆ ئەم جۆرە توێژینەوەیە.

جێگای سەرنجە هەندێك نووسەر بە وردی جیاوازی ناکەن لە نێوان میتۆدی توێژینەوە لە لایەك و بەڕێوەبردنی توێژینەوە لە لایەکی دیکە، بەشێوەیەك دەبینین ئاماژە بۆ تێبینیکردنی ڕاستەخۆ دەکەن وەك میتۆدێکی تایبەت، هەندێکی دیکەش قسە لە بارەی میتۆدی چاوپێکەوتن و میتۆدی پرسیارنامە دەکەن، کەچی ئەوانە تەنیا چەند ئامرازێکی میتۆدین و لە خزمەت توێژینەوە بەکاردەهێنرێن. ئەگەر میتۆد ئەو شێوازە بێت کە توێژەر دەیگرێتە بەر بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیاڕ و گریمانانەی کە کێشەی توێژینەوە دەیوروژێنێت، واتە ئەرکی میتۆد وەڵامانەوەی ئەو پرسیارەیە کە چۆن توێژەر کێشەی توێژینەوەکەی چارەسەر دەکات. ئامرازەکانی میتۆد ئەو کەرەستانەن کە

توێژەر پەنایان بۆ دەبات بۆ کۆ کردنـەوەی داتـای پێویسـتی پەیوەسـت بـە بابەتی توێژینەوە، بە مانایەکی دیکە کەرەستە بریتییە لە وەلامدانەوەی ئـەو پرسیارەی کە چۆن توێژەر کێشەکەی چارەسەر دەکات(٩٢)؟

بەشێوەیەکی گشتی هـەموو توێـژەرێك ئـازادی هەڵبـژاردنی ئـەو میتـۆد، یـان میتۆدانەی هەیە کە پێیوایە بەتواناترە لە گەیانـدنی بـە هەقیقـەت، پرۆسـەی ئاشـکراکردن و کـۆ کردنـەوەی داتـا پێوسـتی بـۆ ئاسـان دەکـا لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی کێشـەی توێژینەوەکـەی و دەرچـوون لـە ئەنجامـە چاوەڕوانکراوەکان.

هەرچـی سـەبارەت بـە جـۆر و پۆلێنـەکانی میتۆدەکـانی توێژینـەوەی کۆمەلایەتییـە، ئـەوا فرەجـۆرن، بـەڵکو دەگـۆڕێن بـە پێـی هـەر نووسـەر و توێژەرێك، وێڕای ئەوەی ئێمـە تـەنیا چـەند میتـۆدی تیـۆری بـاس دەکـەین، بـەلام هەنـدێك بایـەخیش بـە میتۆدەکـانی توێژینـەوەی ئـەزموونی، یـاخود مەیدانی دەدەین، بەو پێیەی کە کۆمەڵگا و دیـاردەی کۆمەلایـەتی وا دەکـات بایەخدان بـە لایـەنی تیـۆری لـە تێگەیشـتنی واقیـع و ڕاڤـەکردنی پێکهاتـە و پێشبینیکردنی ئاڕاستەکەی کورت بهێنێت.

تەنانەت لەسـەر ئاسـتی پـۆلێنکردنی میتۆدەکـانی توێژینـەوەی کۆمەلایـەتی زانستی _ئـەزمونی، پۆلێنـەکانی نووسـەرە عەرەبـەکانیش جیـاوازە، ئێسـتا هەندێکیان دەخەینە ڕوو:

---

92- Simmel George the dyad and Trais, Sociologiacal theory (ed) coser etal. The macmillen co. London 1969.

**یەکەم:** حەسەن ساعاتی لە کتێبی (دیزاینکردنی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی) میتۆدەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بۆ دوو میتۆد دابەش دەکات ئەوانیش میتۆدی ئەزموونی و میتۆی تیۆری.

**دووەم:** تەڵعەت عیسا لە کتێبی (توێژینەوەی کۆمەڵایەتی) میتۆدەکان بۆ شەش میتۆد دابەش دەکات ئەوانیش:

١. میتۆدی توێژینەوەی بار.

٢. میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی

٣. میتۆدی مێژوویی

٤. میتۆدی ئەزموونی

٥. میتۆدی ئاماری

٦. میتۆدی بەراوردکاری.

**سێیەم:** عەبدولڕەحمان بەدەوی لە کتێبی (میتۆدەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی) (١٩٦٣) میتۆد دابەش دەکاتە سەر سێ جۆر:

١. میتۆدی بەڵگاندن (الاستدلال)

٢. میتۆدی ئەزموونی

٣. میتۆد گەڕاندنەوەیی

**چوارەم:** لە کتێبی (بنەماکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی) (١٩٧٧) عەبدولباسیت حەسەن میتۆدەکان بۆ چوار جۆر دابەشدەکات ئەوانیش:

١. میتۆدی ڕووپێوی

٢. میتۆدی توێژینەوەی بار

٣. میتۆدی مێژوویی

٤. میتۆدی ئەزموونی

پێنجەم: محەمەد جەوهەری و ئەوانی تر، لە کتێبێکیدا بە ناونیشانی (توێژینەوەی کۆمەڵناسی) (١٩٧٥) باس لە چوار جۆر لە میتۆدەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دەکەن و ئەوانە دەخەنە ڕوو:

١. توێژینەوەی کەشفی و وەسفی، لە نموونەکانی، ڕووپێو و توێژینەوەی بارن.
٢. میتۆدی مێژوویی
٣. میتۆدی ئەزموونی
٤. میتۆدی ئەنترۆپۆلۆژی

شەشەم: هەرچی محەمەد عەلی محەمەدە، لە کتێبی (پێشەکییەك لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی) (١٩٨٢) میتۆەکان بۆ چوار جۆر دابەش دەکات:

١. میتۆدی مێژوویی
٢. میتۆدی وەسفی
٣. میتۆدی ئەزموونی و دڵنیابونەوە لە ڕاستی گریمانە هۆکارگەرایییەکان.
٤. توێژینەوەی بەراوردکاری بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی.

هەرچی سەبارەت بە کتێب و نووسینە خۆرئاواییەکانە، باس لە بۆچوونی دوو نووسەر دەکەین ئەوانیش:

حەوتەم: پۆلێنی ویتنی[٩٣] کە بەمشێوەیە:

١. میتۆدی وەسفی
٢. میتۆدی مێژوویی
٣. میتۆدی ئەزموونی
٤. شێوازی فەلسەفی بۆ توێژینەوە
٥. شێواز پێشبینی بۆ توێژینەوە

[93]- whithny, F. the Elements of Research New York Boston, 1967 p 148.

٦. شێوازی سۆسیۆلۆژی
٧. شێوازی داهێنان

هەشتەم: ئێرمان کۆفلێ لە کتێبی (دەروازەیەکە بۆ کۆمەڵناسی) باس لە چوار جۆری میتۆد دەکات:

١. میتۆدی ئاماری تاکی
٢. میتۆدی مێژوویی بەراوردکاری
٣. میتۆدی ئاماری
٤. میتۆدی وەسفکردنی تایبەتمەندی گەلەکان.

لە پاڵ ئەمانەشدا دەکرێت میتۆدەکان بە گوێرەی پسپۆڕی زانستی دابەش بکەین. بۆ نموونە میتۆدەکانی توێژینەوە لە بواری پەروەردە، میتۆدەکانی توێژینەوە لە بواری سیاسەت، میتۆدەکانی توێژینەوە لە بواری کۆمەڵناسی، میتۆدەکانی توێژینەوە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، میتۆدەکانی توێژینەوە لە بواری ڕاگەیاندن، تێبینی دەکەین کە زۆرینەی میتۆدەکان لە پرەنسیپە گشتییەکان هاوشێوەن، جیاوازییەکانیش تەنیا بەسەر ئەو ڕێکارانە کورت دەبێتەوە کە تایبەتن بە زانستێك بە هۆی تایبەتمەند ئەو دیاردانەی کە جێگای بایەخی ئەو زانستانەن.

بە هۆی دژواری چارەسەرکردنی ئەو ئەنجامانە، ئێمە تەنیا باس لەسەر ئەو میتۆدانە دەکەین:

- میتۆدی شێوازە نمونەییەکان
- میتۆدی بونیادگەری ئەرکگەرایی
- میتۆی ڕووپێووی
- میتۆدی توێژینەوەی بار
- میتۆدی مێژوویی

- میتۆدی شیکارکردنی ناوەڕۆك
- میتۆدی ئەزموونی
- میتۆدی بەراوردکاری

## باسی چوارەم

## سنووری پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگادا

هەروەك لە پێشوتر ئاماژەمان پێکرد میتۆدی زانستی دەستی بە داگیرکردنی جیهانی زانستە سروشتییەکان کرد، پێش ئەوەی بێتە بواری زانست مرۆڤایەتییەکان، چونکە دیاردە سروشتییەکان بە یەکێك لە تەحەدایە گەورەکان دادەنرێت کە ڕووبەڕووی مرۆڤ بۆتەوە و هەوڵی تێگەیشتنی داوە، هەروەك دیاردە سروشتییەکان بە جێگیری و بێ لایەنی لە ئارەزووەکانی مرۆڤ جیا دەکرێنەوە و ئەمەش وای لێدەکات مرۆڤ توانای زیاتر بێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ مەرج و پێداویستییەکانی مەعریفەی زانستی.

لە سەرەتادا زاناکان هەڵوێستێکی گومانداڕانەیان هەبوو لە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە بواری زانستە مرۆڤایەتییەکان لەو ڕوانگەیەی کە سروشتی مرۆیی دیسپلینیکردن و بەژمارەکردن و ئەزموونکردن قبوڵ ناکات، کەچی ئەو دەستکەوتانەی کە میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردن و تێگەیشتنی کۆمەڵگا بە دەستی هێنانەوە هەڵویستی گومانداڕەکانی بێ هێز کرد و جەختی لەسەر توانای پراکتیزەکردنی ڕێساکانی میتۆدی زانستی کرد لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا، بەڵام بەهەمان شێوازی زانستە سروشتییەکان

نا، دانیان بەوەدانا کە هەندێك سنوور هەیە دەبێت لە کاتی پراکتیزەکردنی ڕێساکانی میتۆدی زانستی لەبەرچاو بگیرێت.

لە پێشودا لە کاتی باسکردنی مەعریفەی کۆمەڵایەتی زانستی، باسمان لە هەندێکیان کردووە، چەمکەکانی گشتاندن و وردی و پێشبینیکردن و تیۆر و یاساکان لە زانستە مرۆڤایەتییەکان بە هەمان شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت وەك لە زانستە سروشتییەکان باوە.

پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ڕووبەڕوی دوو تەحەدا دەبێتەوە، یەکەمیان پەیوەستە بە سروشتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بەمپێیەش سروشتی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، دووەمیش، پەیوەستە بە هەڵوێستی توێژەر لە بابەتی توێژینەوەکەی، هەروەك ئەو بابەتیبونەی کە لە کاری پۆزەتیڤی و ئەزموونی پەیڕەوکراوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی زۆر توند بۆتەوە لە لایەن چەند قوتابخانەیەکی هزری، ئێستاش ئاماژە بۆ گرنگترینیان دەکەین:

## یەکەم: تایبەتمەندی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بابەتی توێژینەوە

زانستە کۆمەڵایەتییەکان تازە دروستبوون، بەمپێیەش بەلانسی لە بایەخدانی زانستی زۆر کەمە، ئەگەرچی لە سەردەمی یۆنانی کۆندا بە تایبەت لای ئەفلاتون و ئەرستۆ مەعریفەی زانستی بە تایبەتی لە بواری سیاسەت زۆر پێشکەوتوو بوو، چونکە تا ئاستێکی زۆر لە چوارچێوەی مەعریفەی

فەلسەفی دەخوێندرا، بە پێچەوانەی زانستە حەقەکان کە مێژوویەکی درێژ و بەلانسێکی مەعریفی زانستی زۆر گرنگیان نییە. تازەیی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بۆ تازەیی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ناگەڕێتەوە، ئەمەی دوایی بە قەد کۆنی مرۆڤ لەسەر زەوی کۆنە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کە وای لە هەندێك بیرمەند کردووە خۆیان بپارێزن لە بەکارهێنانی چەمکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوکاتەی پرسیار لە کلۆد لیڤی شتراوس کرا ئایا زانستە مرۆڤایەتییەکان بە زانست دادەنێت؟ وەڵامی دایەوە و گوتی، نازانم ئەگەر پێویست بکات بڵێین بەداخەوە، بەڵام بە هەرحاڵ دوورە لەمە، زانستە سروشتی و فیزیاوییەکان گەیشتونەتە ئاستێك کە بتوانن ژمارەیەك گۆڕاو دابڕن لە ریزی دیاردە ئاڵۆزەکان، هەرچی ئێمەی پیاوانی زانستە مرۆڤایەتییەکانین، هێند گۆڕاوامان هەیە کە ناکرێت بەراودیان بکەین. لەلایەکی ترەوە زانست توێژینەوەی بابەت دەکات، دژواریشە مرۆڤ قبوڵ بکات ببێت بە بابەت بۆ خۆی، ئەمەش بە دەستبەرداربوون لە بونی خۆی وەك بونەوەری ئەکتیڤ چونکە بابەتیشە لە هەمان کاتدا![٩٤].

ئەگەر کەسێك هەبێت گومانی هەبێت لە ئەگەری ملکەچکردنی کۆمەڵگا بۆ مەرج و دیسپلینەکانی زانست، ئەوا واباشترە گومان بکات لە پراکتیزەکردنی میتۆدەکانی زانست، ئەمەش لای پۆپەر دەبینینەوە، کە پێیوایە هەوڵەکانی

---

٩٤- کلود لیفی شتراوس في مقابلة مع مجلة الاکسبرس، ١٩٧١ وەرگیراوە لە: محمد سبیلا (اعداد و ترجمة)، حوارات في الفكر المعاصر، الرباض، لا ١١.

زانایـانی بـواری کۆمەڵایـەتی بـۆ پراکتیزەکردنـی میتۆدەکـانی زانسـتە سروشتییەکان لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان هیچ سەرکەوتنێکی بەخۆوە نەبینیوە، جگە لـە سـەرکەوتنێکی سـادە نـەبێت لـە بـواری ئـابوری، پۆپـەر دەڵێت: ئەوکاتەی ئەو شکستە بوو بە بابەتی گفتوگۆ، خەڵك پرسیاریان کـرد لـەبارەی توانـای پراکتیزەکردنـی میتـۆدە سروشـتییەکان لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکان، پرسی ئایا سوربونی سەرکەشانە لەسەر پراکتیزەکردنیـان هۆکارێك نییە بۆ حاڵەتی ئێستای ئەو زانستانە، کە دۆخێکە جێگای داخێکـی زۆرە[٩٥]؟

پۆپەر پێیوایە ئەوەی وادەکات نەکرێت میتۆدەکانی زانستە سروشتیەکان لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا پراکتیـزە بکرێـت جیـاوازی زانسـتە سروشتییەکانە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان، یاسا و گشـتاندن و ئـەزمونکردن و پێشبینیکردنی ورد و بابەتییبون، چەند کاروبارێکن شـێوەیەکی جیاوازیـان هەیە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لەمەی دوایـی یاسـاکان بـە بونیـادە مێژووییەکەیان جیادەبنەوە، لەپاڵ دیزانینییان کە توانای کەمترە، هـەروەها ئەزمونکرن تیایدا دژوارترە و پێشـبینیکردنیش ئـەنجامی مسـۆگەر نـادات بـە دەستەوە[٩٦].

دەکرێـت تایبەتمەنـدی دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان لەمـەی خـوارەوە کـورت بکەینەوە

٩٥- کارل بوبر، سەرچاوەی پێشو، لا ٩.

٩٦- کارل بوبر، سەرچاوەی پێشو، لا ١٦ ە دواتر

## أ. ئاڵۆزی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و فرەیی گۆڕاوەکانی

دیاردە کۆمەڵایەتییەکان پەیوەستن بە تاك و گروپەکان، ئەوانەش لە نێو خۆیاندا جیاوازن لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سروشتی، هەروەها ئەوان لە هەمان کاتدا دەکەونە ژێر کایگەری ئەو بارودۆخە کولتوورییەی کە لە کۆمەڵگادا باڵادەستە، وەك نەریت و خو و سیستەمی سیاسی و پێگەی کۆمەڵایەتی، لە پاڵ کاریگەرییەکانی ژینگە و کەشوهەوا، لە پاڵ ئەوانەشدا کردەی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە و دژوارە بڕیاربدەین لەوەی کە یەکێك لەو گۆڕاوانە هۆکارن، یاخود گۆڕاوی سەرەکین لە ڕوودانی کردەی کۆمەڵایەتی.

وەڵامدانەوەی ڕەخنەکان لە بارەی ئەو ئاستەنگە لە بەردەم پراکتیکردنی میتۆدی زانستی، بۆ تازەیی مامەڵەکردن دەگەڕێتەوە لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی زانستی، کەڵەکەبوونی مەعریفە و زۆربونەی بەریەککەوتنی لەگەڵ کۆمەڵگادا بە هۆی کەرەستەی زانستی بەسە بۆ زیادبونی تێگەیشتن لە کۆمەڵگا و دیاردەکانی، تێگەیشتن و ڕوونی دیاردە سروشتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی درێژ کە چەندین سەدە دەبێت لەگەڵ ئەو دیاردانە.

## ب. دژواری تێبینیکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان

ئەوانەی گومانیان لەسەر پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی هەیە لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا، پێیانوایە ڕێساکانی ئەو میتۆدە ئەوەیە کە

دەتوانێت دیاردە دیاری بکات و بیخاتە ژێر تێبینکردن، مەبەست لە تێبینیکردنیش بریتییە لە تێبینیکردنی ڕاستەوخۆ.

ناتوانین توێژینەوەی دیاردەیەك بکەین ئەگەر ئەو دیاردە دیاری نەکەین و توانای تێبینیکردنمان نەبێت لە هەموو قۆناغەکانی پەرەسەندنیدا. لە زانستە سروشتییەکاندا دەبینین تێبینیکردن ئاسانە، دیاردەیەك بەدرێژایی کات خەسڵەتەکانی خۆی دەپارێزێت، هەمان خەسڵەتی دەمێنێت ئەگەر گۆڕانیشی بەسەردا بێت، چونکە ئەو گۆڕاوانە چاوەڕوانکراون یاخود پێشبینیکراوان و هۆکارەکانی دەزانرێت.

هەرچی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانە، کایەی تێبینکردنی زانای کۆمەڵایەتی دژوارترە، زۆرجا دیاردە کۆمەڵایەتییەکە بەهایی و مەعنەوییە، هەروەها توێژەر ناتوانێت ئەو دیاردەیە هەست پێبکات کە لە ڕابردوو ڕوویداوە، ناتوانێت بە ئەزموون شتێك دووبارە بکاتەوە کە لە پێشتر ڕوویداوە، چونکە دیاردەی کۆمەڵایەتی یەك جار ڕوودەدات و دووبارە نابێتەوە، بەدوایەکداهاتنی دیارە کۆمەڵایەتییەکان مانای هاوشێوەبونی تەواویان نییە. هەروەك مرۆڤ کە جەوهەری دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە دەتوانێت کردە و ڕەفتارێك ئەنجام بدات، کە مەرج نییە گوزارشت بێت لە بۆچون و ئاراستە عەقڵییەکەی. بەمپێیەش دیاردە گوزارشتێکی ڕاستەقینە نییە لە بارەی واقیع، مرۆڤ تەنیا جیا نابێتەوە لە بونەوەرەکانی دیکە بەوەی کە بونەوەرێکی عاقڵ و قسەکەرە، بەڵکو بونەوەرێکی درۆزنیشە.

هەروەك تێگەیشتن لە واقیع، یاخود لە دیاردەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی جیاوازە، تەنانەت بۆ یەك کەسیش جیاوازە لە بارودۆخێکەوە بۆ یەکێکی دیکە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە دیاردەی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی فەوزەوییە، بەڵکو مانای جۆراوجۆرییەتی، تێبینیکردنیشی دژوارترە [٩٧].

ت. دژواری ئەنجامدانی ئەزموون لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا

خستنەژێر تاقیکردنەوەی دیاردە بۆ دڵنیابوون لە دروستی گریمانە، مەرجێکە لە مەرجەکانی میتۆدی زانستی. ئەزموونیش مەرجی خۆی هەیە، ئەویش بریتییە لە توانای توێژەر لە دیاریکردن و کۆنترۆڵکردن و دیسپلینکردنی دیاردەی لێتوێژراو، کۆنترۆڵکردنی هەموو گۆڕاوە بەکاریگەرەکان، کەچی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دژوارە دیاردەی کۆمەڵایەتی بخەیتە ژێر ئەزموونەوە، چونکە پەیوەستە بە ڕەفتار و هەستی مرۆڤەوە، ئەو کارانەش دژوارە کۆنترۆڵکردنیان، مەحاڵە توێژەر داوا لە مرۆڤ بکات کردەیەکی کۆمەڵایەتی دووبارە بکاتەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەزموون لەسەری، هەروەك دیاردەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت لە ماوەی کاتی تێبینیکردن و ئەوکاتەی توێژەر دەیەوێت بەشێوەیەکی زانستی توێژینەوەی بکات.

میتۆدی زانستی لەسەر ئەو بیرۆکەیە وەستاوە کە کاروبارە هاوشێوەکان لە بارودۆخی هاوشێوە ڕوودەدەن، ئەمەش ناکرێت پراکتیزە بکرێت بەهۆی

---

٩٧- بڕوانە: قانصوة، الموضوعية في العلوم الانسانية، القاهرة، ١٩٨٠، لا ٤٧.

تاقانەیی دیاردەی کۆمەڵایەتی و دژواری دووبارەبونەوەی بە هەمان شێوە. لە پاڵ ئەمەش ئەزموون وا لە توێژەر دەکات توخمێك یاخود چەند توخمێك لە هەڵوێستە گشتییەکە دابڕێت و ئەو توخمە بخاتە ژێر تاقیکردنەوە، ئەمەش دژوارە بەسەر دیاردە کۆمەڵایەتییەکان پراکتیزە بکرێت بەهۆی ئاڵۆزی و تێکچڕژانی گۆڕاوەکان، یاخود ئەو فاکتەرانەی کەپێکی دەهێنن.

وەڵامی ئەو ڕەخنەیە دەدرێتەوە بەوەی کە مەرج نییە ئەزموون بە هەمان تێگەیشتنی زانستە سروشتییەکان بێت، بەڵکو دەکرێت ئەزموون لە مێژوو وەربگیرێت، یان لە ڕێگای بەراوردکردن لە نێوان کۆمەڵگاکان. هەروەك دەکرێت میتۆدی ئەزموونی لە چەند حاڵەتێك بەکاربهێنرێت، بێئەوەی ئەنجامەکان بەهەمان وردی ئەنجامەکانی ئەزموونەکانی زانستە سروشتییەکان بێت(٩٨).

پ. ناوردی یاسا و تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان

ئەو مەعریفەیەی کە لە ئەنجامی توێژینەوە پێی دەگەین بە هەدەرناچێت، بەڵکو بە هۆیەوە یاسا و تیۆر دروستدەبێت و یارمەتی پێشبینکردن دەدات و دیاردە کۆمەڵایەتییە هاوشێوەکانی پێ ڕاڤە دەکرێت، بەڵام بەرهەڵستکارانی پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە بواری توێژینەوەی کۆمەڵگا پێیانوایە

٩٨- اوسكار لانجة، الاقتصاد السياسي، الجزء الاول بيروت ١٩٧٣.

گەیشتن بە یاساگەلێك کە هاوشێوەی وردی یاسا و تیۆرەکانی زانستە سروشتییەکانە، بۆ چەند کێشەیەك دەگەڕێننەوە:

١. ناسەقامگیری کۆمەڵگا لە باری ئاسایی خۆی، گۆڕانکاری و پەرەسەندن لە نەریتی ژیانی کۆمەڵایەتیین، ئەمەش مانای نەبوونی یاساگەلێکی دوورمەودایە کە بەکەڵك ئەوە بێت ببێتە بنەمایەك بۆ گشتاندنی دوورمەودا (یاسا و تیۆر)، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەمان بۆ یاسا و تیۆری زانستی ڕێژەیی کردووە کە شایانی گۆڕانن.

٢. ملکەچنەبوونی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بۆ پرەنسیپی حەتمییەت، کە دیاردە سروشتییەکان بۆی ملکەچ دەبن، چونکە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان مرۆڤ تەوەرییانە، ئەمەی دوایی ئازادی هەیە لە هەڵسوکەوتی سەربەخۆ، ئەمەش ماوە ماوە ڕەفتاری خۆی دەگۆڕێت، بەگوێرەی ژینگە و خودی خۆی، کە جۆراوجۆرن، بۆیە مەحاڵە پێشبینیکردنی ڕەفتاری مرۆڤ و دانانی پرەنسیپی گشتی و یاسا و تیۆر بۆ ئەو ڕەفتارە.

٣. مرۆڤ عەقڵ و ئیدراکی هەیە، بۆیە دەتوانێت پێش ڕووداوەکان بکەوێت و شتە پێشبینیکراوەکان پوچەڵبکاتەوە یان ڕوودانی دووپاتبکاتەوە، بۆیە ئەگەر بڵێیت ئەو کاڵایەی کە هەیە دوای یەك مانگ لە بازاڕ نامێنێت، خەڵك بەخێرایی دەچن دەیکڕن و لە بازاڕدا نامێنێت[٩٩] بەڵام ئەمە بۆ مرۆڤ ئەستەمە ڕاست بێت.

---

[٩٩]- صلاح القنصوة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٧٠.

## دووەم: هەڵوێستی بابەتییانەی توێژەر لە بابەتی توێژینەوەکەی

پەیوەستە بە جۆری دووەمی ئەو ئاستەنگانەی کە دروست دەبێت لەگەڵ پرۆسەی پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە توێژینەوەکردنی کۆمەڵگادا، ڕەنگە دووری بخاتەوە لە بابەتیبوون و وای لێدەکات بەدوای ڕەمەك و بەرژەوەندی و بەهاکەی بڕوات، واتە لایەنی خودی لە پرۆسەی توێژینەوە واتە دەبێت بابەتی بێت. بابەتیبوون لە پۆزەتیڤیزم دروستدەبێت، کە لە پێشووتر باسمان کرد تەنیا گرنگ بە واقیع دەدات و خودی مرۆیی کارلێککردوو لەگەڵ واقیع فەرامۆش ناکات، ئەوە دژی ئاڕاستەی خودییە.

بەهۆی ئەوەی توێژەر بەشێکە لە دیاردە، بۆیە تێبینیکردن پێی کاریگەر دەبێت و کاریگەری لێی دەکات، بەهۆی پابەندبوونی بە واقیعی کۆمەڵایەتی ئینجا چ لەسەر ئاستی بارودۆخی خێزانی، یاخود سێکسی، یاخود بارودۆخی چینایەتی، یاخو کۆمەڵایەتی، یاخود ئینتیمای نەتەوەیی، یاخود تائیفی، یاخود هزری سیاسی و کۆمەڵایەتی بێت، هەموو ئەوانە سنوور بۆ هۆشیاری، یاخود بێلایەنی بە مانا زانستییەکەی دادەنێت.

مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەیلی هەیە بۆ خستنەپاڵی دۆخی کۆمەڵایەتی، یاخود بەرژەوەندییەکانی بەسەر هزرەکانی، بەمەش ئەنجامی توێژینەوەکەی بێلایەن دەبێت، کە ڕەنگدانەوەی واقیعی دیاردەی لێتوێژراوە، بەڵکو گوزارشتە لە ڕوانگەی توێژەر بۆ ئەم واقیعە.

بیرمەندە موسڵمانەکان باسیان لە بوونی چەند خەسڵەتێك کردووە کە دەبێت لە کەسی توێژەردا بێت، حەسەن بن هەیسەم (٩٦٥_١٠٣٩)([١٠٠]) دەڵێت ئامانجمان لە هەموو ئەوشتانەی کە کۆیدەکەینەوە و پەیڕەوی دەکەین بەکارهێنانی دادپەروەرییە نەك چون بەدوای ئارەزوو، پشکنین دەکەین بۆ تەواوی ئەو شتانەی کە جیای دەکەینەوە و بەدوای حەق دەگەڕێین و بەدوای ئارەزووەکاندا ناکەوین، (هیچ شتێك بە بەهاتر و باشتر و نزیککتر نییە لای خودا لەم دوو کارە)، لە هەمان بابەتدا بیرۆنی (٣٦٢_٤٤٠)ك دەڵێت: (گەیشتن بە هەقیقەت پێوستی بەوە هەیە کە خود پاك بکرێتەوە لە شتە نزمەکان، یاخود ئەو هۆکارانەی کە مرۆڤ لە ئاست حەق کوێر دەکات، ئەوە نەریتێکی ئاشنا و دەمارگیر و خۆ بە دەرخستنە و پەیڕەوکردنی ئارەزوو و خۆزاڵکردن هاوشێوەی ئەو شتانەیە).

کێشەی بابەتیبوون بۆتە جێگای بایەخی زۆرێك لەو کۆمەڵناس و بیرمەندانەی کە بایەخ بە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەدەن، بۆچونەکانیش بەسەر دوو ئاڕاستە دابەش دەبن، ئاڕاستەیەکیان پێیوایە دەکرێت پابەند بین بە بابەتیبوون بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و ئاڕاستەیەك گومانی هەیە لە توانای پابەندبوون بە بابەتیبون لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان، لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان ئەو دوو ئاڕاستە

[100] دەبێ ئەم بیرمەندە موسڵمانە حەسەنی کوڕی هەیسەم بێت نەك حەسەنی کوڕی هەیم وەکو لەسەرچاوە عەرەبیەکەدا هاتووە ، پێموایە ئەوە هەڵەی چاپە چونکە ساڵی لە دایك بوون مردنەکەشی هەر هی ئەوە (م.ش)

دەگەڕێتەوە بۆ دوو تیۆری جیاواز لە بارەی مەعریفەی زانستی و هەقیقەتی زانستی، کە لە پێشوودا باسمان کرد.

یەکەم: پێیوایە مەعریفەی زانستی بە تایبەتی ئەو تیۆر و یاسایانە هەقیقەتی ڕەهایان هەیە، بەمپێیەش فرەبۆچوونی و هەڵوێست قبوڵی ناکات، بوونی زیاتر لە هەڵوێستێك یاخود تیۆرێك لە بارەی یەك بابەت گومان لە بارەی ڕاستگۆیی و بابەتیبوونی توێژەر بەشێوەیەکی گشتی دروستدەکات. هەرچی تیۆری دووەمە، نزیکترە لە مەعقولییەت کە پێیوایە تیۆری زانستی و تیۆر و یاسا و گشتاندنەکان بەرهەمی توێژینەوەی زانستی و هەقیقەتی ڕێژەیین، یاخود چەند گریمانەیەکە دەکرێت دووبارە چاویان پێدابخشێنینەوە کە ڕوانگەی جیاوازییان هەیە.

لە پێشودا ئاماژەمان پێکرد مەعریفەی زانستی بەو تیۆر و یاسایانەی کە لە خۆی دەگرێت مانای ئەوە نییە کە هەقیقەتی ڕەهای هەیە، بەڵکو هەقیقەتی ڕەها بەردەوام شایانی دووبارە تێڕوانینەوەیە، ئەگەر توێژەر بابەتی بێت مانای ئەوە نییە کە بیرۆکەکان، یاخود ئەنجامی توێژینەوەکەی یەك بێت لەگەڵ واقیع. تەنانەت ئەگەر هزر یەك بێت لەگەڵ واقیعی هەنوکەیی دیاردەیەك لە شوێنێکی دیارکراو، مانای ئەوە نییە کە ئەو هزرە تا ماوەیەکی زۆر یەکە لەگەڵ واقیع، یاخود دەتوانێت هەمان دیاردە لە ژینگەیەکی دیکە ڕاڤە بکات.

ئۆسکار لانجە پێیوایە جیاوازی لە بۆچون سروشتێکی تەواوە لە پەرەسەندنی زانست، ئەمە لە سروشتی دیالێکتیکی مەعریفە سەرچاوە دەگرێت، بەشێوەیەك هزری مرۆیی دروستدەبێت لە میانەی کارلێکی ئاڵوگۆڕ لە نێوان مرۆڤ و اقیعی دەوروبەری، مەعریفە لە میانەی دژایەتی لە نێوان ئەنجامی تێبینی و ئەزموونە تازە و هزر و تیۆرەکانی پێشوو پەرەدەسەنێنێت[١٠١].

بێگومان فرەیی بۆچونەکان دژایەتی نییە لەگەڵ بابەتیبوونی زانستی، بە لایەنگیرییەك یاخود دوورکەوتنەوەیەك لە پێداویستییەکان زانستی دانانرێت، چونکە فرەیی مانای ململانێیە لە پێناو گەیشتن بە هەقیقەت، هەرچی لایەنگیرییە یاخود بابەتیبوونی دژپێکە لەگەڵ مەعریفەی زانستی بریتییە لەو لایەنگیرییەی کە توێژەر لە تێگەیشتنی واقیع لەسەر هەقیقەتی خۆی دووریدەکاتەوە، ئەگەر لە واقیع تێبگات و مەبەستییەتی شێوە و وێنەیەکی جیاواز لە بارەیەوە ببەخشێت.

ئەمەش بەهۆی ئایدیۆلۆژیا یان هۆشیاری ساختەیە، کە بە فراوانی لە لایەن مانهایمەوە باسکراوە.

مانهایم جیاوازی کردووە لە نێوان چوارچێوەی گشتی، یاخود چەمکی بەرفراوانی ئایدیۆلۆجیا لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای هەندەکی، یاخود تایبەت، هەردوو جۆر کار دەکەن لەسەر شێواندنی واقیع و گواستنەوەی وێنەیەکی

[١٠١]- کارل بوبر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦.

ناراست لە بارەیەوە. ئایدیۆلۆجیای گشتی وادەکات لەسەر یەك کەس کورتنەبێتەوە، بەڵکو هەموو کۆمەڵگا، یاخود یەك چین بگرێتەوە، ئەوە گوزارشتە لە بونیادی عەقڵی بیرکردنەوە کە توێژەر بەهێزەوە بەدوای دەچێت و بەسەر ڕەفتار و بیرکردنەوەی زاڵدەبێت و ڕاڤەکردنەکانی ڕەنگرێژ دەکات. شیکردنەوەکانیشی بۆ بابەتی توێژینەوە نەستی دەبێت و لە ژێر کاریگەری ئەو ئایدیۆلۆجیایە دەبێت کە ئینتیمای بۆی هەیە.

هەرچی ئایدیۆلۆژیای هەندەکییە، گوزارشتە لە هەڵوێستێکی هۆشیارانە کە توێژەر وەری دەگرێت و لە میانەیەوە هەقیقەت دەشارێتەوە ئەگەر دداننان پێی دژپێك بێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی، یاخود ئەگەر هەقیقەت لەگەڵ وێنا و ئایدیۆلۆژیای تایبەتی نەیەتەوە، ئایدیۆلۆژیای هەندەکی لەم حاڵەتەدا هەوڵدانێکە بۆ فریودانی خود و ئەوی دیکەش.

بێگومان باسکردنی کێشەی بابەتییبون لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و تەرخانکردنی چەندین کتێب بۆ توێژینەوەکردن، دووپاتکردنەوەی ئەو گفتوگۆیە زۆرەیە کە لای توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان دروستی کردووە، ئەوەش دووپاتدەکاتەوە کە بابەتییبون لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان خۆشەویستێکە مەحاڵە پێی بگەین، چونکە هەر توێژەرێك هەرچەندە بانگەشەی زانستییبون و بابەتیبوون بکات، هەرچەندە پابەند بێت بە ڕێسا توندەکانی میتۆدی زانستی، ئاگایانە یان نائاگایانە بێت دەبینێت گوزارشت

لە واقیع دەکات یان ڕەتی دەکاتەوە، ئەگەر هەڵوێستێکی بێلایەنی لە بارەی پرسێك وەرگرت، خودی بێلایەنییەکەش بۆ خۆی هەڵوێستێکە.

لەم کۆنتێکستەدا پۆپەر ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە چۆن زانای کۆمەڵناسی قورسە بە ڕەهایی پابەند بێت بە بابەتیبوون، چونکە ئەگەر تەنانەت داوای لێبکەین هەقیقەت بڵێت بەوپێیەی کە هەقیقەت پێوەری بابەتیبونە، گوتنی ئەو هەقیقەتە دەبێتە بەشێك لە لایەنگیری، چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەو حەقی گوتووە، بەڵام ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە لە بابەتیبونی زانستی لاینەداوە، ئەگەر پێشبینی شتێك بکات و داهاتو ڕاستی ئەو پێشبینیەی بسەلمێنێت، ڕەنگە بەشێوەیەك کاری کردبێت کە وەك کەس خۆی ئەو ئاڕاستەیەی پێ باش بێت.

ماکس ڤیبەر چارەسەرێکی بۆ ئەم کێشەیە دۆزیوەتەوە لە کتێبی (پیاوی زانست و پیاوی سیاسەت)، جیاوازی کردووە لە نێوان حوکمی بەهایی و حوکمی زانستی، دەرکردنی بەها و دیاریکردنی ئامانجی کۆمەڵایەتی کاری زانای کۆمەڵناسی نییە، ئەمە کاری پیاوی سیاسەتە، ئەگەرچی پیاوی زانست مافی خۆیەتی لە ژیانی ئاسایی ئینیتما و هەڵوێستێکی دیاریکراو هەبێت، کەچی لە چوارچێوەی کاری زانستی لە نێو زانکۆ یان لە چوارچێوەی تیمێکی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لەسەری پێویستە خۆی لە مەیل و حوکمە بەهاییەکان بە دووربگرێت، (وەرگرتنی هەڵوێستێکی سیاسی، شتێکە و

ئەنجامدانی شیکرنەوەی زانستی بۆ بونیادە سیاسییەکان و هەڵوێستی پارتەکان بە تەواوی شتێکی دیکەیە).

لەسەر زانای کۆمەڵناسی پێویستە پابەند بێت بە بابەتییبون کە بریتییە لە وەرگرتنی هەڵوێستێکی بێلایەن لە بەرامبەر سیستەمی بەها، ئەمەش ئەو پرەنیسپەیە کە ڤیبەر پێی دەڵێت خۆ ڕزگارکردن لە بەها(١٠٢).

تاوەکو زیاتر لە مانای بابەتییبون نزیك بینەوە و جیاوازی بکەین لە نێوان لایەنگیری مەبەستدارانەی توێژەر واتە ئەو لایەنگیرییەی کە بەرهەمی کردەیەکی ویستخوزازی توێژەرە بە مەبەستی شێواندنی هەقیقەتێك بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییەکی تایبەت، یاخود تێرکردنی مەیلێکی ئایدیۆلۆجی تایبەت، یاخود هەوڵدان بۆ گرتنەبەری ڕێگایەکی ئاسان لە توێژینەوە، لەگەڵ ئەو لایەنگیرییەی کە پەیوەستە بە سروشتی کۆمەڵناسی، بەوپێیەی کە زانستێکە ئامانجی بەرژوەندی کۆمەلایەتی یاخود ئامانجێکی کۆمەلایەتییە، بەوپێیەش دەکرێت بەرژەوەندی توێژێك یان چینێك یان کۆمەڵگایەك لەسەر حیسابی ئەوانی دیکە بباتە پێشەوە.

لە جۆری یەکەمدا تێبینی هەبوونی لایەنگیری دەکەین و بەوپێیەش دەبێتە هۆی دەرچوون لە بابەتیبوون، کە هەر لە سەرەتای چرکەی یەکەمی توێژینەوە تاوەکو دواقۆناغ، ئەمەش بوونی هەیە لە کاتی دیاریکردنی

١٠٢- ماكس فيبر، رجل العلم و رجل السياسة، ترجمة نادي ذكرى، بيروت دار الحقيقة، ١٩٨٢، لا ٢٩_٤٢.

کێشــەی توێژینــەوە، توێــژەر دەتوانێــت کێشــەیەکی لاوەکــی لــە کۆمــەڵگا هەڵبــژێرێت، کێشــە جەوهەرییــەکانیش فــەرامۆش بکــات، لەســەر ئاســتی هەڵبــژاردنی سەرچــاوە و دانــانی گریمانــەی زانســتی، ئەگــەر میتــۆدی توێژینــەوەکردنی مەیـدانی هەڵبـژارد، ئـەوا نـا ئامـادەیی بابـەتیبوون لەسـەر چەندین ئاست دەبێت، ئاستی هەڵبژاردنی نموونەی توێژینەوە و کەرەستەی کۆ کردرنەوەی زانیاری و تێبینیـکردن _چاوپێکەوتن، یـاخود پرسـیارنامە ، لەسەر ئاستی شیکردنەوەی داتا، ڕەنگە لە چوارچێوەی تیۆریشدا لایەنگیری بکات ...هتد[١٠٣].

ئـەو جـۆرە لایەنگیرییـە دەکرێـت دەرکـی پـێ بکـەین و ئاشکراشـی بکـەین، ئەگەرچی فەرامۆشکردن و خسـتنەپاڵ بـۆ هـەر توێژینەوەیـەکی کۆمەڵایـەتی دژوارە، چـونکە قورسـە ئێمـە توێـژەر و بابـەتی توێژینــەوە بـە شـێوەیەکی کۆتایی لە یەکتری جیا بکەینەوە.

هەرچی جۆری دووەمە لە لایەنگیری، یاخود پابەند نەبوون بە بابەتیبون لـە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، ئەوا پەیوەستە بە کۆمەڵناسـی لـە خـودی خۆیـدا، بەشێوەیەك هەندێك توێژەری کۆمەڵایەتی پێیانوایە زانستە کۆمەڵایەتییـەکان بــە سروشــتی خۆیــان لایــەنگیرن، ئایــدیۆلۆجیاش لکــاوە لــە زانســتە کۆمەڵایەتییەکان، هەردەبێت بوونی هەبێ لە نێو زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا، دژوارە بۆ توێژەرێکی کۆمەڵایەتی ئەو بوارانە لە یەکتر جیابکاتەوە: زانسـت،

---

[١٠٣]- لەو بەشانەی کە تایبەتە بە توێژینەوەی مەیدانی زیاتر باسی ئەم بابەتە دەکەین.

سیاسەت، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئەخلاق، ئایین، هەروەك ناتوانێت توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی جیابکاتەوە، چونکە هیچ زانستێك لە پێناو زانست بوونی نییە، بەڵکو زانست لە پێناو کۆمەڵگا بوونی هەیە.

لەمبارەیەوە دۆرکهایم دەڵێت: کۆمەڵناسی شایانی ئەوە نییە یەك چارەگ خۆتی بۆ ماندوو بکەیت، ئەگەر سوودێکی کۆمەڵایەتی نەبێت[١٠٤]. هەرچی رایت میلزە، جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە توێژینەوەی سۆسیۆلۆژی ئەمرۆ بوونی هەیە بۆ خزمەتکردنی سەرکردەی سوپا و رێبەرە کۆمەڵایەتییەکان و سەرۆکی کارگە و بەڕێوەبەری چاکسازییەکان. هەمان شتیش بۆ رۆچوونی ئایدیۆلۆژیا بە مانا گشتییەکەی بۆ نێو پرۆسەی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی راست، لەم پەرەگرافەدا دەبینینەوە، بەشێوەیەك بزوتنەوەی کۆمەلناسی ئەمریکی وەسفی کۆمەڵناسی ئەمریکی دەکات و دەڵێت (کۆمەڵناسی بەشێوەیەکی تۆکمە بەستراوتتەوە بە دەزگای فەرمانڕەوا و لە بەرژەوەندی هێزە باڵادەستەکانی کۆمەڵگای ئەمریکی جیا نابێتەوە، ئەمەش لەو بەها و بیروباوەڕانە دەناسرێتەوە کە لە نێو زانایانی کۆمەڵناسیدا باوە، لە پاڵ وەلایان بۆ ئەو دەزگایانە، سەرەڕای بانگەشەکردنی بێ لایەنی لە لایەن زانایانی کۆمەڵناسییەوە، کەچی توێژینەوە ئەنجامدەدەن لە بەرژەوەندییە رێکخستنە بەهێزەکانی کۆمەڵگا، ئەو مەعریفەیەیان پێدەدن کە پێویستیان پێییەتی لە پێناو چارەسەکردنی

---

١٠٤ـ المعجم النقدي لعلم الاجتماع، لا ٥٣٨.

کێشەکیانیان، شارەزایی خۆیان دەخەنە خزمەت سیستەم و پەرەسەندنی، کۆمەڵناسیش دەخەنە خزمەتی ئەوکەسانەی کۆمەکیان دەکەن، بەمەش ئاراستەی بێلایەنی لە کۆمەڵناسی شکستی هێنا، لەوەی کە بتوانێت لە کێشەکانی هەژاری و بێ تواناکان تێبگات و یارمەتییان بدات بۆ بالادەستبوون بەسەر خاوەن هێز و دەسەلاتەکان)[١٠٥].

ئایا لایەنگیری توێژەری کۆمەلایەتی بۆ توێژێك، یاخود پرسێکی کۆمەلایەتی یاخود کۆمەڵگایەك لە خۆیدا بە لایەنگیری یان بە دەرچوون لە بنەماکانی توێژینەوەی کۆمەلایەتی دادەنرێ، یاخود بەپێی گوزارشتی بیاجێ (بە رایسیزمی کۆمەلایەتی) دادەنرێت[١٠٦]، یاخود ئەمە دژ نایەتەوە لەگەڵ توێژینەوەی کۆمەلایەتی و بابەتییبوونی زانستی؟

پێمانوایە هیچ توێژەرێکی کۆمەلایەتی لە بۆشایی کار ناکات، بەڵکو لە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکدا کە بەرژەوەندی و بەها تێدایە و پەیوەستە بە ئامانجەکانی، ئەوکاتەی توێژەر پابەند دەبێت بەم بەها و بەرژوەندییانە بابەتییبوون دەردەچێت، مادام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەنجامەکانی بەسەر ئەو کۆمەڵگایە کورتدەبێتەوە، کە توێژینەوەی دەکات، هەروەها ئەنجامەکانی توێژینەوەکەی توێژەرانی کۆمەڵگاکانی دیکە پابەندی ناکات، ئەو گشتاندنانەی کە پێی گەیشتووین ڕێژەییە لە ڕووی شوێن و کاتەوە، بەلام ئەوکاتە کەموکوڕییەکە سەرهەڵدەدات کە ئەم ئەنجامانە (تیۆر

[١٠٥]- وەرگیراوە لە: محمد احمد الزعبي، علم الاجتماع العام و البلدان النامية، مدريد ١٩٨٥، لا ١٤٤.
[١٠٦]- المعجم النقدي لعلم الاجتماع، لا ٢٠٩.

و یاساکان) بەسەر کۆمەڵگای دیکە بسەپێنرێت و کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی پێ چارەسەر بکرێت، بە پشت بەستن بە تیۆرگەلێك کە لە کۆمەڵگای دیکە وەرگیراوە، لەم حاڵەتدا تیۆرەکان زانستیبوون و راستییان لە دەستدەدەن و تێگەیشتنی کێشەکان و چارەسەرکردنیان ئەستەم دەبێت. گەلانی جیهانی سێیەم لە دەست کێشەی گەورە دەناڵێنن بەهۆی بەخشینی سیفەتی جیهانی و زانستی بە چەند تیۆرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری سۆسیۆلۆجی کە لە دەوڵەتە پیشکەوتووەکان هاتوە لە ژێر دروشمی زانستیبوون و جیهانیی بونیان، هەندێك کەس لە ژێر ئەو دروشمەدا ویستویانە بەکاریان بهێنێنن بۆ شیکردنەوەی واقیعی دەوڵەتەکانی جیهانی سێ و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەکانیان، بۆیە شکست چارەنوسیان بووە. ئینجا چ پەیوەست بێت بە تیۆرەکانی گەشەپێدان و مۆدێرنە، یاخود تیۆرەکانی ئابووری، یاخود سیاسەت.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین ئایدیۆلۆژیا هاوشانی توێژەری کۆمەڵایەتییە لە هەموو هەنگاوێکی توێژینەوەکەی، قسەکردن لە بارەی بابەتییبون لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان نابێت هەمان مانای بابەتییبونی هەبێت لە زانستە سروشتییەکان. پابەندبوون بە میتۆدی زانستی مانای رزگاربوونێکی گشتی نییە لە ئایدیۆلۆجیا، یاخود وەك گیندنز دەڵێت (ئەوکاتەی لە گۆشەیەکی دیاریکراو لە میتۆدۆلۆجیا دەڕوانین بەوەی پرسێکی هونەری دیارە کە پەیوەندی بە ئایدیۆلۆجیاوە هەیە، بەشێوەیەك بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە پەیوەستە بە میتۆدەکانی وەرگرتنی زانیاری کە زاناکان بەکاری دەهێنن

وەك كۆكردنەوەی داتـا و پرسـیارنامە و وەرگرتنـی نموونـە و شـیكردنەوەی ئەنجامەكان، بـەڵام ئەمـە وانییـە، چـونكە ئـەو پرۆسـەیە گشـتگیرترە لەمـە، چونكە تێكـەڵ بـە چـەند گریمانەیـەك دەبێـت كـە لـە ڕووی ئایدیۆلۆجییـەوە لەگـەڵی گونجـاوە، تایبەتـە بـە سروشـتی ژیـانی كۆمەڵایـەتی و ماهییـەتی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی و پەیوەندی نێوان هەردووكیان)[١٠٧].

## سێیەم: ڕەخنەگرتن لە بابەتیبوون، زانستی پۆزەتیڤی، گرنگترین ئاڕاستە هزرییەكان

پۆزەتیڤیزم وەك بنەمایەك بۆ میتۆدی زانسـتی و بابەتیبونەكـەی دووچـاری ڕەخنـەی توندبویـەوە، زۆربـەی جـار ڕەخنـەكان بـۆ ئـەوە دەگەڕێنـەوە كـە مامەڵـە لەگـەڵ مـرۆڤ بكرێـت وەك شـتی ئەبسـتراكت، بەشـێوەیەك بیرۆكـەی سەرپشـكی و ئـازادی و تاكگـەرایی و بەرپرسـیارییەتی ئـەخلاقی بـەدوور دەخاتـەوە[١٠٨]. مـرۆڤ دەكاتـە چـاودێرێكی دەرەكـی بـۆ ئـەو ڕووداوانـەی كـە پەیوەندی بەخۆیەوە هەیـە، فەرامۆشـكردنی مـرۆڤ وای لـە هەنـدێك بـاس لـە پوچـێتی كۆمەڵناسـی بكـەن، بەشـێوەیەك هـۆلبرۆك دەڵێـت: تـا ئێسـتاش توێژینەوەكردنمان بۆ مرۆڤ شتێكی بەرهـەم نـەهێناوە كـە شـایانی باسـكردن بێـت، هـەموو ئەوانـە لـە حـوكمی نەبوونـە، چـونكە ملكەچـی بزوتنـەوەی پۆزەتیڤیزمە، واتە بۆ ئـەو توێژینـەوەی كـە دەڵێـت ناكرێـت هـیچ شـتێك بـە

---

[107]- Gouldner, the coming crisis of western sociologe, Heinmann, London 1972, p 50.

[١٠٨]- بڕوانە: جان بیاكورت و جن بیار مونبي، من اجل علم الاجتماع سیاسي. ترجمة: محمد هناد، الجزء الاول، الجزائر، ١٩٨٥، لا ٣٩.

هەقیقەت دابنرێت ئەگەر بە ئەزموون و زانستی پراکتیکی و پەیڕەوکردنی لۆژیك و بابەتیبون نەسەلمێنرێت[109]. لێرەوە بەرهەڵستکارانی پۆزەتیڤیزم پێیانوایە ڕەفتاری مرۆیی ناکرێت ملکەچی یاسای گشتی ورد بکرێت، هەروەها ناکرێت لە جیهانی کۆمەڵایەتی تێبگەین تەنیا لە میانەی ڕوانگەی ئەو تاکانەی نەبێت کە بەشێکی سەرەکین لە دروستبوونی دیاردە کۆمەڵایەتی، بەڵکو ناکرێت قسە لە بارەی دیاردەی کۆمەڵایەتی بکەین بێ ئەوان، بۆیە ئەوان پێیانوایە ناتوانین لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین ئەگەر بێت و توێژەر بەشداری لە بارودۆخ و باکگراوندی ئەو مرۆڤە نەکات.

بەمشێوەیە ڕەخنەگرانی پۆزەتیڤیزم ئەوە ڕەتدەکەنەوە توێژەر و بابەتی توێژینەوە لە یەکتر جیا بکرێتەوە، چونکە تێگەیشتنیان لەوەی کە چۆن تاك جیهان دەوروبەری خۆی ڕاڤە دەکات هەردەبێت لە ناوەوەی بێت نەك لە دەرەوەی، کۆمەڵناسی لە ڕوانگەی ئەوان هیچ نییە جگە لە هەوڵێکی خود نەك بابەتی نەبێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شارەزاییە ڕاستەوخۆکانی تاکەکان لە بارودۆخێکی دیاریکراودا[110]. ڕەتکردنەوەیان بۆ پۆزەتیڤیزم ڕەتکردنەوەی زانست نەبوو بە شێوەیەکی ڕەها، بەڵکو ڕەتکرنەوەی لە نێوبردنی ڕەهەندی مرۆییە لە زانست، ڕەتکردنەوەی هەژموونی زانستخوازی توند بوو بەسەر کۆمەڵگا مۆدێرنەکان، هەر ئەمەش بوو وایکرد مرۆڤ نامۆ

109- Holbrook, D Education Nihlism and survival (Durbon, Longman and Todd London 1977).

١١٠- لویس کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٨.

بێت بە زانست یاخود بەگوێرەی قسەی هێربێرت مارکیوز مرۆڤ تاك ڕەهەند بێت، دواتر مرۆییبونی خۆی لە دەست بدات.

کێرکەگارد لە دیارترین چالاکوانانی ئەو بوارەیە، بەشێوەیەك بایەخێکی زۆر داوە بە تاك و پێویستی بۆ دەستەبەرکردنی خود، دەستەبەرکردنی خود لە لایەن تاکەکەسەوە مانای بوونە، کە پرۆسەیەکی تاکی بەرهەستی تاکگەرایيانەیە ناکرێت بە کەم لێی بڕوانین یاخود لە واقیعی بەرهەستی دابڕین. ئەو پێیوایە خەسڵەتەکانی چاخی مۆدێرن لە دژی دەستەبەرکردنی خود بۆخۆی پیلان دەگێڕێت و کار بۆ کەمکردنەوە دەکات لە مرۆییبونی، تەنانەت دەکرێت مرۆڤ لە وەهمەکانی چاخەکەی ڕزگار بکەین، کە بە بۆچوونی ئەو ئەمە وەهمی بابەتییبوونە، ئەو بانگەشەی دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ خودێتی واتە توانای تاك لە بایەخدان بە پەیوەندی کەسی خۆی بە بابەت، کە جەوهەر و کانگای گەڕان و توێژینەوەیە. کێرکەگارد جیاوازی لە نێوان بابەتیبون و خودێتی دەکات، دەڵێت:

"ئەوکاتەی لە ڕاستی شتێك یاخود پرسێکی دیاریکراو دەگەڕێین، ئەگەر پەیوەندی نێوان تاك ئەو شتە بابەتی بێت بەو مانایەی کە بەرژەوندی کەسی نەبوو لەهەمبەر ئەو شتە، یاخود ئەو پرسە، ئەوا حوکمەکە بابەتی دەبێت، کەواتە لێرەدا پرسەکە پەیوەستە بە حوکمی تاك، بەوەی ئایا ئەو حوکمە بابەتییە، یاخود لە ژێر کاریگەری چەندی فاکتەرێکی خودییە و لە بابەتیبوونی دوور دەخاتەوە، حوکمی بابەتییش نزیکترە لە ڕاستی وەك لە حوکمی خودی و کەسی". ئەو پێیوایە ئەگەر فاکتەرێکی خودی پەیوەستکرا

بە هەقیقەتێکی بەرهەست، ئەمە بە ڕووناکییەکی ڕێنیشاندەر دادەنرێت بۆ توێژەری زانستی[111].

هەرچی ڕۆزاکە قسەی لەسەر بابەتییبون کرد بەوشێوەی کە میتۆدە زانستییەکان باسی لێوەدەکەن، بەوەی کە حاڵەتێکی نامۆبونی لە نێوان تاکەکان دروستکردوە لە ژیانی هاوچەرخدا، بەشێوەیەك گوتی: (لەوکاتەی ئەدەبیات و هونەر لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە هەژاریەکی زۆریاندا دەبنە هۆی دروستبوونی نەخۆشییەك کە ڕەنگە ببێتە هۆی مردنی چاخەکەمان، ئەم نەخۆشییەش نامۆبوونە، دەبینین زانست لە هەوڵی بەردەوامی بۆ دەستەبەرکردنی بابەتییبوندان، بۆیە نامۆبوون دەگاتە بەرزترین ئاستی، وەك ئەوەی تاکە ڕێگای دەستەبەرکردنی پەیوەندییەکی ڕاستگۆ لەگەڵ هەقیقەت، ویژدانی بابەتیبون ژیانی نامۆبوونە، ئێستاش گەیشتۆتە بەرزترین ئاستی لە ڕێزگرتن و پێی دەگوترێت (میتۆدی زانستی)[112].

گرنگترین قوتابخانەکان لە ڕەخنەگرتن لە پۆزەتیڤیزمی زانستە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان لە چوار قوتابخانە دەبیننەوە، ئەوانیش:

## ١. قوتابخانەی فینۆمینۆلۆژی

[111]- لویس کومن، هەمان سەرچاوە، لا ٤٨.
سەرچاوەی رەسەن لەبارەی کیرکەگارد:
Keirkagard, concluding unscientific postscripe (printech university press, Princeton 1974).

[112]- لویس کوهین، لا ٤٥.
سەرچاوە رەسەنەکە:
Rozak, T. the Making of acounter culture (faber and faber, London 1970).

ئاراستەیەکی هزرییە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەبێت توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان لە توێژینەوەکانیاندا پشت بە شارەزاییی ڕاستەوخۆ ببەستن، پێیوایە ڕەفتاری مرۆڤ دیاری دەکرێت بە خەسڵەتەکانی شارەزایی نەك بە هەقیقەتێکی بابەتی ماددی دەرەوی خۆی، واتە (ئەمە حاڵەتی زۆرێك لە قوتابخانەکانی دیکەیە کە هاوکێشەکەی پێچەوانە بۆتەوە، ئەگەر پێشتر هاوکێشەکە لە دەرەوە بۆ ناوەوە بێت ئێستا بۆتە لە ناوەوەی خود، بۆ دەرەوە_بابەت، گرنگترین پێشڕەوانی ئەو قوتابخانەیەش، کێرنس و هۆسرەل و شوتزن، ئەوانە پێیانوایە لە سەرەتای سەدەی بیستەم هزری مرۆیی گەیشتۆتە ڕێگایەکی داخراو و زانستەکانیش ڕۆڵی خودی دەرککار و بەکاریگەرییان بەسەر جیهان لە یاد کردووە. لێرەوەیە ئەو قوتابخانەیە هەوڵی داوە پرۆسەی ڕێکەوتن چێبکات لە نێوان خود و جیهاندا، هەروەك هۆسرەل داوای ئەوەی کرد فینۆمینۆلۆجیا وەسفی پرۆسەکانی کاریگەری ئاڵوگۆڕی نێوان خود و جیهانی دەرەوە بکات)[١١٣].

**٢. قوتابخانەی توێژینەوەی دەستەکان**

دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە گارفێنکڵە، ئەو قوتابخانەیە لەسەر توێژینەوەکردنی چالاکی زانستی و بارودۆخی زانستی و بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی پراکتیکی وەك بابەتگەلێك بۆ توێژینەوەی ئەزموونی دامەزراوە ، لەگەڵ بایەخدان بەو شتانەی لە ژیانی ئاسایی ڕوو دەدات، لە نێویشیاندا

---

١١٣- دەکرێت بگەڕێیتەوە بۆ: بیار انصار، العلوم الاجتماعیة المعاصرة، ل ١٢٤.

بارودۆخە نا ئاساییەكان، كە ڕەنگە دەگمەن بێت، هەروەها بایەخ بە توێژینەوەكرنی هەموو ڕووداوێك دەدات بە تەنیا.

توێژینەوەی دەستەكان بایەخ بە توێژینەوە دەدات لە بارەی چۆنییەتی تێگەیشتنی خەڵك بۆ جیهانی ڕۆژانەیان، ئەوەی لێرەدا گرنگە شێوازی هەڵسوكەوتكردنی تاك و كارلێككردنییەتی لەگەڵ ژینگە كۆمەڵایەتییەكەی، خاڵی دەسپێك لە پرۆسەی تێگەیشتنی دیاردە لە ناوەوەی تاكەكان دەست پێ دەكات نەك لە دەرەوەیان.

## ٣. قوتابخانەی كارلێكی هێمایی

لە ئەمریكا سەریهەڵدا و جەختدەكاتە سەر پرۆسەی كارلێكی نێوان خەڵك، زمانیش بە بنەمایەكی زیندوو و نێوەندێكی گرنگی كارلێك و پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان دادەنێت، ئەوەی لای ئەو قوتابخانەیە گرنگە چالاكی دینامی و زیندویی نێوان تاكەكانە، كارلێك یەكەی توێژینەوەیە و كۆمەڵگاش جگە لە تاكە كارلێككردووەكان هیچی دیكە نییە.

جۆرج هێربێرت مید بە گرنگترین دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت، ئەو پێیوایە كۆمەڵگا بەرهەمی پەیوەندی كارلێككردوی نێوان عەقڵ و دەروونی مرۆییە، هەروەها نە عەقڵ و نە دەروون لە دەرەوەی كۆمەڵگای مرۆیی هیچ بونێكیان نییە، ئەوانە پەیوەستن بە یەك و كارلێك لەگەل یەكتردا دەكەن، ڕەفتاری مرۆیش ڕەنگدانەوەی ئەو كارلێكە بەردەوامەیە، لێرەوە ئەو كۆمەڵگای مرۆیی پێناسە دەكات بەوەی كە لە كۆمەڵێك دامەزراوەی كۆمەڵایەتی پێكدێت و ئەوانەش لە تاكی كارلێككردوو پێكدێن لە میانەی

بەکارهێنانی ڕەمز و مانا کۆمەڵایەتییەکان دەبن بە خودی کۆمەڵایەتی.

ئەوەی لەو قوتابخانەیە پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە ئەوەیە کە تاک بەو یەکە سەرەکییە دادەنێت کە کۆمەڵگای لەسەر دروست دەبێ، کۆمەڵێک تاکیش گروپێکی بچووک پێکدێنن و کۆمەڵێک گروپی کۆمەڵایەتیش ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی گەورە و ئاڵۆز پێکدێنن، کۆمەڵێک ڕێکخستنیش دامەزراوەی کۆمەڵایەتی پێکدێنن.

چەندین بیرمەندی دیکەش سەر بەو قوتابخانەیەن و دەوڵەمەندییان کردووە وەك جۆرج زیمێل(١١٤) کە بایەخی بە توێژینەوەی کارلێکی نێوان دوو تاك یان سێ تاك داوە و هیچ بایەخێکی بە چەمکی ئەوی دیکە نەداوە، هەروەها چارلس کولی جەختی کردەوە لەسەر وێنا عەقڵییەکان زیاتر لە پێکهاتەکانی دەروون و کارلێککردن.

## ٤. قوتابخانەی هەڵوەشاندنەوەگەرایی

هەڵوەشاندەوەگەرایی ئاراستەیەکی هزری ڕەخنەیی هەمەکییە لە ئەدەب و هونەر و هزر، بیرۆکە سەرەکییەکەی پەیوەندی هەیە بە پرۆژەی پۆست مۆدێرنیتە، ئەم قوتابخانەیە بەشێوەیەك لە شێوەکان درێژکراوەی فەلسەفەی عەقڵی کانتە و بەرهەڵستکاری ئاراستەی ئەزموونییە لە ڕووی ڕەتکردنەوەی بۆ جیهانی تازە و یاخیبونی لە دژی میتافیزیکا دوورتر

114- Garfenkel, H. studies in Ethnpmethology (prentice Hall Englewood cliffs/ J 1968).

هەروەها بڕوانە: لویس کوهین، لا ٥٤.

دەڕوات، وەك دامەزرێنەرەکــەی (هایدگــەر) دەڵێــت دەبێــت میتافیزیکــا تێپەڕێنین بۆ نوێکردنەوەی ئەرکی هزر.

هەڵوەشــاندنەوەگەرایی وەك حاڵــەتێك گومــان لــە ئەگــەری دەســتەبەربوونی مەعریفــەی یــەقینی دەکــات بــە پشــت بــە ســتن بــە میتۆدەکــانی زانســتی و ئەزموونی، هەروەها حاڵەتیکە لە یاخیبوون لە خۆبەدەستەوەدان بۆ زانستی، لە دەستەبەرکردنی کامەرانی و ئارامی و مەعریفــەی بــاوەڕی شکســتی هێنــا. گرنگترین هۆکاری سەرهەڵدانی هەڵوەشاندنەوەگەرایی ئــەو حاڵــەتی شــڵەژانە بوو کە ئــەورووپای گرتبــۆوە لــە سیبیەکان و بێتوانــایی بونیادگــەریێ بــوو لــە دۆزینــەوەی چارەســەر بــۆ ئــەو هــەموو کێشــانە، بۆیــە نــاوی نــرا بــە هەڵوەشاندنەوەگەرایی، یــەکێك لــە نووســەرەکان قــەیرانی بونیادگــەری دوای جەنگی دووەمــی جیهــان و ســەرهەڵدانی هەڵوەشــاندنەوەگەرایی بــە یەکــەوە دەبەستێتەوە و دەڵێت: ئەوە بۆ جیهان دووپــات بــۆوە کــە زانســت شکســتی هێناوە لە دەستەبەرکردنی کامەرانی و ئارامی و مەعریفەی باوەڕی، دووبــارە چــاخی گومــان بــە تونــدی گەڕایــەوە، گومــان کــردن لــە توانــای زانســت لــە دەســتەبەرکردنی کامــەرانی، پەرچــەکرداری ڕەخنــەیی پۆســت بونیادگــەری بریتییە لە گەڕانەوە تەواو بۆ خود و خۆ گرمۆلەکردن لــە ئــامێزی بــەبێ هــیچ کۆتێك[١١٥]

---

١١٥ - عبدالعزيز حمودة، المرايا المجدية، من البنويةر الى التفكيكية، سلسلة عالم المعرفة، عدد ٢٣٢، الكويت ١٩٨٨.
بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
Jaques Derrida, la difference in Speech and phenomena, and other Essays on hasserls theory of signes trans. Davids B. Allison, Evanston North western, UP, 1973.

چاکەی سەرهەڵدانی هەڵوەشاندنەوەگەرایی (کە خۆی سەلماند وەك ئاراستەیەکی رەخنەی ئەدەبی و رۆشنبیری زیاتر لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان) بۆ کۆمەڵێك بیرمەند دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان هایدگەر و جاك دریدا و هارتمان، پێدەچێت تەمەنی هەڵوەشاندنەوەگەرایی کورتتر بێت لە تەمەنی چەندین ئاراستەی هزری دیکە، تا ئێستاش خەریکی بەدەستهێنانی لایەنگیرە، بەهای وەك ئاراستەیەکی رەخنەیی زیاترە وەك لە بەهای وەك تیۆرێکی تازە لە بواری هزری کۆمەڵایەتی.

بەڵام ئەو ئاراستە و قوتابخانە هزرییانە نەیانتوانی پێگەی بابەتییبون و میتۆدە زانستییەکان بلەرزێنن، بەڵکو وایکرد بەرهەڵستکاری زیاتر بۆ ئەو قوتابخانانە دروست بێت، ئەو رەخنەگرانە پێیانوایە روانگەی ئەو قوتابخانانە لە گەڕانەوە بۆ خودی توێژەر لە بارەی دیاردەکان وادەکات توێژینەوەی زانستی لە حەقیقەت دوور بکەوێتەوە، وا دەکات فەوزا بێتە ناو کایەکە و ئارەزووی خودی و ئایدیۆلۆجیا بەسەریدا زاڵ بێت.

## دەروازەی دووەم

# میتۆدەکانی توێژینەوە

- شێوازە نمونەییەکان ( تایپ ئایدیال )
- بونیادگەری_ئەرکگەری و سیستە مخوازی
- میتۆدی مێژوویی
- میتۆدەکانی توێژینەوەی وەسفی
- میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆك
- میتۆدی بەراوردکاری
- میتۆدی ئەزموونی

## پێشەکی

ئاراستەی ساوی ئەمڕۆ لای زانایانی کۆمەڵناسی و توێژەرەکان لە پرۆسەی توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا بریتییە لە کۆکردنەوەی هەردوو میتۆدە تیۆری و میتۆدە پراکتیکی، لەو ڕوانگەیەی کە توێژینەوەی مەیدانی و چوارچێوەی تیۆری ڕێگا بۆ توێژەر ڕووناك دەکەنەوە ئینجا چ لەسەرەتای توێژینەوەکەی، یاخود دوای کۆکردنەوەی داتاکان و هەوڵی ڕاڤەکردنیان بێت، لێرەوە ڕۆڵی میتۆدی تیۆری دێت کە لەسەر بنەمایەوە زانیارییەکان شیدەکرێنەوە و ڕاڤە دەکرێن. هەمان شت بۆ توێژینەوەی تیۆری پەتیش ڕاستە، ئەو توێژینەوەیە لە ڕۆماڵکردنی بابەتییانە بۆ دیاردەی کۆمەڵایەتی لێتوێژراو کورت دەهێنێت، ئەگەر تەنیا جەختی لەسەر وتە تیۆرییەکان کردەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئەو تیۆرانە پوختەی توێژینەوەکردنی کۆمەڵگایەکی دیکە بوون کە خەسڵەتی جیاوازیان هەیە، تەنانەت ئەگەر میتۆدی تیۆری ڕاستیشیان هەبێت، دەبێت هاوتا بکرێن بە توێژینەوەی مەیدانی، وتەکانیشی بگونجێت لەگەڵ دۆزینەوەکانی توێژینەوەی مەیدانی لە بارەی خەسڵەتەکانی کۆمەڵگا.

لەم بەشەدا باس لەم میتۆدانە دەکەین

- شێوازە نمونەییەکان (تایپ ئایدیال)
- بونیادگەری_ئەرکگەری و سیستەم
- میتۆدی مێژوویی
- میتۆدەکانی توێژینەوەی وەسفی
- میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆك
- میتۆدی بەراوردکاری
- میتۆدی ئەزموونی

# بەشی یەکەم

## میتۆدی شێوازە نمونەییەکان (تایپ ئایدیال)
## نموونەی میتۆدی ماکس ڤیبەر

ماکس ڤیبەر و میتۆدە سۆسیۆلۆژییەکەی بە نموونەی حاڵەتێك دادەنرێت، کە توێژینەرەی کۆمەڵایەتی تێکەڵ بە سیاسەت دەبێت، تیایا کۆمەڵناسی و چەمکەکان لە خزمەتی واقیعێکی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنرێت و بەرگری لە ئایدیۆلۆژیایەك لە ئایدیۆلۆژیاکان دەکەن، سەرەڕای ئەوەی ماکس ڤیبەر وەك لەپێشودا باسکرا، جیاوازی لە نێوان حوکمی بەهایی و حوکمی زانستی کردووە، کەچی سۆسیۆلۆجیاکەی لە فەلسەفە و قوڵاییەکەییدا بوار دەڕەخسێنێت بۆ تێکەڵاوی لە نێوان ملکەچی حوکمە سیاسی و ململانێی نێوان بەرژەوەندی و ئایدۆیۆلۆجیاکان لەگەڵ حوکمەکانی زانست و پێداویستییەکانی بێلایەنی زانستی. ڤیبەر لە هەموو نوسینەکانی کۆتاییدا سەرسامبووە بە سیستەمی سەرمایەداری، کە تاکە ڕێگای ڕزگاربوونی هەر کۆمەڵگایەکە بیەوێت بەرەو شارستانییەت و پێشکەوتن بچێت، لە هەمان کاتیشدا ڕەخنەگرێکی توند بوو لە ئاراستە کۆنزەرڤاتیڤەکان لە لایەك و هزری مارکسی و سیستەمە سۆسیالیستەکان لە لایەکی دیکەوە، تەنانەت ئەو بە باوکی ڕۆحی سەرمایەداری و دوژمنەکانی سۆسیالیستی دادەنرێت، لێرەوە

سۆسیۆلۆجیاکەی و میتۆدە تایپ ئایدیالەکەی لەژێر کاریگەری ئەو باکگراوندەدا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا میتۆدەکەی ڤیبەر لە سۆسیۆلۆجیادا بە نوێکار دادەنرێت، بەشێوەیەك هەر لە سەرەتاوە تێکەڵبون و بە یەکەوە بەستانی نێوان پیاوی زانست و پیاوی سیاسەتی دیاریکردووە، پرەنسیپە میتۆدۆلۆجیەکەی دارشتووە نەك بەشێوەیە نەریتیەکەی توێژینەوە، بەڵکو لە چوارچێوەی وێنایەکی گشتی کە زانست و سیاسەت بە یەکەوە دەبەستێتەوە، واتە لە نێوان تایپ ئایدیالی زانا و تایپ ئایدیالی پیاوی سیاسەت، ئارن ساهری لە وتارێکی لە بارەی گرنگی میتۆدەکان لە راڤەکردنی سۆسیۆلۆژی لای ماکس ڤیبەر دەڵێت ئەو میتۆدانەی کە ڤیبەر پێشکەشی کردوون تاکە میتۆدن کە بەدرێژایی مێژووی هزری کۆمەڵایەتی چارەسەرێکی روونیان بۆ کێشە پراکتیکییەکان پێشکەشکردووە لە بەرامبەر کێشە میتافیزیکییەکان سەبارەت بە شیکردنەوەی سۆسیۆلۆژی[116].

## باسی یەکەم
## سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤیبەر

ماکس ڤیبەر لە ژێر کاریگەری دەستکەوتەکانی زانستە سروشتییەکان بوو لەگەڵ شۆرشی پیشەسازی و بڵاوبونەوەی عەقڵانییەت بەسەر بیرکردنەوەدا، بۆیە نوسینەکانی رەنگدانەوەی ئەو بایەخدانەیە بە زانست و عەقڵانییەت، ئەو عەقڵانییەتەی کە بە دیاردەیەکی تایبەتی شارستانییەتی رۆژئاوای

---

[116]- محمد علي محمد، تارخ علم الاجتماع، القاهرة، ١٩٨٧، لا ٢٩٦.

دادەنێت، لەگەڵ ددانانانی ڤیبەر بە بوونی توخمی هاوبەش لە نێوان زانستە سروشتییەکان و زانستە کولتوورییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو ئاماژەی بۆ جیاوازییەکی گرنگ کرد لە نێوان دوو جۆری زانست، زانستە کولتوورییەکان خەسڵەتی تاقانەیان هەیە و هەوڵی تێگەیشتن[١١٧] دەدەن و خاوەن سروشتێکی مێژوویین، هەرچی زانستە سروشتییەکانە، لەسەریان پێویستە ئەزموون دروستبکەن لە هەموو ئەو ڕاڤەکردنانەی بۆ دیاردەکانی دەکەن بۆ ئەوەی بەراستی تێگەیشتنێك بۆ ئەو دیاردانە بخەنەڕوو، تێگەیشتن لە زانستە سروشتییەکان تەنیا لە ڕێگای پرسە ماتماتیکی و ئەو یاسایانە دەبێت کە لە ڕێگای ڕووداو و واقیعە جێگیرەکانی سروشت ئاشکرا بووە.

ڤیبەر پێیوایە زانست دەتوانێت زۆر یارمەتی مرۆڤ بدات بەو کەرەستانەی کە دەیخاتە بەردەست نەك بە ئامانجەکان، چونکە ناتوانێت ڕێنیشاندەرمان بێت بۆ بەها ڕاستەقینەکان، بەمپێیەش ململانێ لە نێوان بەهاکان پرسێکی حەتمییە بە بۆچونی ئەو، بە تایبەتی لەو کۆمەڵگا مۆدێرنانەی کە بە ئاڵۆزی جیا دەکرێنەوە. هەموو ئەو شتانەی کە کۆمەڵناسی دەتوانێت پێشکەشی بکات ڕوونبونە، ڕوونبون لەوەی کە پەیوەستە بە ڕەفتارمان لە ڕووی پاڵنەر و ئامانج و ئەنجامەکانەوە، چونکە زانست یارمەتیمان دەدات لە قوڵبون لە سروشتی ئاڕاستەی بەهایی لە کردارەکانی مرۆڤ و ئەو بەهایانەی کە پێویستە لەسەرمان باوەڕی پێ بکەین، ئەمە لە پاڵ ئەوەی کە یارمەتیمان دەدات لە

١١٧ - تێگەیشتن بریتییە لە دەرککردن بە بابەتی بیرلێکراوە و دیاریکردنی ڕەهەندەکانی و بەدەستهێنانی دەرەنجام، بریتییە لە وێناکردنی مانا لە دەستەواژەکانی قسەکەر.

پەیڕەوکردنی ئامرازگەلێك کە ئەو بەها دیاریکراوە دەستەبەر دەکات، تێچوەکانی ئەنجامەکانیش دیاری دەکات سەبارەت بە بەهای دیکە[118].

ڤیبەر کۆمەڵناسی پێناسە کردووە بەوەی کە (ئەو زانستەیە هەوڵی تێگەیشتنی کردەی کۆمەڵایەتی دەدات، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕاڤەکردنێکی هۆکارگەرایانە بۆ ڕەوت و ئەنجامەکانی بخاتە ڕوو).

هەر لەبەر ئەوەشە سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤیبەر پێی دەگوترێت سۆسیۆلۆجیای تێگەیشتن، چونکە پێیوایە ئەرکی پسپۆڕی کۆمەڵناسی بریتییە لە ڕاڤەکردنی ڕەفتار لە ژێر ڕۆشنایی مانای خودی، بابەتی توێژینەوەی ئەو زانستەش ئەم دیاردانەن کە دەکرێت بەشێوەیەکی خودیانە لێیان تێبگەین، بایەخدانی بە تێگەیشتنی خودی بۆ کردەی کۆمەڵایەتی وای لێکردووە ببێتە یەکێك لەو کەسانەی سەر بە ئاراستە و قوتابخانەی دەروونناسی بێت لە کۆمەڵناسی.

لەوەی پێشوو بەم ئەنجامە دەگەین کە هەموو ڕەفتارێکی مرۆیی کردەیەکی کۆمەڵایەتییە، کردەی کۆمەڵایەتییش پێویستە ببێتە بابەتی توێژینەوەی کۆمەڵناسی، ئەمەش ئەو ڕەفتارەیە کە قسەکەر مانایەکی خودی پێ دەبەخشێت، لەوکاتەی بکەر کردەیەکی کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدات،

[118] ـ المعجم الفلسطيني، اعداد جميل صليبيا، ح ٢، بيروت، ١٩٨٢، لا ١٧٠، علي ليلة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٦٦.

بەردەوام ڕەفتاری ئەوانی دیکە لەبەرچاو دەگرێت، کردارەکەش ئاڕاستەی ئەوانی دیکەیە.

بە بۆچوونی ئەو زانای کۆمەڵناسی دەبێت ڕاڤەکردنێك پێشکەش بکات کە شایانی ئاستی ماناکە بێت، هەروەها دەبێت ڕاڤەکردنەکان لە ڕووی هۆکارییەوە شایستە بن، چونکە هەموو زانستێکی مرۆیی لە ئێستادا بەهۆی ڕاڤەکردنەوە کار دەکەن، ڕاڤەکردنیش لەسەر شێوازەی تایبەت دروستبووە کە کار دەکات بۆ ئەوەی ئێمە لە مانای چالاکییەك یاخود دیاردەیەك یاخود لە مانای سەرجەم توخمە جیاوازەکان تێ بگەین، ئەوەی وادەکات توێژەری کۆمەڵایەتی نازناوی زانای هەبێت ئەوەیە کە کارێکی ڕەخنەیی ئەنجامداوە، لە بنەمادا لەسەر شیکردنەوە و ڕاڤەکردن دروستبووە کە دەکرێت پێداچوونەوەی بۆ ئەنجام بدرێت[119].

لێرەدا تێبینی پەیوەندی دیالێکتیکی دەکەین لە نێوان ڕاڤەکردن و تێگەیشتن و دروستکردنی نموونەکان، ناکرێت نموونە دروست بکەین بێ تێگەیشتن و ناکرێت تێبیگەین بێ ڕاڤەکردنی ئەو ڕەفتارەی دەیبینین، ماکس ڤیبەر دەڵێت:

ڕاڤەکردنی هۆکارگەرایی ڕاست بۆ کردەیەکی نموونەیی بریتییە لەو پرۆسەیەی کە بە هۆیەوە کردە دەگاتە قۆناغی نموونەیی، بەشێوەیەك دەبێت ئەو کردەیە لەسەر ئاستی مانا گونجاو بێت، لەوکاتەی پێویستە

---

119 سوسیولوجیا ماکس فیبر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠.

ڕاڤەکردن گونجاو بێت لە لایەنی هۆکارگەرایيەوە، ئەگەر ئەو گونجانە لەسەر ئاستی مانا بوونی نەبوو، دەتوانین بەشێوەیەکی فەرمی پلەیەکی بەرزی ڕێکخستنی پێ بەخشی؟ ئەمە سەرەڕای پلەی گریمانەیی، کەواتە گونجان بریتییە لە ئەگەرێکی ئاماری نادیاریکراو بە شێوەیەکی دژوار دەبێت لێی تێبگەین[120].

ئەو کردە کۆمەڵایەتییەی کە بەتاڵە لە مانای خودی، بەردەوام لای ڤیبەر لە پەراوێزی توێژینەوەی سۆسیۆلۆجییە، بەڵام ئەمە بوونی کردەی سۆسیۆلۆجی بەدوور ناخاتەوە کە دژوارە هەندێکجار بەشێوەیەکی عەقڵی ڕاڤەی بکەین، ئەو ددانبەوەدا دەنێت کە هەندێکجار بکەر ناتوانێت بەهۆشیارییەکی تەواو دەرك بە هەندێك جۆری ڕەفتاری کۆمەڵایەتی بکات، هەروەك هەندێك ڕەفتار هەن تاك تیایدا بێتوانایە لە دەرککردنی مانای خودی ڕەفتارەکە، بۆ نموونە لە ڕەفتاری ملکەچبون بۆ نەریت و خو و ڕەفتاری ویژدانی هەڵچوونی.

تێگەیشتن لای ڤیبەر دوو ئامانج دەپێکێت: یەکەم، دەتوانرێت ئەو هۆکار و فاکتەرانە دەستنیشان بکات کە دەبێتە هۆی ڕوودانی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، دووەمیش، دەتوانرێت دەرك بەو مانا خودییە بکات کە لە دووتوێی کردە مرۆییەکەدا هەیە، بۆیە تێگەیشتن لای ڤیبەر دەبێت بە شێوەیەکی هۆکارگەرایی و گونجاوبێت لەسەر ئاستی مانا، چونکە مانا وامان

[120] - نيقولا تيماشيف، نظرية علم الاجتماع، طبيعتها، وتطورها، ترجمة محمد عودة واخرون، القاهرة، دار المعارف، ١٩٨٣، لا ٢٥٦.

لێدەکات چەمکی کردە و چەمکی ڕەفتار بە یەکەوەیان بەراورد بکەین، هەموو ڕەفتارێك کردەیەکی کۆمەڵایەتی نییە، ڕەفتار ئەو هەڵسوکەوتەیە کە مرۆڤ تێبینی دەکات لە دەرەوە، جیاوازە لە پاڵنەری ناوەکی، کە ناتوانین تێبینی بکەین، بەڵکو تەنیا بەوەندە دەوەستین کە تێبینی دەرکەوتەکەی بکەین کە ڕەفتارە، هەرچی ڕەفتاری کۆمەڵایەتییە پاڵنەر و ڕەفتارە پێکەوە، واتە ئامراز و ئامانجە لە یەك کاتدا[121]. ئەوکاتەی دایك لە منداڵەکەی دەدات بە هۆی کردەیەکی خراپ و ئازاری دەدات، ئامانجەکە لێدان نییە یاخود ئازاردان نییە لە خۆیدا، بەڵکو مەبەست لێی پەروەردەکردن و وریاکردنەوەی منداڵەکەیە.

[121]- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٨٩.

## باسی دووەم

### • شێوازە نمونەییەکان (تایپ ئایدیالەکان)

بە هۆی تێگەیشتنی مانای خودی لە توێژینەوەی سۆسیۆلۆژی لای ڤیبەر و پشت بەستنی بە ڕاڤەکردنی هۆکارگەرایی بۆ کردەی کۆمەڵایەتی، بوو بە پێشەنگ لە داڕشتنی تایپ ئایدیال، ڤیبەر باس لە تایپ ئایدیال دەکات و دەڵێت:

وەسفێکە بەشێوەیەکی لۆژیکی داڕێژراوە لە ڕوانگەیەکی دیاریکراو، دەتوانێت پەیوەندی نێوان ئامراز و ئامانج ڕوونبکاتەوە سەبارەت بە کردە و ڕووداوەکان و پرۆسەی ڕاڤەکردنی هزرەکان، بەشێوەیەك توێژەر دەتوانێت هزرە هەندەکییە جیاوازەکان و ڕاڤەکردن و پەیوەندییەکان وەربگێڕێت بۆ چەمکگەلێکی زانستی.

تایپ ئایدیال ڕێکارێکی میتۆدۆلۆجییە و یارمەتیدەرە لە توێژینەوەکرنی کردەی کۆمەڵایەتی لە میانەی بەراوردکردنی تایپ ئایدیال لەگەڵ واقیعی ئەزموونگەری بۆ سەلماندنی مەودای لادانەکانی ئەو واقیعە لە نموونە، یاخود هاوشێوەبون لەگەڵیدا... سەرەڕای ئەوەش ڤیبەر ئاماژەی بۆ ئەوەکردووە کە نموونە داڕێژراوەکان واقیعی نین، یاخود گوزارشت لە نموونەگەلێك ناکەن

کە بە کردەیی بوونیان هەیە، بەڵکو ئەوان یۆتۆپیان و مەرج نییە لەگەڵ پێدراوەکانی واقیع بگونجێت، ڤیبەر بە وردی پەیوەندی نێوان تایپ ئایدیالەکان بە واقیع و ئەرکی میتۆدۆلۆجی ئەو نموونانە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت:

ئەو وێناکردنە کۆمەڵێك پەیوەندی و ڕووداوی ژیانی مێژوویی لە نێو یەك سیستەمی ئاڵۆز بە یەکەوە دەبەستێتەوە کە بە بە یەکەوە گونجانی خود دەناسرێتەوە، لە لایەنی مادییەوە ئەو چەمکە هاوشێوەی چەمکی یۆتۆپیایە کە لە ڕێگایەوە شیکردنەوەیەکی ئەبستراکت بۆ هەندێك توخمە واقیعییەکان پێشکەش دەکەین. چەمکە ئەبستراکتەکانیش لە واقیع وەرگیراون، ئەگەرچی بەشێیوەکی واقیعی دەستەبەر دەکرێت، دەتوانین خەسڵەتە تایبەتەکانی ئەو پەیوەندییانە بەشێوەیەکی کردەیی ڕوون بکەینەوە بە گەڕانەوە بۆ تایپ ئایدیال. ناکرێت دەستبەرداری ئەو ڕێکارە بین ئینجا چ لە مەبەستەکانی نمایشکردن یاخود ڕاڤەکردن بێت. چەمکی تایپ ئایدیال یارمەتیدەر دەبێت لە پەرەپێدانی کارامەییەکانی توێژینەوە، ئەوەش گریمانەیەك نییە، بەڵام یارمەتیدەرە لە گەشەپێدانی گریمانەکان و دارشتنیان، هەروەك وەسفی واقیع ناکات، بەڵکو ئامانجی پێشکەشکردنی ئامرازی ڕوونە بۆ گوزارشتکردن لەم واقیعە، تایپ ئایدیال لە میانەی تایپ ئایدیال و ئەبستراکتکردنی ڕوانگەیەك یاخود زیاتر دەبێت، ڕێکخستنی کۆمەڵێك دیاردەی جۆراوجۆری تاکی بەرهەست و دواتر ڕێکخستنیان بەپێی ئەو ڕوانگەیە لەنێو بونیادێکی لۆژیکی شیکاری، ئەو بونیادە عەقڵییەش

بەشێوەیەکی ئەزموونی دەستەبەر نابێت بە پرسیارنامە ه پەتییەکەی، ئەمە یۆتۆپیایە وەك باسم کرد. توێـژەری مێـژوویی ئـەرکی دیـاریکردنی مـەودای نزیکی و دووری واقیعە لە تایپ ئایدیال[122].

تیماشیف مەبەستی ڤیبـەر لـە تایپ ئایـدیال ڕووندەکاتـەوە، پێیوایـە ئـەو نموونەیە بریتییـە لـە دروسـتکردنی گرێبەسـتێکی عـەقڵی لـە میانـەی ڕوونـی خەسڵەتێك یان زیاتر یاخود چەندین ڕوانگە دروست دەبێـت کـە دەکرێـت لـە واقیعدا تێبینی بکەین، بەڵام ئەمە لە واقیعدا بە رەهایی بوونی نییە، لێـرەوە پێی دەگوترێت ئایدیالی، چونکە تەنیا وەك بیرۆکەیەك دەستەبەر دەبێت[123]. هەروەها تیماشیف ئـەوە ڕەتدەکاتـەوە تایـپ ئایـدیال گریمانـە بێـت، بـەڵکو ئامرازێکـە بـۆ شـیکردنەوەی ڕووداوە مێژوویـیـە بەرهەسـت و هەڵوێسـتەکان، بۆیـە دیـاریکردن و ڕوونکردنـەوەی چـەمکەکانی پێویسـتە. تایـپ ئایـدیال چــەمکێکی دیــاریکراوە و ســوودی هەیــە بــۆ بــەراوردکردنی هەڵوێســتە واقیعییەکان لە ژیان و کـردەی لێتوێـژراو، توێژینـەوەکردنی واقیـع بـە پشـت بەسـتن بـەو ئایدیالانــە یارمــەتیمان دەدات لــە دروســتکردنی پەیوەنــدی هۆکارگەرایی لە نێوان توخمەکانی تایپ ئایدیال.

بۆ دروستکردنی تایپ ئایـدیال ڤیبـەر پشـتی بـە پـۆلێنێکی چـوار لایـەنی بـۆ کردەی کۆمەڵایەتی بەست، چوارچـێوەی کـردەی کۆمەڵایـەتی دیـاری کـرد و

[122]- weber, the methodology of the sciences, p 90.

وەرگیراوە لە محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٠٤-٣٠٥.

[123]- نیقولا تیماشیف، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٦.

هەر جۆرێکیشیان نموونەیەکە دەکرێت ڕاڤە بکرێت و بەهۆی ڕەفتار و واقیعە کۆمەڵایەتییەکان، بێ ئەوەی نمونەکە بەتەواوی هاوشێوە بێت لەگەڵ شێوازی کردەکە[١٢٤].

## یەکەم: کردەی عەقڵانی بەلەبەرچاوگرتنی ئامانج

ئەمە عەقڵانییەتەکەی لە میانەی پێشبینیکردنی ڕەفتاری بابەتەکانی ژینگەی دەرەکی، یاخود ڕەفتاری کەسەکانی دیکە دیاری دەکرێت لە لایەن بکەرەوە، ئەو کردەیەش بەوە جیا دەکرێتەوە کە بکەرەکە بە ڕوونی دەرك بە ئامانجێکی دیاریکراو دەکات کە دەیەوێت دەستبەری بکات، ئامرازی گونجاوی هەیە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە بۆ نموونە ئەندازیار، یاخود پزیشك، یاخود سەرکردەی سەربازی.

## دووەم: کردەی عەقڵانی کە بە بەهایەك بەستراوەتەوە

ئەمەش ئەو کردەیەیە کە مەبەست لێی دەستەبەرکردنی ئامانجێکی سەرەکی دیاریکراو نییە سەبارەت بە تاك هێندەی ئەوەی دەسکەوتەی کە لە میانەی بیروباوەڕ بە بەهای داواکراو بە دەست دەهێنرێت. لێرەدا بکەر بە شێوەیەکی عەقڵانی ڕەفتار دەکات نەك لە پێناو ئامانجێکی عەقڵانی، یاخود بەرژەوەندییەك بەڵکو دڵسۆز دەبێت بۆ بیرۆکەیەك یاخود بەهایەکی پایەدار لای خۆی وەك جیهادکردن لە پێناو خودا و نیشتیمان.

---

١٢٤- علي ليلة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٢٩، هەروەها، محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣١٧.

### سێیەم: کردەی سۆزداری

ئەو ڕەفتارەیە کە لەسەر حاڵەتی هەستی تایبەت کە بکەرەکە تێیدا دەژین، دروستبووە، بەشێوەیەك مرۆڤ ئامرازەکان هەڵدەبژێرێت نەك لەسەر بنەمای پەیوەستیان بە ئامانج و بەهاکان بەڵکو بەهۆی ئەوەی لە حاڵەتێکی هەڵچونی سۆزداری سەرچاوە دەگرێت وەك لێدانی منداڵ لە لایەن دایکەوە یاخود ئەو شەقەی کە یاریزانێك لە یاریزانێکی دیکەی دەدات لە یاری تۆپی پێ، دەرچوونی خەڵك لە سیما ئاشتییەکان و دواتر هەڵچونی خۆپیشاندەران، پاشان ئاژاوە دەکەن و دواتر پیاوانی پۆلیس دەستوەرداتە ناو کارەکان و ڕەنگە خەڵك بکوژرێت یان بریندار بێت، ئەو کردارانە لە پێشوتردا نەخشەی بۆ نەکێشراوە.

### چوارەم: کردەی نەریتی

ئەو کردەیە کە نەریت و بیروباوەڕەکان بڕیاری لەسەر دەدەن، بە شێوەیەك دەبێتە شتێکی ئاسایی و جێگیر بۆ مرۆڤ، ئەو کرەیە نائیرادییە چونکە وەك مەرجێك بەسەریدا سەپێنراوە، وەك ڕۆژوگرتن و حەجکردن و گوێڕایەڵیکردنی گەورەی خۆت....هتد.

ڤیبەر میتۆدەکەی خۆی بۆ توێژینەوەکردنی چەندین دیاردە بەکارهێناوە، ئینجا چ لە توێژینەوە ئابووری بێت، بۆیە توێژینەوەی ئەخلاقی ئابووری

ئایین کردووە لە میانەی توێژینەوەکانی لە بارەی ئایینە جیهانییەکان[125]، یاخود توێژینەوەکەی لە بارەی دەسەڵات و بیرۆکراسییەت..هتد.

لە توێژینەوەکەی لە بارەی دەسەڵات پێیوایە دەسەڵات ڕەوایەتی خۆی لە سێ سەرچاوە وەردەگرێت، لەم کۆنتێکستەدا میتۆدی تایپ ئایدیالی بەکارهێناوە، لەم بوارەدا سێ جۆری بۆ دەسەڵات دیاری کردووە ئەوانیش:

### ١. دەسەڵاتی عەقڵانی

ئەمەش باشترین جۆری دەسەڵاتە، نموونەی باوە لە سیستەمە سەرمایەدارییەکاندا کە لەسەر بیرۆکراسییەت دروستبووە. لەم نموونەیەدا سیستەمێك لەو ڕێسایانە دەبینینەوە کە بەشێوەیەکی یاسایی و کارگێڕی پراکتیزە دەکرێت بە گوێرەی کۆمەڵێك پرەنسیپی دڵنیا و جێگیر لە نێو ئەندامەکانی گروپدا. ئامانجی ئەو دەسەڵاتەش بریتییە لە دروستکردنی پەیوەندییەکان لەسەر بنەمای عەقڵ و عەقڵانییەت، بێ بەستانەوە بە کەسێکی دیاریکراو یان زەمەنێکی دیاریکراو.

### ٢. دەسەڵاتی نەریتی

ئەو دەسەڵاتە دروستبووە لەسەر بنەمای باوەڕکردن بە پیرۆزی نەریتە جێگیرەکان، هەروەها بە پێچەوانەی ئەوکەسانەی دەسەڵاتیان هەیە،

---

١٢٥- ماكس فيبر، الاخلاق البروتستانتية و روح الراسمالية، ترجمة محمد علي محمد، بيروت، مركز الانماء العربي، د.ت.

دەسەڵات ڕەوایەتی لە مێژوو، یاخود لە پیرۆزی کەسە دامەزرێنەرەکانی وەردەگرێت.

### ٣. دەسەڵاتی کاریزمی

پشت بە وەلا و پەیڕەوکردنی خەڵکە لە کەسێکی دیاریکراو کە ئیمتیاز و توانای دەگمەن و خەسڵەتگەلێکی کەسی وەهای هەیە دژوارە لە کەسی دیکەدا هەبێت. ڤیبەر پێیوایە زۆرینەی گۆڕانە مەزنەکان لە مێژوو کۆمەڵگای مرۆییدا ئەنجامی کاری ئەو تاکە خاوەن توانا کاریزمییانەیە. هەروەها پێیوایە دەسەڵاتی کاریزمی یەکەمجار پەیوەستە بە ئایین، دواتر لە چاخی نوێ هێواش هێواش مۆرکێکی سیاسی وەرگرتووە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە میتۆدی تایپ ئایدیال پانتایی تازەی بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دروستکردووە، وای کردوە توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان بتوانن توێژینەوەی کۆمەڵایەتی ئەنجام بدەن لەسۆنگەی نموونەی بونیادی، توێژەرەکان تایپ ئایدیالیان لە توێژینەوە بونیادی و ئەرکگەرییەکانیان بەکارهێناوە، لە نێویشیاندا لیڤی شترواس و کارل بێرسۆن، لە مبارەیەوە لیڤی شترواس دەڵێت:

بیرۆکەی بونیادی کۆمەڵایەتی پەیوەست نییە بە واقیعی ئەزموونی، بەڵکو پەیوەست بەو نمونانەی کە هاوشێوەیی ئەو واقیعە دروستدەکرێت[١٢٦].

[١٢٦]- ریمون بودون، مناهج علم الاجتماع، لا ١٣٢.

ریمۆن بۆدۆن پێیوایە چەمکی تایپ ئایدیال سروشتی بە توێژینەوەی میتۆدۆلۆژی هاوچەرخ بەخشیوە، بەلاّم لە هەمان کاتیشدا ددانبەوەدا دەنێت کە پرسی دروستکردنی چەمکی لۆژیکی و تایپ ئایدیال لە کۆمەڵناسی ڕووبەڕوی ئاستەنگ دەبێتەوە.

## بەشی دووەم

## میتۆدی ئەرکگەری و میتۆدی نەسەقی

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، وەك پەرچەكردارێك بۆ ماركسیزم كە باس لە ململانێی كۆمەڵایەتی و شۆڕش دەكات، وەك پەرچەكردارێك بۆ بوونگەرایی، كە بایەخی بە خودی مرۆڤ دەدات زیاتر لە ژینگەی دەوروبەری، واتە زیاتر بایەخ بە ناوەوەی مرۆڤ دەدات وەك لە دەرەوەی، ئاراستەیەكی فەلسەفی سەریهەڵدا (هەرچەندە لایەنگیرانی ئەوە ڕەتدەكەنەوە پێیان بگوترێت فەیلەسوف)، گۆڕەپانی بیركردنەوە و شیكردنەوە و تیۆردانان و زمان و ئەدەب و بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانی داگیركرد، ئەم ڕەوتە بریتیە لە بونیادگەری ، ، كانێكیش تێكەڵ بە شیكردنەوەی ئەركگەری بوو، بە خێرایی كەموكوڕییەكانی خۆی تێپەڕاند، لێرەو ناوی بونیادگەری ئەركێتی وەرگرت ، لە سەردەستی بیرمەندەكانی بە تایبەتی میرتۆن كە ممارەسەی ڕەخنەو ڕەخنەلە خۆگرتنیان دەكرد، دواتر شوێنی خۆی بۆ میتۆدی سیستماتیكی یان نەسەقی چۆڵ كرد.

ئایا ئەو میتۆدە چییە و چۆن پەرەیسەندووە، بوارەكانی پراكتیكردنی چین؟

## باسی یەکەم

## تێڕوانینێکی چەمکئامێزانە

### ١. چەمکەبنەڕەتیەکان

بێگومان پسپۆڕەکان لە میتۆدە وردەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان زانستە کۆمەڵایەتییەکان سەبارەت بە هەموو زانستێك، دەتوانن خاڵی هاوبەش یان یەکتر بڕ لە نێوان بونیادگەری و ئەرکگەری و سیستماتیکی ببیننەوە، لە پاڵ خاڵی جیاکەرەوەی نێوانیان، بەشێوەیەك بکرێت لە بارەی میتۆی بونیادگەری و ئەرکگەری و سیستماتیکی وەك میتۆدگەلێکی سەربەخۆ قسە دەکەین ، بە تایبەتی لای پێشڕەوە سەرەتاکانی ئەو میتۆدانە، یاخود لە چوارچێوەی یەك میتۆدی شیکردنەوەدا ئاوێزانیان بکەین، وتەی هەرسێ ئاراستە بەکاربهێنێت، ئەمەش بوو لە لایەن ئەرکگەرە هاوچەرخەکان پەیڕەوکرا، لە نێویشیاندا گۆڵدنەر کە دەڵێت بنەمای هزری شیکردنەوەی ئەرکگەری لە کۆمەڵناسی بریتییە لە چەمکی سیستەم، کە مانای کۆمەڵێکی بە یەکەوە گونجاوە، هەموو ڕەگەزەکانی بەشێوەیی جیاواز بەشداری دەکەن لە گەیشتن بە یەك ئامانج، ئەو سیستەمە لە کۆمەڵێك لقە سیستەم پێکدێن[١٢٧].

[١٢٧] - موريس وفرجيه، سوسيولوجيا السياسة، ترجمةی هشام ذياب، ١٩٨٠، لا ٢٨٨ و دواتر، هةرضی سةبارةت بة هزرةكانی طؤلدنةرة نةوا بروانة:

لە ڕاستیدا لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان دژوارە بونیاد و ئەرك و سیستەم لە یەکتر جیابکەینەوە، بونیادگەری پێویستی بە ئەرك هەیە و ئەوەی دوایش دەرك ناکرێت بێ بوونی بونیادێك کە کاریگەری لێ دەکات و کاریگەر دەبێت پێیەوە، هەمان شتیتش بۆ سیستەم ڕاستە کە بونیاد و ئەرك لەخۆ دەگرێت، بۆیە دەتوانین بڵێین چەمکەکانی بونیاد و ئەرك و سیستەم سێ ڕەگەزی سەرەکی میتۆدی شیکردنەوەن کە شیکردنەوەی بونیادی ئەرکگەرییە لە دوو وێنە کۆن تازە_سیستماتیکەکەی، هاوکێشەی هاوبەشی نێوان ئەو سێ چەمکە بریتییە لە: بونیاد+ئەرك= سیستەم، سیستەم یان ڕێکخراوێك ، ئەم سیستەمە یان نەسەقە جگە لەو ئەرك و کارلێکانەی کە لەنێو یەك بویناددا ڕوو دەدەن هیچی تر نیە.

ئەمە تەنیا خۆی لەتێکەڵبونی نێوان ئەو سێ چەمکەدا نابینێتەوە، بەڵکو ئەرکگەراکان پەنایان بۆ ئامرازی شیکاری میتۆدۆلۆژیای دیکەش بردووە ، لە نێویشیاندا تایپ ئایدیال کە لە لایەن ماکس ڤیبەرەوە دامەزراوە. ئەمەش لە لایەن یەکێك لە دامەزرێنەرانی بونیادی ئەرکگەری ڕوونکراوەتەوە، ئەویش لیڤی شتراوسە، ئەوکاتەی دەڵێت: (چەمکی بونیادی کۆمەڵایەتی تەنیا بە سەر واقیعی ئەزموونی کورتنابێتەوە، بەڵکو بەسەر ئەو نموونانەی کە دروست دەکرێت لە میانەی هەمان واقیع[١٢٨]، کەچی ئەمە مانای ئەوە نییە

---

Gauldner Alvin A recioproccity and Autonomy in functional theoty, 1967.
G. the coming crisis of western sociology A non books New York 1970.
[128]- C. leve straus, Elementry structure of Kinship Eyre and sportis woode. 1969.

شترواس مامەڵە لەگەڵ بونیادگەری دەکات بە دابڕاوی لە واقیع، بەڵکو جەختی لەسەر پێویستی بە یەکەوە بەستانی ئەوە دەکات بە ئەزموون لەگەڵ لایەنی تیۆری، دۆزینەوەی بونیادێك بەستراوەتەوە بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی ئەزموونی[۱۲۹].

ئەو تێکەڵبون و ناڕوونییەی چەمکەکان هۆکارێك بوو لە ئاراستەکردنی ڕەخنە بۆ ئەم ئاراستەیە، بەڵکو زیاتر لەمە گومانیش دروستبووە لە بارەی ئەوەی کە ئایا بونیادی ئەرکگەری هیچ شتێکی خستۆتە سەر شیکردنەوەی زانستی، ئەو ناڕوونییەش تەنیا بەسەر توێژەرە تازەکان کورت نەبۆتەوە، بەڵکو ئەمە لای پێشڕەوە سەرەتاکانی ئەو میتۆدە بوونی هەیە، گۆرڤیچ ئاماژە بۆ ئەمە دەکات و دەڵێت (ئێمە دەبینین چەمکەکانی وەك سیستەم و بونیاد و دامەزراوەکان هەرکەیان ئەوی دیکەیان دیاری دەکات، بەڵکو پارسۆنز تایپ بەمانای بەکارهاتوو لای ڤیبەر تێکەڵدەکات لەگەڵ بونیاد، هەندێك جاریش لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، ئەمەش ئەوە ئاشکرا دەکات کە پارسۆنز بێتوانابووە لە دیاریکردنی بەشێوەیەکی ورد، هەروەها ئەوە ئاشکرا دەکات کە بێتوانابووە لە دەرککردنی واقیعی کۆمەڵایەتی وەك گشتێکی جۆری و دینامیکی)[۱۳۰].

129- C. levi strauss, Le regard elorigne 1989, p 145.

۱۳۰ - علي القصير، منهجية علم الاجتماع بين الوظيفية و الماركسية و البنيوية، القاهرة، ۱۹۸۵، لا ۱۷٤.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بونیادی ئەرکگەری و دواتر شیکردنەوەی سیستماتیکی پانتاییەکی زۆری داگیرکرد لە بواری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، ئینجا چ هەڵوێستی ئەو کەسانەی بانگەشەیان بۆ دەکرد لەسەر ئەندێشەی زانستی پەتی دروستبوبێت، یاخود خاڵی دەسپێکردنیان وەڵامدانەوەی شیکردنەوەی مارکسیزم و بەرگریکردن بێت لە سەقامگیری و جێگیری کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان. سەرەڕای ئەو قسانە، دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەرکگەری و سیستماتیکی تەنیا میتۆدگەلێکی زانستی نین، بەڵکو دەروازەی میتۆدی و چوارچێوەی شیکردنەوەن کە توێژەر بەکاریاندەهێنێت نەك وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ میتۆدەکانی دیکە بە تایبەتی مەیدانی، بەڵکو لە پاڵ ئەوان بەکاریان دەهێنێت، ئەو میتۆدانە چوارچێوە، یاخود کۆسیستەمی شیکردنەوەن و بەکاردەهێنرێن ئینجا چ لە سەرەتای دەسپێکردنی توێژینەوە بێت، یان لەسەر ئاستی دیاریکردنی شیکردنەوە و دانانی گریمانەکان بێت، یاخود لە قۆناغی شیکردنەوەی زانیارییەکان و نووسینی ڕاپۆرتی توێژینەوە بێت.

ئەرکگەری و سیستماتیکی میتۆی بیرکردنەوە ئەو شیکردەوەن کە لەسەر گریمانەکردنی چەند پرەنسیپێك وەستاون کە دەبێت کۆمەڵگا گوزارشت لە سیستەمێك بکات کە لە کۆمەڵێك سیستەمی کۆمەڵایەتی و شێوازی دیاریکراوی کولتوور پێکهاتووە، ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەش ملکەچی ڕێکخستنێکی دیاریکراو و شێوازی کردەی کۆمەلایەتییە کە دەچێتە نێو ستراکچەرێکی تایبەت بە خۆیەوە، ڕیشەکانی لە پێداویستی و

بەرژەوەندەییەکانی مرۆڤ قایم کردووە و لەسەر سۆزێکی بەهێز دروستبووە، بەرجەستەکەری ئەو بەها کۆمەڵایەتی و کولتورییەیە کە دەزگای ماددی و عەقڵی و ڕۆحییە و بەشێوەیەکی تۆکمە بە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان بەستراوەتەوە، واتە شێوازە کولتورییەکان بە داڕشتنی سیستماتیکی کۆمەڵگا بەستراونەتەوە، بۆیە دەکرێت بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا شیبکەینەوە لە ژێر ڕۆشنایی ناوەڕۆکی سیستەمی کولتووری لە کۆمەڵگا. لەگەڵ ئەوەی ئەو سیستەمە چەندین لقە سیستەم لەخۆ دەگرێت کەچی هەموویان بەیەکەوە بەستراون و کارلێك لەگەڵ یەکتر دەکەن لە ڕووی ئەو ڕۆڵانەی کە لە چوارچێوەی گشتیدا دەیگێڕن، لێرەوە ڕۆڵی شیکردنەوەی بونیادی ئەرکگەری لەسەر دیاردە هەندەکییەکان ناوەستێت، بەڵکو لەسەر ڕاڤەکردنی دیاردە هەمەکییەکان بۆ تێگەیشتنی کارلێك و یەکانگیری و پشت بەستن ئاڵوگۆڕ لە نێوان سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و کولتوور دەوەستێت.

کاتێك دەگوترێت ناوەڕاستی سەدەی بیستەم مێژووی دروستبوونی بونیادی ئەرکگەرییە وەك میتۆدێك لە نێو میتۆدەکانی دیکە، مانای ئەوە نییە کە ئەمە مێژووی لە دایکبوونییەتی، بەڵکو ئەمە مێژووی پێگەیشتن و تەواوبونییەتی وەك کۆسیستەمێکی هزری کە لایەنگیرانی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەتوانێت کێبڕکێی تیۆرەکانی دیکە بکات لە بواری شیکردنەوەی سیاسی، هەرچی مێژووی لە دایکبوون و باوکە ڕەسەنەکانییەتی، ئەوا دژوارە بە وردی یاری بکرێت، چونکە ئەو بیرمەندانەی کە بەشداریانکردووە لە

دروستکردنی وتە سەرەکییەکانی زۆرن و لە چەند سەردەمی جیاوازدان، بەلام ناتوانین بڵێین ئەوانە ئەرکگەرن بە مانا تازەکەی وشەکە، گرنگترینیشیان ئۆگۆست کۆنت و برۆدۆن[١٣١] و سان سیمۆنن، پاشان سپنسەر و بەشدارییەکانی لە بواری تیۆری ئۆرگانی، ماکس ڤیبەر و شیکردنەوەی بۆ بیرۆکراسییەت، کرۆزێ و شیکردنەوەی بۆ هەمان دیاردە، زاناکانی زمان (لەسەروو هەموشیان سوسێر) بەشدارییەکانیان لە بارەی بونیادگەری، زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجیا وەك لیڤی شترواس و پەرەپێدانی وتەکانی سۆرۆکین[١٣٢]، هەروەها پەرەسەندنەکانی بەمداوییەی لەسەر دەستی زانایانی سیاسەت وەك دایڤید ئۆستن، ....هتد. ناکرێت قسە لەسەر ئەرك یاخود سیستەم بکرێت بێ بوونی بونیاد کە هەموو ئەرك و سیستەمەکان لەخۆ دەگرێت، بۆیە یەکەمجار گرنگە بونیادگەری بناسێنرێت.

### ٢. بونیادگەری

چاوگی وشەکە لە وشەی (Structur)ەوە هاتووە بە مانای پێکیهێنا ،دروستی کرد ، بونیادی نا، هەرچی مانای زاراوەییە، وەك فەیلەسوفەکان بەکاریانهێناوە بونیادگەری واتە تۆ مامەڵە لەگەڵ شتێ دەکەیت کە بونیادێکی هەیە، واتە بێ فۆرم وشێوەی تایبەتی خۆی نییە، سیستەمێك و پێکهاتەیەك پێکدێنێت و نیزامی تایبەتی خۆی هەیەلە بارەی پێکهاتن و یەکێتی گونجانی

[131]- brodon, systeme des contradictions economiques 1946.
[132]- Sorokin pitrim, Antropologies structural deux/ Edition plon, 1973, p 139.

ناوەکی و ئەو یاسایانەی کە ڕێکی دەخەن و ڕێگای بە بەردەوامیبونی دەدەن، ئەوان لە ڕێگای میتۆدەکانەوە دەیانەوێت مامەڵە لەگەڵ شتەکان بکەن بە دوور لە ئایدیۆلۆژیاو هەموو کارتێکەرە دەرەکییەکان، ئەمەش وا دەکات بونیاد ناوەڕۆکێکی مسۆگەری هەبێت: ئەوە خودی ناوەڕۆکە لە نێو ڕێکخستنێکی لۆژیکی کە بە خەسڵەتێکی واقیع دادەنرێت، بۆیە ئەوان مۆرکێکی زانستی بە میتۆد و فەلسەفەکەیان لە شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی دەدەن.

بونیادگەری لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا وەك ئاراستەیەکی فەلسەفی بەرهەڵستکاری بونگەرای بوو لە لایەك، مارکسیزم لە لایەکی دیکەوە، کەچی بونیادگەرەکان ئەوە ڕەتدەکەنەوە بونیادگەری وەك فەلسەفە پۆلێن بکرێت، بەڵکو ئەوان پێیانوایە بونیادگەری مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە؟ یەکێك لەو وانانەی کە لەم مێژووە پێیی گەیشتوون ئەوەیە کە ناکرێت بونیادگەری ڕێبازێك، یاخود فەلسەفەیەکی تایبەت بێت، بەڵکو بونیادگەری میتۆدێکی تایبەتە بە تەواوی ماناکانی نێو ئەم گوزارشتە[١٣٣].

چاکەی تیشکخستنە سەر گرنگی شیکردنەوەی بونیادگەری بۆ دیاردەکان دەگەڕێتەوە بۆ زانایانی زمانەوانی، لای سۆسێر (کە یەکێکە بە پایە سەرەکییەکانی توێژینەوەی زمانەوانییە)، دەبینین کە بونیاد پێناسە دەکات

---

١٣٣- هەمان سەرچاوە، لا ١٤٧.

بەوەی کە سیتەمێکە و تەنیا سیستەمی تایبەتی خۆی دەناسێت[١٣٤]،
بونیادگەری وەك باسمان کرد سەرنجی چەندین زانای ڕاکێشا لە بواری جیاجیا و ئاراستەی جۆراوجۆر، وەك ئەدەب و ئەنسرۆپۆلۆجیا و کۆمەڵناسی و زانستی سیاسەت.

بەمشێوەیە بیاجێ بونیادگەری پێناسە دەکات و دەڵێت:

(بونیاد سیستەمێك لە وەرچەرخانە و یاسای تایبەتی هەیە بەوپێیەی کە سیستەمێکە لە بەرامبەر خەسڵەتە جیاکەرەوەکانی ڕەگەزەکان)، دەبێت ئەوە بزانین کە ڕەنگە ئەو سیستەمە بوونی هەبێت و دەوڵەمەنددیکە بێت بە هۆی ئەو ڕۆڵەی کە ئەم وەرچەرخاننانە دەینوێنن، بێئەوەی ئەو وەرچەرخانانە لە چوارچێوەی ئەو سیستەمە بچنە دەرەوە، یاخود هیچ ڕەگەزێك بهێنرێتە ژوورەوە لە دەرەوەی خۆی[١٣٥].

لە هەمان نێوکۆدا شتروا‌س بونیاد پێناسە دەکات و دەڵێت: (بونیاد پێش هەموو شتێك هەڵگری مۆرکی سیستەمە، بونیاد لە چەندین ڕەگەز پێکدێت کە ڕەنگە هەر گۆڕانێك بەسەر هەریەکێکیاندا بێت، ببێتە هۆی گۆڕان لە ڕەگەزەکانی دیکە)[١٣٦].

١٣٤ - عبدالعزيز حمودة، المرايا المجدية(من البنيوية الى التفكيكة)،الكويت، سلسلة عام المعرفة، عدد ٢٣٢ ابريل ١٩٨٨ لا ٢٠٣.

135. Piager (J) le structuralism , que sais- je? Ed: PUF, 1969, p 8.

136- Op cit, p 11.

هەرچی چۆنییەتی بە کارهێنانی بونیادگەرییە وەك میتۆدێك ئەوا شتڕواس لە کتێبیی (تۆتەمیزمی چاخی ئێستا) دەڵێت (لەسەر توێژەر پێویستە کۆمەڵێك هەقیقـەتی پـەرتوبلاو کـۆ بکاتـەوە لـە لیسـتێکی گشـتیتر، دووەمجـاریش ڕایەڵەکانی نێوان ئەو هەقیقەتانە بدۆزێتـەوە و لـە گروپـدا پۆلێنیـان بکـات و پەیوەندییـە ناوەکییـەکانیان دیـاری بکـات، سـێیەمیش، بەشـەکان لەیـەك پێکهاتە کۆکباتەوە، واتـە ڕەگـەزە دیاریکراوەکـانی یـەك سیسـتەم، بەمـەش بابەتێك بۆ توێژینەوە بەرهەمدەهێنێت کە تاقانە و کاملە)[137].

چەندین گۆڕان لە نێو لقە سیستەمەکان ڕوو دەدات، بەڵام ئەو گۆڕانانـەی لـە لقە سیستەمەکان کاریگەرییان نابێـت لەسـەر سیسـتەم_بونیـاد، سیسـتەمی خودی تێکنادەن.

لەو پێناسـانەی بـۆ بونیادگـەری و خەسـڵەتەکانی، دەتـوانین لـە بانگەشـەیە تێبگەین کە چ پاڵپشتیکار یان بەرهەڵستکارانی باسی دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە وەك پەرەچەکردارێك هاتووە لە دژی بوونگەرایی، کە جەخت لەسەر مرۆڤ دەکـات وەك خـودێکی ئـاکتیڤ بـە دابـڕاوی لـە دەوروبـەری، هـەروەها وەك پەرچەکردارێکە لە دژی مارکسیزم کە بایەخ بە ململانێ و تێپەڕاندنی بونیادە جێگیرەکـان دەدات، وەك ئـەوەی هاتبێـت بـۆ لەرزانـدنی پایـە هزرییـەکانی مارکسیزم، ئەو نموونە تازەیە کە ئامانجی توێژینەوەکەی جەختدەکاتە سـەر ئاشکراکردنی بونیاد و ئەرك و یاسا ناوەکییەکانی، دەستبەرداری شیکردنەوە

---

137- علي القصير، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٢.

و ململانێ و ڕەوتی بووە بایەخ بە توێژینەوەی چەسپاوەکان و دووبارە بەرهەمهێنانەوە دەدات، هەرچی نموونەی مارکسییە، ئەوا ئامانجی سەنتەرییەکەی بریتییە لە شیکردنەوەی ئەنجام وکۆتایی شۆڕشگێڕییانەی کۆمەڵگای سەرمایەداری(١٣٨).

## بونیادگەری لیڤی شتراوس

شتراوس بە گرنگترین بونیادگەرا دادەنرێت کە پێگەیەکی بە بونیادگەری بەخشیوە، تاوەکو بتوانێت بانگەشەی زانستیبوون بکات لە توێژینەوە و تێگەیشتنی واقیعی کۆمەڵایەتی، لە بنەمادا توێژینەوەکانی چڕ بۆتەوە لەسەر سیستەمەکانی خزمایەتی و ئەفسانەکان، شتراوس پێیوایە بونیادگەری ئامرازێکی میتۆدییە و یارمەتی توێژەر دەدات بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکان لە میانەی ڕ 'نین لە واقیع وەك بونیادێك، بۆ نموونە کەسایەتی، دەستە، کۆمەڵگا، کولتوور...هتد، ئەگەر بێ شێوە نەبێت، بونیادێکی هەیە، بەڵام تاوەکو بونیادی دیاردەیەك بوونی هەبێت پێویستە چوار مەرجی سەرەکی بونیان هەبێت، ئەوانیش:

١. دەبێت ڕەگەزەکانی ئەو دیاردەیە بە یەکەوە بەستراوبن، واتە سیستەمێك دروستبکەن کە ڕێسای دیاریکراو حوکمی دەکات.

١٣٨ - بيار انصار، العلوم الاجتماعية المعاصرة، ترجمة نخلة فريفر، المركز الثقافي العربية، بيروت، الدار البيضاء:ط١ ١٩٩٢، لا ١٥.

٢. کاریگەری ئاڵوگۆڕی نێوان توخمەکانی یەك دیاردە، بەشێوەیەك هەر گۆڕانکارییەك بەسەر هەر توخمێك دابێت کاریگەری لەسەر تەواوی توخمەکانی دیکە دەبێت، بەو مانایەی کە بونیادی ڕەسەن دەتوانێت بونیادی تازە لە خۆ بگرێت لەگەڵ هەر گۆڕانێك کە بەسەر توخمەکانی دابێت.

٣. توانای پێشبینیکردنی ئەو شتانەی کە بەسەر بونیاد دادێت، بە هۆی گۆڕانی هەر ڕەگەزێك.

٤. ئەو بونیادەی کە توێژینەوە دەکرێت دەبێت زۆرینەی واقیعەکانی تێبینیکراوی تێدابێت کە پەیوەستە بە دیاردە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە شترواس کاتێ قسە لەسەر دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکات وەك شت، یاخود هزر لێیان ناڕوانێت بەڵکو وەك بونیاد لێیان دەڕوانێت، لە میانەی بایەخدانە ئەتنۆلۆجییەکانی بە تایبەتی توێژینەوەکانی لە بارەی پەیوەندییەکانی خزمایەتی، لەمانەوە گەیشتە بڕوایەك کە ئەو پەیوەندییانە تاکە کۆنتێکستن کە تیایدا چەمکی بونیادیان تێدا بەدەردەکەوێت، پەیوەندی کۆمەڵایەتیش ماددەی یەکەمی بە کارهاتووە لە دارشتنی نموونەی ڕوونکەرەوەی بونیادی کۆمەڵایەتی[١٣٩].

شترواس لە شیکردنەوەی بونیاددا پەنای بۆ شێوە یان نموونە بردووە، لەسەر شێوازی ڤیبەر، بەشێوەیەك پێیوابوو بونیادی کۆمەڵایەتی چەمێکی

١٣٩ - سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

سەرەکی و سەنتەرییە لە میتۆدی بونیادگەری و خۆی لە واقیعی ئەزموونی نابینێتەوە، بەڵکو نمونەیەکە و لەو واقیعە دروستبووە، تاوەکو لە ڕاستی واقیع دڵنیا بین دەبێت لە بونیادی نەستی و نادیاریکراوی تاکەکان دەستپێبکەین، کە ڕێگای بۆ خۆی خۆشدەکات لە میانەی ڕەفتاری ئەو تاك و دامەرزاوە کۆمەڵایەتییانەی کە دروستی دەکەن و ئەو پەیوەندییانەی کە دەچنە نێوی بێ ویستی خۆیان، شترواس پێیوایە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ئەو ماددە سەرەتاییەن کە بۆ دروستکردنی نموونەگەلێك بەکاردەهێنرێت کە بونیادێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو دەردەخات، بونیادیش وەك سیستەمێکی وێنەیی لە بارەی بابەتەکە بوونی هەیە، بەڵام زانا ناچارە کار بۆ ئاشکراکردنی بکات لە میانەی دروستکردنی نموونەگەلێك بۆ ئەوەی ئاشکرای بکات.

بونیاد ئەو واقیعە ئەزموونگەرییەیە کە تێبینیکردنی ڕووکەشی پەتی پێمانی دەبەخشێت، هەرچی واقیعی زانستییە، ئەوا دەبێت ئەودیو پێدراوی ڕاستەوخۆکان و پەیوەندییە بینراوەکان ئاشکرا بکات، چونکە ناکرێت بەم ئاستانە بگەین تەنیا بە هۆی پرۆسەی بونیادنانی هەڵهێنجاندن نەبێت بۆ هەندێك نموونە ئەبستراکتەکان(١٤٠).

بەمشێوەیە ئەو ئامرازە میتۆدۆلۆجییەی کە شترواس بە کاری دەهێنێت بۆ توێژینەوەکردنی بونیاد بریتییە لە نموونەکان، ئێمە مەعریفەی زانستیمان

---

١٤٠- شتراوس، النثروبولوجية البنيوية، ترجمة مصطفى صلاح، ١٩٧٧، لا ٣٥٧.

سەبارەت بە واقیعی کۆمەڵایەتی بەدەستناکەوێت بۆ توێژینەوەکردنی بونیادی کۆمەڵایەتی لە میانەی ئەو نمونانە، چونکە بە بۆچونی ئەو ئەم بونیادە لەسەر ئاستی واقیعی بینراو ئاشکرا نابێت، بەڵکو تەنیا لەسەر ئاستی نموونەی تیۆری دیارە بەوپێیەی کە کۆسیستەمی پرسەکانن، واتە چەند یاسایەکن کە پەیوەندییەکانی نێوی بەشێوەیەکی دیاریکراو دروست دەکەن.

پوختەی قسە: بونیادگەری دوای دروستبون و گەشانەوەی، لە سەرەتای سەرهەڵدانی ناڕوونی و هەڵەتێگەیشتنی زۆری دروستکرد، بەڵکو چەندین ڕەخنەی ئاڕاستە کرا، بە فەلسەفەیەکی ناڕوون دانرا نەک تەنیا لای مرۆڤی ئاسایی، بەڵکو لای ڕۆشنبیرێکی زاناش بەگوێرەی قسەی میشێل ڕڤایتەر، کە بەتوندی هێرشی کردە سەر بونیادگەری بەهۆی ناڕوونییەکەی، بەتایبەتی لای جاکۆبسۆن و شتراوس، هەمان هەڵوێست سەبارەت بە بونیادگەری لای کرۆزوێڵ دووبارە دەبێتەوە، ئەوکاتەی دەڵێت: (پێم سەیرە بیرۆکەیەك کە بزوتنەوەیەکی هزری دیاریکراوە (مەبەستمان بونیادگەرییە) دەکرێت بڵاوبێتەوە بێ ئەوەی بە تەواوی ڕوون بێت و لێی تێبگەین)(١٤١).

لەگەڵ ئەوەشدا بونیادگەری بەشداری کردووە لە بەخشینی مۆرکێکی تایبەت بە بوارەکانی توێژینەوە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە میانەی جەختکردنی لەسەر توخمی پەیوەندی و پشتبەستنی ئاڵوگۆڕ لە نێوان

(١٤١) - ايديث كروزيل، عصر البنيوية، ترجمة جابر عصفور، القاهرة، دار سعاد الصباح، ١٩٩٣، ل ١٣.

بەشەکانی یەك دیاردە، سەرەڕای ئەوەی بونیادگەی لە ڕەهەندە قوڵەکانی ئاڕاستەیەکی بەرهەڵستکاری هیستۆریزمە و لە چوارچێوەی ئاراستە کۆنزەرڤاتیڤەکان پۆلێن دەکرێت، بەڵام بەشداریکردووە لە هێناکایەوەی ئاڕاستەیەکی شیکردنەوەی واقیع کە بە چارەسەرێکی ناوەند دادەنرێت لە نێوان هەژمونی ئایدیۆلۆجیا، یاخود تیۆردانانی پەتی لە لایەك، ئاڕاستەی ئەزموونی لە لایەکی دیکەوە. بونیادگەری باوەڕ بە وەسفکردنی دەرکەوتەکانی دیاردەی لێتوێژراو ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات بچێتە ناو قوڵایی دیاردەکە، بونیادی ناوەکی و پەیوەندی ڕووخسار بە ناخی دیاردەکەیەك ئاشکرا بکات. هەر ئەوەشە وای لە هەندێ کردووە بڵێن کە بونیادگەری بە ناوکی میتۆی شیکردنەوەی ناوەڕۆك دادەنرێت[١٤٢].

[142]- Jaque Herman, languge de la sociologic PUF 3eme edition 1994, p 94.

## باسی دووەم

## میتۆدی ئەرکگەری یان( ئەرکێتی )

### ١. بنەما سەرەکییەکانی

دەکرێت سەرەتای سەرهەڵدانی ئاراستەی ئەرکگەری لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا بۆ کاری پێشەنگەکانی کۆمەڵناسی بگەڕێنینەوە ،بە تایبەتی کتێبەکانی دۆرکهایم، ئەمەی دوایی لە کتێبی (ڕێساکانی میتۆد لە کۆمەڵناسی)(١٨٩٨) جەختی لەسە پێویستی شیکردنەوەی ئەرکەکانی دامەزراوە و مومارەسە کۆمەڵایەتییەکان کردەوە ، ئەو ئاراستەیە وەك میتۆد لای مالینۆفسکی و راد کلیف براون بەکاردەهێنرێت دواتر بۆ سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتیەکان گواستیپانەوە، براون ئەرکگەری پێناسە کردووە و دەڵێت: ئەرك هەموو کردەیەکی دووبارەیە وەك سزادانی تاوان، یاخود ئاهەنگێکی پەروەردەیی، بریتییە لەو ڕۆڵەی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و بەشداریکردنی لە بەردەوامبوونی بونیادی کۆمەڵایەتی دەینوێنێت(١٤٣) .

بایۆلۆژیا کاریگەری هەبوو لەسەر کۆمەڵناسی سەبارەت بە ئەرکگەری، بەشێوەیەك هەندێك کۆمەڵناس لێکچواندنییان لە نێوان جەستەی زیندوو و

---

143- radecliff Brown, structure and process in primitive society oxford university press Londonm 1952, p 179.

کۆمەڵگادا کرد، لەسەر هەمووشیان سپنسەر کە جیاوازیکردن لە نێوان بونیاد و ئەرکی لە بایۆلۆژیا وەرگرت، کۆمەڵگاش وەك بونەوەرێکی زیندوو بە دوای هاوسەنگی دەگەڕێت تەنانەت لە چوارچێوەیی ئەو پەرەسەندنە بەردەوامەی کە بەسەریدا دێت. لە بایۆلۆژیادا بونەوەری ئۆرگانی سیستەمێکە و لە رووی ئەرکەوە لە چوارچێوەی پشتبەستنی بەرامبەریدا لە چەندین بەشی بەیەکەوە بەستراو پێکدێت. زانایانی کۆمەڵناسی و سیاسەت چەمکی ئەرکیان بەسەر توێژ و گروپەکان پراکتیزە کردووە، بەوشێوەیەی کە زانایانی بایۆلۆژیا بەسەر بونەوەری زیندوو پراکتیزە دەکەن. بەمشێوەیە ئەرکگەراکان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا سیستەمی کۆمەڵایەتییان بە هاوشێوەی بونەوەرە زیندووەکان داناوە، هەروەها دەکرێت پۆلێن بکرێت لە ژێر رۆشنایی ئەو ئەرکە سەرەکییانەی کە ئەنجامی دەدات، سیستەمی ئابووری ئەرکی بەرهەمهێنان و دابەشکردن دێنێتە ئاراوە بۆ تێرکردنی پێداویستییە ماددییەکانی بەکاربردنی مرۆڤ، خێزانیش ئەرکی لە دایکبوون و بەکۆمەڵایەتیبون و پاراستنی جۆری مرۆیی و رێکخستنی مومارەسە سێکسییەکان دەگێڕێت، سیستەمی سیاسیش ئەرکی پاراستنی ناوەوە و دەرەوەی هاوڵاتییانە، سیستەمی ئاینییش دەبێتە هۆی یەکانگیری کۆمەڵایەتی و بەمشێوەیە.

ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتییانە پێویستی بە میکانزمێك هەیە کە بەهۆیەوە کۆمەڵگا بتوانێت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات و ئەو شێوازە راڤە بکات کە بە هۆیەوە کۆمەڵگا کاری پێدەکات و خۆی دەهێڵێتەوە، ئەو میکانیزمەش

ئالۆگۆڕییە، واتە پشتبەستنی ئالۆگۆڕە. ئەمەش پرۆسەیەکی گونجاوکاری و ڕێکەوتنخوازییە و بەشداری لە دروستکردنی بەها و ماناکان دەکات، بۆ ئەوەی خەڵك بتوانن گونجان و ڕێکەوتن بە دەست بهێنن و خۆیان لە هەڵوێستی کۆمەڵایەتی ئالۆگۆڕ و یەکانگیر دەبیننەوە.

هەروەك لە پێشوودا باسمانکرد سەرەرای ئەوەی کە ئەرك وەك چوارچێوەیەك بوو بۆ شیکردنەوە و ڕاڤەکردن، کەموکوڕی بونیادگەری تێدەپەڕێنێت، هەروەها زۆریش پشت بە بونیادگەری دەبەستێت و وتەکانی بەکار دەهێنێت، بەڵام بە تەواوی لەگەڵی هاوشێوە نییە، لەو ڕوانگەیەی کە ئەرکگەری زیاتر واقیعییە، چونکە بایەخ بە ئەرك دەدات زیاتر لە بایەخدانی بە ڕۆچوون بۆ پشت بونیادە دیار و نادیارەکان.

لە چوارچێوەی تیۆری سۆسیۆلۆژیدا ئەرکگەری مانای ئەوەیە: کە سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆی لە سیستەمێکی ڕاستەقینەدا دەنوێنێت، لەم سیستەمەدا بەشەکانی ئەرکی بنچینەیی دەگێڕن بۆ سەلماندنی گشت و مانەوەی ، هەندێك جار چوارچێوەکەی فراوان دەبێت و بە هێزتری دەکات، پاشان ئەو بەشانەش یەکانگیر و کامڵ دەبن، ئەمەش بوو تیماشیڤ قسەی لەبارەیەوە دەکرد[١٤٤]. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ددانبەوەدا دەنێت کە هەردوو چەمکی ئەرك و ئەرکگەری دوو مانای جیاواز و لە یەکتری دوور وەردەگرن، بەڵکو هەریەکە لە بۆدۆن و بوریکارد ڕەخنەیان لە پەیوەندی حەتمی نێوان بونیاد و

١٤٤- نيقولا تيماشيف، نظرية علم الاجتماع، طبيعتها، وتطورها سلسلة علوم الاجتماع المعاصر، القاهرة، لا ٢٣٠ و دواتر.

ئەرك گرتووە، باس لەوە دەكەن كە شیكردنەوەی ئەركگەری لە بیرۆكەیەكی سادە دەست پێدەكات بەوەی كە باشترین ڕێگا بۆ ڕاڤەكردنی دیاردە و دامەزراوە كۆمەڵایەتییەكان بریتییە لە سەرنجدانی ئەو ئەركانەی كە لە نێو كۆمەڵگادا هەیەتی (١٤٥). هەروەها ئەركگەری بۆ سێ ئاراستە دابەش كرد: یەكەم ئەركگەریشیان ڕەهاكان، كە بە تەواوی هاوشێوەی ئەركی ئۆرگانەكانە (ئۆرگانیزم)، دووەمیش میرتۆن سەركردایەتی دەكات كە ئەركگەری دەروونی و كۆمەڵایەتییە، بەوپێیەی كە ئەركگەری هەنگاوێكە و ئارەزووە وروژێنراوەكان دەجولێنێت لە نێو كۆمەڵگا جیاواز و بەشە كۆمەڵایەتییەكاندا، لە ڕێگای بونیادێكی كۆمەڵایەتی تایبەتەوە (١٤٦)، هەرچی ئاراستەی سێیەمە پارسۆنز سەركردایەتی دەكات بە ناوی بونیادی ئەركگەری.

ئاراستەی ئەركگەری پشت بە شەش بیرۆكە دەبەستێت، ئەوانیش:

١. مامەڵە لەگەڵ شت دەكات (بونەوەرێكی زیندوو یان كۆمەڵایەتی، گروپ، ڕێكخستنی دامەزراوە..هتد) وەك سیستەمێك، ئەو سیستەمەش لە چەندین بەشی بە یەكەوە بەستراو پێكدێت، یاخود لەسەر پایەی پشت بەیەك بەستان دامەزراوە .

[145]- Raymond Boudon, Francois Bouricaud, Dictionare critique de la sociologic, PUF 3em ed 1990 p 267.

[١٤٦]- سمير نعيم، النظرية في علم الاجتماع، دار المعارف، القاهرة، ١٩٨٢، لا ١٨٩.

٢. هەموو سیستەمێك چەندین پێداویستیی سەرەکی هەیە و دەبێت دابینی بکات.

٣. سیستەم لە حاڵەتی هاوسەنگییە، ئەو هاوسەنگییە بە هۆی تێرکردنی پێداویستییەکانەوە دەستەبەر دەبێت لە لایەن بەشەکانییەوە.

٤. بەشەکانی سیستەم لە هاوسەنگی سیستەم بەشداری دەکەن ، یاخود زیان بە سیستەم دەگەیەنن یاخود هاوسەنگییەکە لاواز دەکەن، دەکرێت نا ئەرکی بێت و بەهای نەبێت بۆ سیستەم.

٥. پێداویستییەکانی سیستەم بە هۆی گۆڕان یاخود ئەلتەرناتیڤەکانەوە دەستەبەر دەبێت.

٦. یەکێتی شیکردنەوە بۆ ئەرك بریتییە لە چالاکیەکان یان نمونە دووبارەبوەوەکان.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە شیکردنەوەی ئەرکگەری هەوڵدەدات چۆنییەتی بەشداریکردنی بەشێك لە سیستەم ڕوونبکاتەوە لە دەستەبەرکردنی سیستەم وەك گشت بۆ بەردەوامبوون، یاخود زیانگەیاندن بەم بەردەوامییە(١٤٧).

هەروەك شیکردنەوەی ئەرکگەری پشت بە چەندین ڕێکار دەبەستێت:

١. ئەزموونی عەقڵی: وەك باسمان کرد ئەرکی میتۆدی شیکردنەوەی عەقڵی پشت بە توانای بیرکردنەوە و خەیاڵی زانستی لای زانا دەبەستێت، واتە لەسەری پێویستە بەشێوەیەکی عەقڵی ئەوە بخەملێنێت کە لە کۆمەڵگایەکدا

١٤٧- تیماشیف، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٣٢.

ڕوو دەدات، ئەگە بەشەکانی بونیاد نەتوانێت ئەرکەکانی بەجێ بگەیەنێت، یاخود بە باشی ئەنجامی بدات.

٢. میتۆدی ئەرکگەری پشت بە میتۆدی بەراودکاری دەبەستێت: بەراوردکردنیش یان لەسەر ئاستی چۆنییەتی (واتە بەراوردکردن لە نێوان دوو هەڵوێستی کۆمەڵایەتی جیاواز بە لەبەر چاوگرتنی بوونی خەسڵەتێکی دیاریکراو یاخود بونیادێکی هەندەکی، یاخود بەراوردکردن لەسەر ئاستی چەندی، هەروەك سۆرۆکین ئەنجامیدا و هونەری ئایینی بەراوردکردن لە نێوان دوو کولتووری عەلمانی و ئایینی).

٣. تێبینیکردن و شیکردنەوەی ئەنجامە کەڵەکەبووەکان بە هۆی ڕوودانی شڵەژانی جیاواز لە کۆمەڵگاکاندا، ئەو شڵەژانەش ڕەنگە سەرچاوەکەی هۆکاری ناوەکی، یاخود دەرەکی یاخود هەردووکیان بێت، بۆ نموونە توێژینەوەکردنی ئەنجامە کەڵەکەبووەکانی ڕوودانی شڵەژانەکان، یاخود ڕوودانی جەنگەکان[١٤٨].

لێرەدا باس لە دوو نموونەی شیکردنەوەی ئەرکگەری دەکەین لە میانەی دوو زانا کە بە پێشڕەوی ئەو ئاراستەیە دادەنرێن، ئەوانیش مالینۆفسکی و میرتۆنن، بێ ئەوەی تەواوی نمونەکان لە یاد بکەین، یاخود ئەو زانایانەی کە ڕۆڵێکیان هەبووە لە سەرهەڵدانی ئەو ئاراستە شیکارییە.

---

١٤٨- علي محمد، تاريخ علم الاجتماع، القاهرة، ١٩٨٦، لا ٤٤٦_٤٤٥، ناونیشانی سەرچاوە ڕەسەنەکەش ئەمەیە:

Mainowski, Scientific Theoty of culture, 1944.

## ٢. پراکتیکردنەکانی

### أ. ئەرکگەری رەها لای مالینۆفسکی

ئەگەر سەرەتاکانی ئاراستەی ئەرکگەری بکرێت لە نێو نوسینەکانی هەندێك لە زانا بەرایییەکانی کۆمەڵناسی هەست پێ بکەین بە تایبەتی دۆرکهایم، کە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، بۆ تێگەیشتنی هەر دامەزراوەیەك پێویستە بۆ مێژووی سەرهەڵدان و ئەو ئەرکە بگەڕێینەوە کە لە کۆمەڵگادا دەیگێڕێت، ئەوا بڵاوبوونەوەی ئەو ئاراستەیە لەسەردەستی ئەنترۆپۆلۆژیستەکان سەریهەڵدا وەك رادکلیف براوان و رالف لینتۆن و مالینۆفسکی.

مالینۆفسکی بە باوکی ئەرکگەری دادەنرێت، بەشێوەیەك بەشداری لە پەرەسەندنی ئەرکگەری کردووە ،لەمیانەی توێژینەوەی کۆمەڵگا بەرایییەکاندا، ئەو یەکەم کەس بوو بانگەشەی بونی قوتابخانەی ئەرکگەری کرد لەڕووی ئاراستەی پەرەسەندنگەری کە لە چاخی خۆیدا باوبوو، بەشێوەیەك دەڵێت: (تیۆری ئەرکگەری یەکەم پێداویستییە بۆ توێژینەوەی مەیدانی و شیکردنەوەی بەراوردکاری بۆ دیاردەکان لەسەرجەم کولتوورەکاندا).

لە کتێبی (تیۆری زانستی)(١٩٤٤)، جەختدەکاتە سەر پێکەوە پەیوەستبوونی نێو هەموو کۆمەڵگایەك لە نێوان کولتور و ژینگە مادیەکەی، ئەو پێکەوە پەیوەست بوونە بە یەکێك لە بنەماکانی شیکردنەوەی ئەرکگەری

دادەنرێت ،کە پەیوەندی دروست دەکات لە نێوان سیستەمی پێوانەیی و ژینگەی دیاریکراودا، بەوپێیەی کە کۆی جەبرە جێگیر و بەیەکەوە گونجاوەکانە سیستەمێك بۆ کردە دادەنێت. مالینۆڤسکی پێیوایە پێویستە هەموو کولتوورێك پاشکۆی خەسڵەتە بایۆلۆژیەکانی مرۆڤ بێت وەك خۆراك و وەچەخستنەوە، لەمیانەی تێرکردنی ئەو پێداویستییانە هەڵی مانەوەو سەقامگیری دەستەبەر دەکات و کار دەکات بۆ ڕێکخستنی گەشە و پێشکەوتن، پێیوایە دەستکەوتی رۆشنبیری پاڵپشتیکردنی میکانیکی و لەخۆوەی فزیۆلۆژیای مرۆیی دەکات ، هەروەك دەکرێت لە رووی ئەرکگەریەوە وەڵامدانەوە کولتوورییە جیاوازەکان پێکەوە گرێ بدەین، وەك وەڵامدانەوە ئابووری و یاسایی و فێرکردن و زانستی و ئایینیەکان لە لایەك، وەڵامدانەوە بایۆلۆژییەکانیش لە لایەکی دیکەوە. ڕاڤەکردنی ئەرکگەری بۆ هونەر و خۆشگوزەرانی، یاخود ڕێوڕەسمە گشتییەکان دەکرێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە پەرچەکردارەکانی جەستەی ئۆرگانی ببەسترێتەوە بۆ ڕیتم، یاخود دەنگ، یاخود ڕەنگ، یاخود هێڵ و پەیوەندییەکانی.

مالینۆڤسکی ڕۆڵێکی سەرەکی بە کولتوور بەخشی بەوپێیەی گوزارشتە لە پێداویستییەکان بۆ تێرکردنی ئارەزووە بایۆلۆژییەکانی مرۆڤ، بە مانایەکی دیکە کولتوور لەو چالاکیە ئاڕاستەکراوانە دروست دەبێت بۆ تێرکردنی پێداویستییە بایۆلۆژییە سەرەکییەکان. ئەوکاتەی مالینۆڤسکی کولتوور ڕاڤە دەکات لە میانەی ئەو ئەرکەی کە لە کۆمەڵگادا هەیەتی، واتە لەو پرەنسیپە دەست پێدەکات کە دەڵێت هەموو نموونە کولتورییەکان و هەموو نەریت و

ئامانجە ماددی و بیرۆکەکان، یان بیروباوەڕەکان، لەسەر ئەرکێکی زیندوو دەوەستن و ئەرکێکی تایبەتیان هەیە، بەشێکن لە سیستەم، ئەو ئەرکەش گشتی، یان ڕەهایە، چونکە هەموو ڕەگەزێك لەو سیستەمە ئەرکێکی هەیە لە نێو سیستەمدا، هەروەها هەموو سیستەمێك یەکەیەکی ئەرکگەری پێکدەهێنێت واتە شیکردنەوەی ئەرکگەری لە چوارچێوەی بوونی سیستەمێك یاخود کۆسیستەمێکی گشتیدا هەیە.

بەمشێوەیە تێبینی دەکەین کە مالینۆفسکی شیکردنەوەیەکی کامڵ پێشکەش دەکات لە چوارچێوەی ڕێکخستنی کۆمەڵگا وەك گشتێك، واتە شیکردنەوە بونیادی ئەرکگەری، و لەمبارەیەوە دەڵێت:

(ئێمە شێوەیەك لە شێوەکانی شیکردنەوەی ئەرکگەری و سیستەمی بەکاردەهێنین، ئەو دوو شێوازەش وامان لێدەکات کولتوور بە شێوەیەکی بەرهەست و گشتیگیر و دیاریکراو بناسین، کولتووریش هەموو بەشێك لە خۆدەگرێت کە سەربەخۆیی خودیان هەیە لە لایەك، سیستەمێکی هاریکاری دروست دەکەن لە لایەکی دیکەوە، ئەوەی کامڵ دەبێت بەپێی کۆمەڵێك پرەنسیپ وەك بەرهەمهێنانی هۆشیاری و وەچەخستنەوە و بوونی ئەو شوێنەی کە هاوکاری و پسپۆڕی لە چالاککییەکانی تێدا ڕوو دەدات، لە کۆتاییشدا بەکارهێنانی هێز لە ڕێکخستنی سیاسی، هەموو کولتورێك

تـەواوکاری و ئیکتیفـای خـودی دروسـت دەکـات لـە ژێـر رۆشـنایی توانـای تێرکردنی کۆی گشتی پێداویستییە سەرەکییەکان)(١٤٩).

دووەم: ئەرککەری رێژەیی لای میرتۆن

میرتۆن ئەرکگەری پێناسە دەکات و دەڵێت: (ئەو ئەنجام و شوێنەوارانەیە کە دەکرێت تێبینی بکرێن، دەبێتە هـۆی دەسـەتەبەرکردنی گونجـان و رێکـەوتن بەپێی سیستەمێکی دیاریکراو)، میرتـۆن نموونەیـەك یـاخود چوارچـێوەیەکی وێنـایی رێکخـراوی بـۆ ئەرکگـەری پـەرە پێـداوە، بـە وردیـش جەوهـەری شـیکردنەوەی ئەرکگـەری و رێکـار و ئامرازەکـانی بەڵگـە دروسـتکردن لەبارەیەوە دەخاتەڕوو.

ئەرکگەری لای میرتۆن ئاماژەدەری بابەتی هەیە و دەکرێت تێبینـی بکرێـت و نابێت لەگەڵ ئامانجدا تێکەڵی بکەین ، یاخود مەبەست، یـاخود پاڵنـەرەکان. واتە چەمکی ئەرك جیاوازە لە چەمکی ئامـانج. بـەم حاڵەتـە گەیشـت بـەهۆی جیاکردنەوەی نێـوان ئـەرکی دیـار و ئـەرکی نادیـار(١٥٠)، ئـەو هۆکارانـەی کـە پێشکەش دەکرێت بـۆ ڕەفتارەکـان جیـاوازە لـە ئەنجامـەکانی ئـەو ڕەفتـارە سەبارەت بە سیستەمی کۆمەڵایەتی، دەکرێت تێبینی ئەو ئەنجامانـە بکـەین، بـۆ نموونـە کەسـێك ئۆتـۆمبێلێکی گرانبـەها دەکرێـت ئـەرکی دیـاری کرینـی

[149]- R. K. merton, sociological Ambivalance and other Essays, tree press New York, 1976.
[150]- Robert K. merton, manifest and latent function in social theory and social structure Glenoce. Ill: free press, 1957, p 26.

ئۆتۆمبێـل بەکارهێنانیـەتی وەك ئامرازێـك بـۆ گواسـتنەوە، کەچـی ئـەرکی نادیاری ئەو دیاردەیە خۆی لە دەرخستنی شکۆ و پێگە دەبینێتەوە.

میرتۆن پێیوایـە شیکردنەوەی ئەرکگـەری لەسـەر سـێ گریمانـەی سـەرەکی دەوەستێت ئەوانیش:

١. ڕەنگە ڕەگەزە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکان بۆ هەنـدێك گروپـی دیـاریکراو ئەرکگـەری بـن ، بـۆ هەنـدێکی دیکـە ئەرکگـەری نـەبن و زیانیـان هـەبێت بـۆ هەندێك گروپی دیکە، واتە ئەمەش ڕێژەیی ئەرك دەگەیەنێت.
٢. فرە ئەرکی لای یەك رەگەز، بەشداربوونی چەندین ڕەگەز لـە ئەنجامـدانی یەك ئەرك، ئەمەی بە ئەلتەرناتیڤی ئەرکگەری ناو بردووە، واتـە جۆراوجـۆری ئامرازەکانی تێرکردنی پێداویستییەکان.
٣. دەبێت شیکردنەوەی ئەرکگەری ئەو یەکە کۆمەڵایەتییانە دیاری بکات کە خزمەتی توخمە کۆمەڵایەتی، یاخود کولتوورییـەکان دەکـەن، هەنـدێك تـوخم ئەرکیان هەیە و هەندێکی دیکەیان ئەنجامی زیانبەخشییان هەیە، لێرەوە ئەو پێیوابـوو هەڵەیـە قسـە لـە بـارەی ئەرکـە بەدەسـتهاتووەکانەوە بکـەین بـۆ هەموان[١٥١].

میرتۆن میتۆدە شیکارییە ئەرکگەرییەکەی لە توێژینەوە بـە ناوبانگەکـەی لـە بارەی بونیادی کۆمەڵایەتی ناپێوەیەوە بە کارهێنا ، بەشێوەیەك ئەرکگـەری پراکیتـزە کـرد لـە شـیکردنەوەی سەرچـاوە کۆمەڵایـەتی و کولتوورییـەکانی

[١٥١] - سمیر نعیم، هەمان سەرچاوە، لا ٢٠١.

ڕەفتاری لادەرانە، ئامانجیش لەمە دەرخستنی ئەو فشارانە بوو کە بونیادی کۆمەڵایەتی مومارەسەری دەکات بەسەر هەندێك کەسی دیاریکراو لە کۆمەڵگا بۆ ئەنجامدانی ڕەفتارێکی نائاسایی، لەم کۆنتێکستەدا جیاوازی کردووە لە نێوان دوو توخمی سەرەکی و بە بونیادی کولتوور کۆمەڵگا و ئامانجە دیاریکراوەکان بە کولتوور لە لایەك، شێوازەکانی سیستەم بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە لە لایەکی دیکەوە ناوزەندی کرد.

میرتۆن پێیوایە بونیادی کۆمەڵایەتی هەلی جۆراوجۆر دەڕەخسێنێت بۆ مومارەسەکردنی شێوازەکانی کردار و ڕەفتار کە ئامانجە سەرەکییەکە هێنانە ئارای ڕێکەوتنە، هەروەها چەندین سەرچاوەی بونیادی دیکەی هەیە بۆ ڕەفتار بەشێوەیەکی نائاشنا، ئەو سەرچاوە بونیادییانەش وا دەکات لادان ڕەفتارێکی ئاسایی بێت. لێرەدا لادان بۆ لادەرەکان، یاخود بۆ ئەو کەسانەی نەخۆشی دەروونییان هەیە ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە کە چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت کردەیەك ئەنجام بدەن لەژێر بارودۆخی بونیادی دیاریکراو، بە بۆچوونی ئەو ئەنجامدانی ئەرکی سەرشان و شتە چاوەڕانکراوەکان لە کەسەکە بریتییە لە بەهای ڕاڤەکردنی ئەرکگەری[152].

هەروەها میرتۆن میتۆدی شیکردنەوەی ئەرکگەری پراکتیزەکردووە بەسەر توێژینەوەکردنی سیستەمی سیاسی ئەمریکی، بەشێوەیەك هەڵوەستەی کرد لەسەر ئەوەی بۆچی زۆرینەی پارتەکان ماکینەی سیاسی دروستدەکەن؟

[152] - محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٦١.

وەلامەکەش ئەوە بوو کە ئەو ماکینانە ئەرکێکی دیاریکراو ئەنجامدەدەن، ئەویش ڕاکێشانی دەنگدەرەکانی چینە میللیەکان و پاراستنیانە بە شتی ماددی کە دەولەت پێشکەشی ناکات، بەڵکو هەندێکجار ئەو شتە ماددیانە بە تەواوی لەگەڵ یاساش ناگونجێت، کەواتە بوونی ماکینەی ڕاڤەکرد لە میانەی ئەرکەکەی، ئەمەش وەلامدانەوەی شتگەلێکە کە لە لایەن سیستەمی سیاسی دابین نەکرابوو[153].

## باسی سێیەم
## میتۆدی نەسەقی یان سیستەم

### ١) پێناسەکردنی میتۆدی سیستەم و دیاریکردنی پنتە سەرەکییەکانی

هەر لەسەرەتاوە پارسۆنز هەستی بەوە کرد کە شیکردنەوەی ئەرکگەری کورتی هێناوە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵگا مۆدێرن و ئالۆزەکاندا، ئەو کورتبینیەش، وای لە پارسۆنز کرد پەرە بە چەندین وتەی ئەرکگەری بدات بۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵ شیکردنەوەی سیاسی بگونجێت، بەشێوەیەك دەڵێت: ناوی بونیادی ئەرکگەری بە بۆچوونی من زۆر گونجاو نییە لەگەڵ ڕۆیشتنی کات و ڕۆژگاردا، لە ڕوانگەی ئەو ئەلتەرناتیف شیکردنەوەی سیستەمییە، واتە ڕوانین لە دیاردە و شتەکان نەك لە میانەی بونیاد یان ئەرکەکەی، نەك لە میانەی سیستەمەکەی، واتە ڕوانین لێی وەك چەند سسیتەمێك، سیستەمی

153- Robert, Ibid p 71.

کۆمەڵایەتیشی پێناسە کردووە بەوەی کە (گوزارشتە لە دوو بکەر یان زیاتر هەریەکەیان پێگەیەکی هەیە جیاوازە لەوانی دیکە و ئەرکی جیاواز دەگێڕن، ئەمە گوزارشتە لە شێوازێکی ڕێکخراو کە پەیوەندییە ئۆرگانییەکان حوکم دەکات و ماف و ئەرکەکانیان بەرامبەر یەکتر وەسف دەکات، لە چوارچێوەی کۆمەڵێك بەها و پێوەری هاوبەش لە پاڵ شێوازی جیاواز لە ڕەمز و بابەتە کولتورییە جیاوازەکان)[١٥٤].

بیرۆکەی سەنتەری لە میتۆدی نەسەقی سیستەمگەرایی بریتییە لە دروستکردنی چەند نموونەیەك لە بیرکردنەوە کە بە هەمەکیبوون دەناسرێتەوە و دەتوانێت توێژینەوەی کارلێکە دینامییەکان بکات نەك هۆکارگەراییەکان، دەرك بە سیستەمەکان دەکات نەك بەو پێیەی کۆمەڵێکی جێگرن بەڵکو گۆڕاون، ئەو ئاڕاستەیەش لە شیکردنەوە سوودی لە بایۆلۆژیا و زانستی ئاراستەکردن و تیۆرەکانی کۆمینیکاسیۆن وەرگرتووە، لەسەر ئەو بنەمایەش دەتوانین بڵێین کە سیستەمگەرایی ئامرازگەلێکی عەقڵی بە توێژەر دەبەخشێت کە گونجاوی دروست دەکات لە هاوکاری بونیادگەری، یاخود تێشی دەپەڕێنێت، ئەوە پاڵی دەنێت بۆ چەند مانایەك کە پەیوەندیی و فشارەکان لە نێو ڕێکخستندا ئاڵۆز دەکات، هەروەها لە کۆمەڵەکان دەڕوانێت وەك کۆمەڵێك سیستەمی کراوە، تێبینیکردنی پەیوەندییە دینامییەکانی

154- Parsons, the present status of structural functional, theory in sociology pp 67-68

نێوان گروپ و نێوەندەکان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی نێوکوییەکانی بڕیاردان و گۆڕینی بڕیار(١٥٥).

تالکۆت پارسۆنز لە گرنگترین ئەو کەسانە دادەنرێت کە ڕێساکانی ئەو میتۆدەی داناوە و لە شیکردنەوەی سیاسیدا پراکتیزەی کردووە، هەروەها بەشدارییەکانی دیڤید ئاستۆن و ئالمۆند نابێت لە یاد بکەین.

پارسۆنز تیۆرەکەی لە بارەی کردەی کۆمەڵایەتی(١٥٦) داڕشت بە دەستپێکردن لە تێگەیشتی خۆی بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی، بە شێوەیەك سیستەمی کۆمەڵایەتی پێناسە کرد بەوەی کە: گوزارشتە لە دوو بکەر یان زیاتر کە هەریەکەیان پێگەیەکی هەیە، یاخود پێگەیەکی جیاوازی هەیە لەوانی دیکە و ڕۆڵی جیاواز دەنوێنن، ئەمە گوزارشتە لە شێوازێکی ڕێکخراو لە پەیوەندییە ئۆرگانییەکان حوکم دەکات، ماف و ئەرکەکیانیان بەرامبەر یەکتر وەسفدەکات، هەروەها چوارچێوەیەکە لە بەها و پێوەری هاوبەش لە پاڵ جۆری جیاوازی ڕەمز و بابەتی کولتووری جیاواز(١٥٧).

هەروەها شیکردنەوەی سیستەمگەرایی لای پارسۆنز لەسەر چوار چەمکی سەرەکی بونیاد دەنرێت ئەوانیش:

١. کردەی کۆمەڵایەتی

٢. هەڵوێست.

---

155- Parsons and others: to word a general theory of social action, Cambridge: Harvard iniversity press 1951

١٥٦- علي ليلة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٩٦.

157- Talkot Parsons, the soial systeme New York, Free press, 1951.

٣. بکەر

٤. ئاراستەکانی بکەر

ئەو بابەتە سەرەکییەکەی کە تیۆری سۆسیۆلۆجی لای پارسۆنز لە دەروی دەخولێتەوە بریتییە لە ئەنجامدانی ئەرك لە بونیاددا، بەشێوەیەك شیکردنەوەی سیستەمگەرایی پێویستی بە چارەسەرکردنی میتۆدۆلۆجی هەیە بۆ پێگە و ڕۆڵی ئەو بکەرانەی کە لە نێو هەلۆیستێکی کۆمەلایەتی دیاریکراودا هەن، هەروەها لەگەلْ ئەو جۆرانەی ڕێکخستن کە هەلۆیستەکە لە دووتوێیدا هەیە، چەمکی پێگە ئاماژەیە بۆ شوێن و پێگەی بکەر لە سیستەمی پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی دیاریکراو کە وەك بونیاد لێی دەڕوانرێت، هەرچی ڕۆڵە، ئاماژە بۆ ڕەفتاری بکەر لە پەیوەندی بە ئەوانی دیکە دەکات، ئەگەر لەم ڕەفتارە بڕوانین لە نێوکۆی گرنگییە ئەرکگەرییەکەی بۆ سیستەمی کۆمەلایەتی. لە جۆرەکانی ڕێکخستن تێدەگات بەوەی کە چاوەڕوانی ڕێکخراوە (یاخود بونیادێکی دیاریکراوی هەیە)، کە ڕەفتاری گونجاو دیاری دەکات لە ڕووی کولتووری بۆ ئەو کەسانەی کە ڕۆڵی کۆمەلایەتی جیاواز دەنوێنن، هەروەك ئەمە کۆمەلێك ڕۆڵە و پشت بە یەکدی دەبەستن و سیستەم پێکدێنن(١٥٨). بە پێی بۆچوونی پارسۆنز دەرککردنی سیستەمگەرایی بۆ کردەی کۆمەلایەتی پێویستی بە لەبەرچاوگرتنی دوو تێبینی سەرەکییە، ئەوانیش(١٥٩):

١٥٨- نظرية الثقافة، مجموعة من المؤلفين الاجانب، ترجمة علي، سيد الصاوى، عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٧، لا ٢٨٩.

159- t. parsons and others, working papers in the theory of action, p 39.

١. سیستەمی کردە پێنج لقە سیستەم لەخۆ دەگرێت: سیستەم ئۆرگانی بایۆلۆجی کە بریتییە لە کۆگای ڕەمەکی و سەرچاوەی سەرەکی سیستەمی کردەی کۆمەڵایەتی و پاڵنەر و ئەو پێداویستییانەی کە دەبێت تێر بکرێت، پاشان سیستەمی میتافیزیکی کە سەرچاوەی سەرەکی ئەو بەهایانەیە کە ڕۆڵی ئاڕاستەکەری سەرەکی دەگێڕن لە سیستەمی کولتوور و بەهادا، هەروەها سیستەمی کولتوور و بەها و سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیستەمی کەسایەتی، زۆربەی جار سیستەمی ئۆرگانی بە سیستەمی کەسایەتی ئاوێزان دەبێت، سیستەمی میتافزیکیش بە سیستەمی کولتوور و بەها ئاوێزان دەبێت و بەمەش دەبێتە سێ سیستەم.

٢. سەرەڕای یەکانگیری بونیادی و ئەرکگەری لە نێوان ئەو سێ سیستەمە لە ئەنجامدانی کردەی کۆمەڵایەتیدا، ئەوا ناکرێت ئەمە بە تەنیا بۆ سیستەمێك لە سیستەمەکان بگێڕینەوە، بەڵکو بۆ کۆی سیستەمی کردە دەگەڕێتەوە، ئەمەش بەهۆی تێگەیشتن لە کارلێکی ناوەکی، هەر لقە سیستەمێك، یاخود ئەدای ئەرکگەری لە چوارچێوەی سیستەمی کردەی کۆمەڵایەتی، ئەمەش پێویستی بە دیاریکردنی توخمە سەرەکییەکانە بۆ سیستەمی کردەی کۆمەڵایەتی، دەبێت لە دوو لایەندا لەمە تێبگەین: لایەنی بونیادی بەشێوەیەك سروشتی هەرسێ سیستەمی پێکهێنەری سیستەمی کردەی کۆمەڵایەتی بخەینەڕوو، لایەنی دینامی بەشێوەیەك دەبێت سروشتی ئەدای ئەرکگەری هەر لقە سیستەمێك بخەینەڕوو لە چوارچێوەی سیستەمی گشتی کردەی کۆمەڵایەتیدا.

پارسۆنز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پەیوەندییە ناوەکییەکانی نێو ئەو لقە سیستەمانە زۆر ئاڵۆزە، بە شێوەیەك دەتوانین هەر سیستەمێك لەوانە بە سەربەخۆی لەوی دیکە دابنێین، بەوپێیەی کە دابڕاوە لە ڕووی خەسڵەت و چالاکییەکان لەوانی دیکە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، ئەوا سیستەمەکان تێکەڵ بەکتر کەن، هەریەکەیان لە ڕووی پێداویستییە ئەرکگەرییەکانییەوە پشت بە سیستەمەکانی دیکە دەبەستێت، لە بەرامبەر ئەوەدا هەریەکەیان پاڵپشتی ئەوی دیکەن و مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن، سیستەمی کەسایەتی ناکرێت بە بێ بوونی بونەوەری ئۆرگانی بوونی هەبێت کە وزەی پێدەبەخشێت، نە بێ بوونی تۆڕێك پەیوەندی تێکەڵ بە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان یاخود لەگەڵ ڕەمزەکانی سیستەمی کولتووری بوونی دەبێت کە ئەوەی پێ نابەخشێت کە کارلێکی لەگەڵ ئەوانی دیکە کۆنترۆڵ بکات لە هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی و بەمشێوەیە، پاڵنەری کەسایەتی زۆر گرنگە سەبارەت بە سیستەمی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی گشتی و ڕەها وەك گرنگی ڕەمزەکانی سیستەمی کولتوور و بەشدارییە پێوەرییەکانی، ئەمە لە پاڵ ئەوەی کە سیستەمی کولتوور بوونی خۆی لە هەموو سیستەمێکی کەسایەتی و تۆڕی کارلێکی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەستەبەر دەکات[160].

تاوەکو سیستەم خۆی بپارێزێت لە ئاستێکی مەعقولی چالاکی و هاوسەنگی، پێویستە وەڵامدانەوەی بۆ دوو جۆر پێداویستی و کێشە هەبێت، واتە بەشێوەیەك لە شێوەکان بتوانێت چالاکییە پێویستەکان ڕێك بخات و تێریان

[160]- مجموعة المؤلفين نظرية الثقافة، لا ١٩٦.

بکات، بۆ ئەمەش سیستەمی کردە کۆمەڵێك لەو چالاکی و ئەرکانە لە خۆدەگرێت کە پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە لە چوارچێوەی پەیوەندی سیستەم بە ژینگەکەی، کەچی هەندێکی دیکەیان پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە بە هۆی پێداویستی ڕێکخستنی بونیادە ناوەکییەکەی.

هەروەها بە بۆچوونی پارسۆنز دەکرێت لە ئەرکەکانی کردە نزیك بینەوە لە میانەی جیاکردنەوەی نێوان ئامانجەکانی کردە لە لایەك و ئامرازە بەردەستەکان بۆ بەدەسهێنانی ئەو ئامانجانە لە لایەکی دیکەوە.

پارسۆنز پێیوایە چوار ئەرکی سەرەکی هەیە و پێویستە سیستەمی کۆمەڵایەتی پەیڕەویان بکات ئەوانیش:

١. **خۆگونجاندن**: ئەو کۆمەڵە کردارەیە کە کار دەکات بۆ دروستکردنی پەیوەندی نێوان سیستەم و ژینگە دەرەکییەکەی، لێرەدا ناوەڕۆکی ئەو گونجانە پەیوەستە بە دەستکەوتنی ئەو سەرچاوە جیاوازانەی کە سیستەمێك لە سیستەمەکانی ژینگەکە پێویستی پێی هەیە، دەبێت بیگۆڕینەوە بە بەرهەمهێنان بۆ ئەوەی لە نێو هەمان سیستەمدا دەستەبەر بێت، دواتر ئەو سەرچاوانە ڕێك بخەین و بگۆڕین و ئامادەیان بکەین بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بێت لە تێرکردنی پێداویستییەکانی سیستەم.
٢. هەرچی ئەرکی دووەمی سیستەمی کۆمەڵایەتییە، بریتییە لە دەستەبەرکردنی ئامانج، ئەو کەش هەموو ئەو کردارانە لەخۆ دەگرێت کە یارمەتیمان دەدات لە دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی سیستەم، یاخود کار

دەکات بۆ ئامادەکردنی سەرچاوە و کۆششەکان بۆ دەستەبەرکردنی ئامانج، یاخود تێرکردنیان. قورسایی ئەداکردنی ئەرك پەیوەستە بە دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجەی کە دەکەوێتە سەر سیستەمەکانی کەسایەتی، لێرەوەیە پارسۆنز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سیستەمی کۆمەڵایەتی تەنیا مانای ئەو بارودۆخە نییە کە خەڵك لە نێویدا هەڵسوکەوت دەکەن و کار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەکەن، بەڵکو باس لە داڕشتنی خودی ئامانجەکانیش دەکات[161].

٣. **دەستەبەرکردنی تەواوکاری:** ئەو ئامانجەش کار دەکات بۆ دەستبەرکردنی سەقامگیری لە نێو سیستەمدا، ئەو کردارانە لەخۆ دەگرێت کە کار دەکەن بۆ پاراسنی سیستەم لە دژی گۆڕانە لە ناکاوەکان بە پلەی یەکەم، بەشێوەیەك یەکانگیری و هاریکاری پێویست بۆ مانەوەی سیستەم لە حاڵەتی ئەداکردنی ئەرکی گونجاو دەپارێزێت. سیستەمی کۆمەڵایەتی بەرپرسە لە ئەدای ئەرکی تەواوکاری، هەر ئەوە جەخت لەسەر یەکانگیری دەکاتەوە و وەلا دروست دەکات، سنووری کردە دیاری دەکات و فشار و بەربەستەکان دەسەپێنێت لە بەردەم هەرلادانێك لە پێداویستییەکانی سیستەم.

٤. **پاراستنی جۆر:** پارسۆنز پێیوایە سیستەمی کردە پێویستی بە کۆمەڵێك لەو کردارانە هەیە کە بکەرەکان ئامادەکات، ئەو ئەرکەش بایەخ بە کۆگاکردنی پاڵنەر، یاخود وزە دەدات، لێرەوەیە پارسۆنز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سیستەمی کۆمەڵایەتی تەنیا مانای ئەو بارودۆخە نییە کە

---

[161]- نظرية الثقافة، لا ١٩٦.

خەڵك لە نێویدا هەڵسوکەوت دەکەن و کار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بکەن، بەڵکو باس لە داڕشتنی خودی ئامانجەکانیش دەکات[١٦٢].

پاڵنەری سەرەکی لای پارسۆنز لە پشت بەستنی بە شیکردنەوە سیستەمگەرایی بۆ توێژینەوەکردنی واقیعی کۆمەڵایەتی، بریتییە لە بایەخدان بە پرسی سیستەم و سەقامگیری، گەڕان بە دوای ئەو فاکتەرانەی کە بونیادی کارلێکردن و کارلێکی کۆمەڵایەتی دروست دەکەن و بەرەو بەردەوامبوون لە حاڵەتی سەقامگیریەکی ڕێژەیی دەبات. بایەخدانی پارسۆنز بە سیستەم و سەقامگیری پاڵی بە ڕەخنەگرانی نا بۆ ئەوەی هێرشێکی توندی بکەن سەر و بە کۆنزەرڤاتیڤی و بایەخدان بە پاراستنی حاڵەتی هەنوکەیی تۆمەتباری بکەن بە هەرشێوەیەك بێت و بەمپێیەش وەك دوژمنی شۆڕش و گۆڕان پۆلێنیان کرد.

٢) شیکردنەوەی سیستماتیکی لە توێژینەوە سیاسییەکاندا

سیستماتیکی بوارێکی بەپیتی ڕەخساند بۆ پراکتیزەکردنی لە شیکردنەوەی سیاسیدا، هەندێك پێیانوایە لایەنگیرانی ئەم ئاڕاستەیە دیاردە سیاسییەکان بە بەشێك لە سیستەمی کۆمەڵایەتی گشتی دادەنێن، کارلێکی ئاڵوگۆڕ لە نێوان پێکهاتەکانیدا هەیە، سیستەمی سیاسی دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی و ژینگەی دەرەکی لە هەمان کاتدا، میتۆد سیستماتیکی جەخت لەسەر پەیوەندی نێوان سیستەمی سیاسی و سیستەمی کۆمەڵایەتی

[١٦٢]- علي ليلة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١٠.

دەکەنـەوە، کـە یارمـەتی ئـەوەی یەکـەم دەدات ئەرکـەکانی خۆگونجانـدن و دیسپلین و دابەشکردن ئەنجام بـدات، ئەمـەش ڕێگـە دەگرێـت لـە تێکچـوونی سیسـتەم، هـەروەها ڕۆڵـی ژینگـەی کۆمەڵایـەی (سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی) دەردەخات لە پرۆسەی بڕیاردانی سیاسی، پەیوەنـدی نێـوان هـەردوو بـەرە دەچنە ژێر سوڕی سبرنیتکی، ناکرێت لە یەکێکیان تێ بگەین بێ ئەم سـوڕە، لە بەناوبانگترین توێژینەوەش، ئەو توێژینەوەیـە بـوو کـە ئیسـتۆن و گابریـڵ ئالمۆند ئەنجامیاندا.

ئیسـتۆن تیـۆرە سیاسـییەکەی لەسـەر بیرۆکـەی سیسـتەم دامەزرانـدووە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ژیانی سیاسی جەستەیەکە لە کارلێکی سنووورداری دیاریکراو کە سیستەمی کۆمەڵایەتی لە دەوری هەیە و کاریگەری لـێ دەکـات بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەو پێیوایە سیستەمی سیاسی وەك سندوقی ڕەشـە و زۆر بایـەخ بـەوە نـادات کـە لـە نێـو سـندوقەکەدا هەیـە، ئـەوەی گرنگـە پەیوەندییەکانی سیستەمە بە ژینگەکەی، ئەو ژینگەیەش دوو جـۆرە: یەکـەم سیستەمی دیکەی پێکهێنەری سیستەمی کۆمەڵایەتی گشـت وەك سیسـتەمی ئابووری و سیستەمی کولتووری و سیستمی ئایینی هتد، دووەمـیش ژینگـەی دەرەکـی، یـاخود ناکۆمەڵایـەتی، وەك سیسـتەم و ژینگـە، سیسـتەمی بایۆلۆجۆی، سیسـتەمی دەروونـی و سیسـتەمی و سیسـتەمی نێودەوڵـەتی. ئیستۆن جەخت لەسەر توخم و کارتێکـەرەکانی ئـەو ژینگەیـە دەکاتـەوە کـە کاریگەریان هەیە لەسەر سیستەمی سیاسی،، یـاخود ئـەوەی پێـی دەوترێـت هاتووەکان (input)، یان ئەوەی لە سیستەم دەردەچێت دوای ئەوەی ئـەم

کارتێکەرانــەی بەردەکــەوێت (دەرچــووەکان)، شــیکردنەوەی سیســتەم بــە بۆچونی ئەو بایەخ بەو ئەلقانەی کردار و پەرچەکردارەکان دەدات لـە نێـوان ژینگە و سیستەمی سیاسی و توانای سیستەم لەسەر پاراستنی هاوسەنگی و گونجانی لەگەڵ ئەو کارتێکەرە دەرەکییەکانە بۆ ئەوەی بیخاتە ناو خـۆی و بەشێوەیەك بیگونجێنێت کە زیان بە سیستەم نەگەنێت.

بۆ ئەوەی سیستەم هاوسەنگی خۆی بپارێزێت، ئەوا پێویستی بە گونجانە لـە نێـوان دوو جـۆری هـاتوو، داواکـاری و پاڵپشـتی، داواکـە قورسـاییە بەسـەر سیســتەم ئەگــەر لــە ئاســتی خــۆی دەرچــوو، وەك داواکردنــی کرێکــار بــۆ زیادبوونی کرێیان، یاخود باشترکردنی زەمانەی کۆمەڵایەتی، لەم پرۆسـەیەدا پێوسـتی بــە پاڵپشــتی هەیــە، بــۆ نموونــە گوزارشــتکردنی هاووڵاتیــان لــە پاڵپشــتیان بــۆ سیســتەم بــە هــەر هــەنگاوێك وەك پەرچــەکرارێك بــۆ ئــەو داواکارییانە، هەماهەنگی نێوان پاڵپشتی و داواکاری و هاوسەنگی دەرچوو لە سیستەم دروست دەکات، ئینجا ئەمە یـان یاسـای تـازە دروسـت دەکـات کـە وەڵامدانــەوەی هــەموو پێداویســتییەکانە، یــان بەشــێکە لێیــان، یــاخود ئەنجامــدانی رێکــاری ســەرکوتکارییە وەك ڕووبەڕوبونــەوەی ســەندیکاکانی کرێکـاران یـان لـە نێـوبردنی پارتێـك لـە پارتـەکان، یـاخود ڕێگـاگرتن لـە خۆپیشاندان و مانگرتنەکان...هتد.

ئیستۆن پێیوایە هەموو سیستەمێك سێ ئەرکی سەرەکی هەیە، ئەوانیش:

١. ئەرکی گوزارشتکردن لە داواکاریەکان.

٢. ئەرکی کۆنترۆڵکردنی داواکاریەکان.

٣. ئەرکی کەمکردنەوە یان ئاوێزانکردنی داواکاریەکان[١٦٣].

هەرچی گابرێل ئالمۆندە ئەوا پێناسەی سیستەمی سیاسی کردووە بەوەی کە (سیستەمێکە لە کارلێك ولە نێو هەموو ئەو کۆمەڵگا سەربەخۆیانەدا هەیە کە ئەرکی تەواوکاری و گونجان لە نێو ئەو سیستەمە بەجێدەگەیەنن، ئاراستەی کۆمەڵگایان دەکەن بە ئامرازەکانی خستنەکار و هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی ئامرازەکان قەهری شەرعی بەشێوەیەکی مەزن یان بچووك، لەو کتێبەی کە لەگەڵ هاوکارەکەی بوال نووسی بە ناونیشانی (سیاسەتەکانی بەراوردکاری) ئالمۆند سیستەمی سیاسی شیدەکاتەوە لەسەر سێ ئاست)، ئەوانیش:

**یەکەم: تواناکان**، یەکەمجار لەسەر سیستەم پێویستە توانایەکی ڕێکخراوی هەبێت کە ڕێگا بە ڕێکخستنی هەڵسوکەوتە تاکی و بەکۆمەڵەکان بدات بەهۆی پێودانگە ڕێکەوتن لەسەر کراوەکان، ئەمەش ڕێگا دەگرێت لە تێکەڵبوون و دژپێکی ئەو هەڵسوکەوتانە، لەسەر سیستەم پێویستە توانایەکی جێگیری هەبێت، کە توانای دەرهاویشت کردنە، ڕێگای پێدەدات ماددە پێویستەکانە لە نێوەندی ناوەکی، یاخود دەرەکی (داهاتی دارایی، یاخود پاڵپشتی سیاسی) یاخود ئەوەی پێی دەوترێت پاڵپشتیکردن. هەرچی توانای سێیەمە، توانای دابەشکردنە، ئەو توانایەش بەگوێرەی تاك و گروپەکان پێی

---

163- D. Eston, the political System, 1953.

گەیشتوون. هەرچی توانای دواییە، بریتییە لە توانای وەڵامدانەوە، ئەو توانایەش ڕێگای پێدەدات بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانی ژینگەی دەرەکی و فشارەکان تاوەکو هاوسەنگی خۆی بپارێزێت.

**دووەم: ئەرکەکانی وەرچەرخان:** تیایدا ئالمۆن توێژینەوە لە بارەی ئەو ئامرازە جیاوازانەوە دەکات کە سیستەم بەکاری دەهێنێت بۆ گۆڕینی داواکاری بۆ وەڵامدانەوە، ئەمەش دوو ئەرك دەخاتە ڕوو: ئەرکی بە باشتردانانی بەرژەوەندییەکان کە لە دووتوێیدا ئەو داواکارییانە لەخۆ دەگرێت، ئەرکی کۆبونەوەی بەرژەوەندییەکان، بەو مانایەی بەرژەوەندییەکان ڕێك دەخات و زنجیرە بەندی دەکات و بەیەکەوەیان دەگونجێنێت. لە پاڵ ئەمە ئالمۆند باسی ئەوەی کرد کە پێی دەوترێت ئەرکە حکومییەکان، ئەوانەش ئەرکی وەرچەرخانە، ئەمەش ئەرکی یاسادانانە و پێی دەڵێت ئەرکی دانانی ڕێسا و ئەرکی جێبەجێکاری و پێی دەوترێت ئەرکی پراکتیزەکردنی ڕێساکان، ئەرکی دادوەریش پێی دەوترێت ئەرکی پابەبوون بە ڕێساکان، لە کۆتاییشدا ئەرکی پەیوەندی ئینجا چ پەیوەندی نێوان فەرمانڕەوا و هاووڵاتییان، یاخود لە نێوان تەواوی توخمەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی بێت.

سێیەم :هەرچی ئاستی سێیەمی شیکردنەوەکەیە پەیوەستە بە ئەرکەکانی پاراستنی سیستەم و گونجاندنیان، لەوەشدا ئەو خاڵانە دەگرێتەوە: ئەرکی هەڵبژاردنی سیاسی، واتە ئامادەکردنی خاوەن ڕۆڵە سیاسییەکان و

هەڵبـژاردنیان، کـاری گواسـتنەوەی کولتـووری سیاسـییە، چـونکە بـە هـۆی ئەمـەی دوایـی هەڵوێسـتە سیاسـییەکان جـێگیر دەبێـت، لێـرەوە دەبیـنین سیسـتەمی سیاسـی هـەوڵی بالادەسـتبوون دەدات بەسـەر ئامرازەکـانی پێگەیاندنی سیاسی بۆ ئەوەی کولتووری سیاسی پاڵپشتی بپارێزێت(١٦٤).

وەك پوختەی ئەو بەشە هەر دەبێت ئاماژە بکەین بۆ ڕۆڵی زانا ئەمریکییەکان لە دانانی بنەمای ئەو میتـۆدە، بەمـەش ئـەوان لـە ژێـر کاریگـەری سروشـتی کۆمەڵگای ئەمریکی بوون کە سیستەمێکە و لە چەندین ویلایـات پێکهـاتووە، هەر ویلایەتێکیش پێکهاتەیەکە لـە ڕەگـەز و ڕەنـگ و ئایینـەکان، سیسـتەمی ئەمریکی هاوسـەنگی خـۆی دەپارێـزێـت بـەهۆی پەیوەندییـەکانی پاڵپشـتی و گونجان ئینجا چ لە نێوان ویلایەتەکان یاخود لە نێـوان ڕەگـەز و بنەچـەکاندا بێت. پاراستنی هاوسەنگی و بوونی سیستەم مانای ڕوودانـی تێکچـون نییـە، بەڵکو توانای سیستەمە لە دەرخستنی ئەو تێکچـوونانە، ئەمـە ئـەو وێنایەیـە کـە سیاسـەتمەدارە گـەورەکانی ئـەمریکی پـەیڕەویان کـرد، بۆیـە دەبیـنین ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پێشوی ئەمریکی برجینسکی دەڵێت: لەپێناو سیستەمێك تاوانی ڕێکخراو بەباشتر دەزانێت نەك توندوتیژی، بۆیەش تـاوانی ڕێکخـراو بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ و نافـەرمی دەبێتـە درێـژکراوەی سیستەم(١٦٥).

---

[164]- Almond and Powell, Comparativ politics, a developmental the litter Brown and compary 1966 pp 28-30.

[165]- زیغینو بریجنسکي، بین العصرین، امریا و العصر الکترونی، بیروت، در الطلیعة ١٩٨٠، لا ٢٦.

چەمکی سیستەم مانای گونجان و ڕێکەوتنی تەواو نییە، بەڵکو بریتییە لە کارلێك و ئاڵوگۆڕی واقیع و پێگەکان و ململانێ، لەمبارەیەوە هێربێرت سپنسەر دەڵێت (سیستەمی سیاسی دەکرێت بوونی هەبێت، ئەوکاتەی خەڵك دەژین بۆ ئەوەی هاوکاری و ململانێ بکەن لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی هاوبەش)، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وریابین لە میتۆد و خۆ ڕادەستنەکردن بۆ ئەو وتانە، بە تایبەتی سەبارەت بە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەم و کۆمەڵگا عەرەبییەکان، چونکە ئەو میتۆدە بەکەڵك کۆمەڵگایەك دێت کە لە پلەی پێشکەوتن و پێگەیشتوویی لە چوارچێوەی لیبرالیزمی ئابووری و سیاسیدایە، چەسپاوەکان وەك بڕبڕەی پشتی پاراستن و سەقامگیرییەتی، بەمپێیەش بەرژەوەندی لە پاراستنی سەقامگیری و هاوسەنگی سیستەمە، هەرچی کۆمەڵگاکانی ئێمەیە، هێشتا لە حاڵەتی دواکەوتوییە و هیچ چەسپاوێکی نییە کە ڕێکەوتنی لەسەر هەبێت، ململانێش زۆر توندە لە نێوان هێزی مۆدێرنە و پێشکوتن لە لایەك و هێزی پاراستن و توێژە هاوپەیمانەکانی لەگەڵ ڕۆژئاوا لە لایەکی دیکە، ئەو جۆرە کۆمەڵگایانەش پێویستیان بە پاراستتنی هاوسەنگی سیستەم نییە، بەڵکو پێویستیان بە تێکدان یان ڕوودانی گۆڕانکاری قووڵە لە بونیادەکەی ئەگەر هیچ دابڕان و پچڕانێك ڕوو نادات[١٦٦]

[١٦٦]- سەبارەت بە بونیادی کۆمەلگای عەرەبی و پێویستی گۆرانکاری کردن تێدا پێویسە بگەڕێنەوە بۆ نوسینەکانی: هشام الشرابي، عبدالحليم بركات، عبدالله العروي و عبدالكبير الخطيبي، غسان سلامة، ابراهيم سعدالدين، محمد عابد الجابري.

# بەشی سێیەم

## میتۆدی مێژوویی

### باسی یەکەم: گرنگی توێژینەوەی مێژوویی

مێـژوو بـە شـێوەیەکی گشـتی توێژینـەوەی ڕابـردووە، یـاخود تۆمـارکردنی شارەزاییەکانی ڕابردووە، توێژینەوەی مێژوویی ئـەو توێژینەوەیـە کـە تیایـدا مێژوو بەکاردەهێنرێت ئینجا یان لە پێناو مەعریفەیەکی زانستی سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕابردوو، یـاخود لـە بەرژەوەنـدی توێژینـەوەی زانسـتی واقیعـی دیاردە هاوچـەرخەکان، چـونکە ئێسـتای دیـاردە لـە ڕابـردووی دابـڕاو نییـە، بەڵکو درێژکراوەیەتی، هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی مێژووی تایبـەتی خـۆی هەیە، چونکە دداننان بە پرەنسیپی پەرەسەندن مانـای ئەوەیـە کۆمـەڵگاکان گەشە دەکەن و بەپێی زەمان دەگۆڕێن.

زۆرێك لە بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان دەرکیـان بـە گرنگـی میتـۆدی مێـژوویی کردووە، داوایان کرد لە توێژینەوە زانستییەکان بە کاربهێنرێت، لـە ڕوانگـەی ئەوەی کە دامـاڵینی دیـاردەی کۆمەڵایـەتی لـە ڕەهەنـدە مێژووییەکـەی وەك

ئەوەی ڕاگوزەر و بێ گیانە، هەروەها نا ئامادەیی ڕەهەندی كاتی دیاردە، توانای توێژەر لە سەرپەرشتیكردنی ڕەهەندی داهاتووی كەم دەكاتەوە.

ئەوكاتەی قسە لە بارەی مێژوو دەكەین مەبەستمان كارە تاكییە پەتییەكان نییە، بەڵكو مەبەستمان كارە بە كۆمەڵەكانە، یاخود تاكی كاریگەرە بەسەر ژیانی كۆمەڵگاكان، واتە ئەوەی خەسڵەتی كەسیانەی بكەرەكە بۆ ئەنجامەكانی كردەكە تێدەپەڕێنێت، لەم نێوكۆیەدا پۆل لاكۆمب پێیوایە: ئەو مێژووەی كە دەكرێت پێی بڵێین كۆمەڵناسی بابەتەكەی تەنیا بەسەر ئەوە كورت نابێتەوە كە تاكییە، یان تاقانەیە، دەبێت جیاوازی بكەین لە نێوان ڕووداوە تاقانە و ڕووداوە دامەزرێنەرەكان، واتە ڕووداوە دووبارە و هاوشێوەكان، مێژووی ئاسایی ڕووداوە یەكەمەكان دەخاتە پێشەوە، بەڵام ئەگەر مێژوو بیەوێت ببێت بە زانست، ئەوا لەسەری پێویستە توێژینەوە لە بارەی شتە هاوشێوە چەسپاوەكان بكات وەك چۆن تەواوی زانستەكان ئەنجامیانداوە[١٦٧].

گرنگی توێژینەوە مێژووییەكان خۆی لەوە دەبینێتەوە كە ڕێژەیبونی هەموو شتێكمان پێدەبەخشێت، بەوەی كە هەلومەرجە ئابووری و سیاسی و كۆمەڵایەتی ئاینییەكان، هەموو شتێكیش لە حاڵەتی گۆڕان و وەرچەرخانەدایە، ئێستا هیچ نییە جگە لە ڕووداوێك لە ڕابردوو، توێژینەوە مێژووییەكان تەنیا بەسەر زانستێك لە زانستە كۆمەڵایەتییەكان قۆرخكراوە،

١٦٧- ارمان كوفليه، مدخل الى علم الاجتماع، ترجمة نبيه صقر، بيروت، ١٩٨٠، لا ٦٨.

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو خاڵی هاوبەش لە نێو هەموویاندا هەیە، چونکە باسی هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆیی دەکەن.

چەمکی مێژووی کۆمەڵایەتی بۆ ئاماژەکردن بە توێژینەوەی ئەو گۆڕانەی کە بەسەر تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەرەسەندنەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی دادێت بە کاردەهێنرێت، لە پاڵ وەرچەرخان لە چەمك و بەها کۆمەڵایەتییەکاندا، چاکەی تیشکخستنە سەر توێژینەوەی مێژوویی بۆ هەندێك بیرمەند دەگەڕێتەوە، لە گرنگترینیشیان ئیبن خەلدون و ڤیکۆ و رایت میلز.

## ئیبن خەلدون

ئیبن خەلدون بایەخی بە مێژوو و ڕەخنەگرتن لە مێژوونوس و مامەڵەکردنیان لەگەڵ رووداوەکان داوە، بەشێکی گرنگی لە پێشەکییە بەناوبانگەکەی بۆ توێژینەوەی مێژوویی تەرخانکردووە، یەکەمجار دەستی کرد بە پێناسەکردنی مێژوو، بەشێوەیەك دەڵێن: مێژوو لە ناخیدا ڕوانین و توێژینەوەیە، شیکردنەوەی بونەوەرە و پرەنسیپە وردەکانە، زانستی چۆنییەتی و هۆکارەکانی واقیعە، بۆیە لە حیکمەتدا ڕەسەنە، قوڵە و شایانی ئەوەیە لە ڕیزی زانستەکاندا دابنرێت(١٦٨).

١٦٨- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤.

ئیبن خەلدون جیاوازی لە نێوان زانستی کەلام و وتاربێژیدا دەکات کە لەچاخی ئەودا باوبوون: قسەکردن لە بارەی ئەو مەبەستە (توێژینەوە مێژوییە کۆمەڵایەتییەکان) کاری زانستی گوتار نییە کە یەکێکە لە زانستە لۆژیکییەکان (ڕەوانبێژی)، بابەتی زانستی گوتاربێژی وتە ڕازیکارە بە سوودەکانە بۆ پشت بەستنی جەماوەری بە بۆچوونی ئەوان، ناچێتە سەر زانستی سیاسەتی مەدەنی، چونکە سیاسەتی مەدەنی بریتییە لە دابینکردنی ماڵ، یاخود شار بەگوێرەی ئاکارو حیکمەت[١٦٩].

ئیبن خەلدون پێیوایە ئەو لە ڕێلاچونەی مێژوونوسەکان دەکەونە ناوی، گێڕانەوە مێژووییەکان لاواز دەکەن، بەمپێیەش میتۆدی مێژوویی لە شیکردنەوەیدا هەواڵ، هەڵە و ساختە و درۆیە، هۆکارەکانی درۆ لە هەواڵ و قبوڵکردنی هەواڵی درۆ لە چەند خاڵێکدا پوختکردەوە:

١. ئەو هۆکارانەی کە پەیوەستن بە سایکۆلۆژیا و ئارەزوو و مەیلی مێژوونوسەکان، ئارەزووی ئەو کەسانەی کە شت لەوانەوە دەگوازنەوە، لەوانەش بڵاوبوونەوەی بۆچوون و ڕێبازەکان، ئەگەر دەروون لە حاڵەتی میانڕەوی بێت لە قبوبڵکردنی هەواڵ، کە مافی خۆی لە پشکنین و لێکۆڵینەوە پێ دەدات، تاوەکو ڕاستی لە درۆ بەدەربکەوێت، ئەو خاڵەش بە کردەییکردنی دەوێت[١٧٠].

---

١٦٩- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

١٧٠- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

٢. هۆکاری پەیوەست بە متمانەی هەندێك مێژوونوس بە گوێزەرەوەکان بێ پشکنین، واتە بێ ڕەخنەیەك بەهۆی میتۆدۆلۆجیایەکی میانڕەو.
٣. هۆکارەکانی دروستبوونی درۆ لە هەواڵێك، بەهۆی نەزانینی مەبەستەکان، زۆرێك لە گوێزەرەوەکان نازانێت مەبەست چییە لەوەی کە دەیبینێت یان دەیبیستێت و هەواڵ بە گوێرەی گومان و خەملاندنی دەگوازێتەوە بەمەش دەکەوێتە ناو هەڵەوە[171].
٤. هۆکارەکانی پەیوەست بە وەهمکردنی دەربارەی ڕاستی، زۆرجار بەهۆی لایەنی متمانەیە بە گوێزەرەوەکان.
٥. هۆکارەکانی نەزانینی ئەو یاسایانەی کە یاسای دیاردە سروشتییەکان بۆی ملکەچ دەبن وەك دیاردەکانی کیمیا و سروشت و ئاژەڵ و ڕووەك، ئەو نەزانینە بە یاساکان وا لە مێژوونوسەکان دەکات کارەکان بەگوێرەی هێزی خاریق و غەیبانییەت لێك بدەنەوە وەك جنۆکە و شەیتانەکان.

هۆکاری ئەمەش نەزانینی سروشتی کاروبارەکانی شارە، هەموو ڕووداوێك لە ڕووداوەکان چ خود یان کردە بێت، هەر دەبێت سروشتێکی تایبەتی هەبێت، ئەگەر گوێگرەکە ئاشنای سروشتی ڕووداوە و کاروبارە ونەکان و هەلومەرجەکانی بێت، بایەخ بە هەواڵ دەدات و ڕاستی لە درۆ جیا دەکاتەوە، بەمەش دەگاتە پشکنینێکی ورد لە هەموو ڕووێك[172].

---

[171]- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.
[172]- ابن خلدون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦.

## ڤیکۆ (١٦٦٨_١٧٤٤)

ڤیکۆ زانای ئیتاڵی بە یەکێك لە گرنگترین ئەو زانا ئیتاڵیانە دادەنرێت کە بایەخیان بە توێژینەوەی مێژوویی داوە، بەشێوەیەك لە نووسینەکان باسی لە زانستێکی تازە دەکرد[١٧٣]، بە ڕوونی بایەخ بە توێژینەوەی مێژوویی دەدا بەتایبەتی لە لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی، بایەخدانەکانی تەنیا بەسەر جەنگ و پەیماننامە و هاوپەیمانییەکان کورت نەبۆوە، بەڵکو توێژینەوەی خوو و یاسا و سیستمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دەکرد، تەنانەت زمان و هونەرەکان و ئایین و هزرەکانیش، ئەو بنەما سەرەکییەی کە کاریگەری لەسەر زۆرێك لە بیرمەند و فەیلەسوفەکانی سەدەی نۆزدەیەم کرد بریتییە لەوەی کە (خەڵك خۆیان مێژوو تایبەتی بە خۆیان دروست دەکەن).

ڤیکۆ تیۆرەکەی خۆی لە بارەی پەرەسەندن دانا، پێیوایە مرۆڤایەتی (و شارستانییەت) پلە بە پلە پەرەیسەندووە و لە قۆناغی ئایینی بۆ قۆناغی پاڵەوانێتی بۆ قۆناغی مرۆڤایەتی، پێیوایە حاڵەتەکان بەشێوەی بازنەیی ڕێکخراو بەدوایەکدا دێن، هەروەها حاڵەتی دوای ڕێگای بۆ هاتنە ئارای حاڵەتی یەکەم خۆش دەکات، (بەدوایەکداهاتنی ئەو حاڵەت، یاخود سوڕانە بریتیین لە یاسایەکی گشتی کە ڕووداوەکانی مێژوو لای سەرجەم نەتەوەکان و بەتایبەتی ئەوروپییەکان ملکەچی دەبن).

173- Vico, the new scince of G, vico transm^by bergin and fisdeh N. Y. cornele university press.

ئەمە و ڤیكۆ ئامارەی بۆ پێویستی دەرهێنانی تیۆری كۆمەڵایەتی لە فاكتە كۆمەڵایەتییەكان كرد، ڕێسا سەرەكییەكانی میتۆدی مێژوویی دارشت بەمشێوەیە:

١. دیاریكردنی دیاردەی لێتوێژراو، بەدواداچون بۆ ئەم دیاردەیە لە میانەی پەرەسەندنە مێژووییەكەی بۆ زانینی ئەو یاسایانەی كە كۆنترۆڵی دەكەن.

٢. كۆكردنەوەی دۆكیۆمێنتی پەیوەست بە دیاردە ئینجا چ پەیوەست بێت بە ئایین، یان نەریت، یان خووەكان و هەموو ئەو شتانەی كە پەیوەستن بەم دیاردەیەوە.

٣. بەهۆی مەحاڵبونی هەڵوەستەكردن لەسەر حاڵەت و شێوازی گەلە كۆنەكان، دەكرێت ئەمە بە گەلە هاوچەرخەكان قەرەبۆ بكەینەوە كە لە هەمان ئاستدا دەژین كە ئەو گەلە بەراییانە لەكاتی خۆیدا تێیدا بوون، بەڵگە بهێنرێتەوە بەو شتەی دەیزانین بۆ زانینی ئەو شتەی كە نایزانین.

٤. شیكردنەوەی سەرچاوە كۆكراوەكان و رەخنەگرتن لێیان بۆ دڵنیابوون لە راستییەكەی.

٥. بەكارهێنانی زانستی زمانەوانی بۆ دڵنیابوون لە راستی ئەو روداوانەی كە مێژوونووسەكان باسی دەكەن.

٦. لە كۆتاییشدا توێژەر فاكتەكان پۆلێن دەكات و رێكیان دەخات بۆ ناسینی ئەو یاسایانەی كە دیاردەی لێتوێژراو كۆنترۆڵ دەكات[١٧٤].

---

١٧٤- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٧٠.

## رایت میلز

میلز بە یەکێك لەو زانا هاوچەرخانە دادەنرێت کە توێژینەوەی کۆمەڵایەتییان گواستۆتەوە بۆ پانتایی تازە کە زاناکانی پێشوو بایەخیان پێ نەدەدا، چەمکی خەیاڵی سۆسیۆلۆژی دارشتووە، خەیاڵی سۆسیۆلۆژی ئامرازێکی تازەی توێژینەوەیە، یارمەتی توێژەران دەدات بۆ پەرەپێدانی روانگە مێژووییەکەیان، مەبەستی میلز لەمە: توانای هزری توێژەرە لە تێگەیشتنی وێنەی مێژوویی گشتی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا، بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخە ناوەکی و دەرەکییەکان، خۆی لە نامۆبوون بەدوورگرتووەو لە واقیعی هەنوکەیی و قوڵ دەبێتەوە لە رەهەندە مێژووییەکانی ئەو واقیعە.

میلز پێیوایە دژوارە توێژەر توێژینەوەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بکات بە دابڕاوی لە نێوکۆیە مێژووییەکەی، زانستە کۆمەڵایەتییەکان مامەڵە لەگەڵ سێ بەیەکەوە بەستراو دەکەن، ئەوانیش مێژووی ژیان و مێژوو و کۆمەڵگا و پەیوەندی نێوانیانە لەنێو بونیادە کۆمەڵایەتییەکاندا، دەڵێت (بەراستی کۆمەڵناسی شایانی دەستەواژەیەکە، ئەویش دەستەواژەی کۆمەڵناسی مێژوویی)[١٧٥].

نووسینەکانی میلز یارمەتی دەر بوو لە گەڕانەوە بۆ رۆحی توێژینەوە مێژووییەکان، تەنانەت توێژینەوە ئەزموونییەکانیش پشت بە میتۆدی

---

١٧٥- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٦_١٣٧.

ئەمەش سەرچاوە رەسەنەکەیە:

Right mills, the sociological imagianation. N. Y ox unv: press 1959.

مێژوویی دەبەستن بۆ وەرگرتنی پەند و گەیشتن بە یاسا، ڕابردووی بە ئێستا بەستایەوە بۆ زیادبوونی سەرپەرشتیکردنی ئاسۆکانی داهاتوو، لە پێشوودا مێژوونوس مانتۆ لە ساڵی ١٩٠٣ جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە (هەموو وانەیەك لە کۆمەڵناسی دەبێت لە پێشوودا دەروازەیەکی مێژوویی هەبێت)[١٧٦].

بەڕێوەبەری گشتی یۆنیسکۆ فدریکۆ گوزراشی لەمە کرد و گوتی: (دەبێت توانای خەیاڵکردنی ڕابردوومان هەبێت بۆ ئەوەی بتوانین وێناکی ڕوونمان لە بارەی داهاتوو هەبێت).

## باسی دووەم

## مێژوو وەك میتۆدێك بۆ توێژینەوە و ڕاڤەکاری

زۆرێك لە توێژەرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە مێژوو تەنیا گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو نییە، بەڵکو ئامرازێکە بۆ ڕاڤەکردن بەتایبەتی ئەگەر لایەنی بەراوردکردن لەبەرچاو بگرێت، دۆرکهایم ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە مێژوویی بەراوردکاری کەرەستەیەکی گرنگە بە دەستی زانایانی کۆمەڵناسی و لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە یارمەتیان دەدات، دەڵێت:

(شیکردنەوەی هەر دامەزراوەیەك بریتییە لە دەرخستنی ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی، لەگەڵ هۆکارەکانی بوونی، بەڵام چۆن دەتوانین ڕێگای

١٧٦- ارمان کوفلیه، سەرچاوەی پێشوو، لا، ١٦٦.

ئاشکراکردنی ئەمە بدۆزینەوە ئەگەر بۆ ئەوکاتە نەگەڕێینەوە کە ئەمە چالاك بووە، واتە ئەو کاتەی کە ئەم هۆکارانە ئەو ڕووداوانەیان دروستکردووە کە ئێستا دەمانەوێت تێی بگەین، ئەو حاڵەتەش لە ڕابردوودایە، بۆ ئەوەی بزانین چۆن هەر توخمێك لەو توخمانە لە دایکبووە، تەنیا یەك ڕێگامان لە بەردەمدایە، ئەویش تێبینیکردنی ئەو کاتەیە کە ئەم دیاردەیە لە دایکبووە، دەبێت بە دوای ڕەوتی پێکهاتنی ئەو دیاردەیەدا بچین، ئەو پێکهاتنەش لە ڕابردوودا بووە و ناشتوانین پێی بگەین، بۆیە تەنیا لە ڕێگای مێژوو دەتوانین بیناسین)[177].

مێژوویی بەراوردکاری یەکسانە بە میتۆدی ئەزموونی[178]، بەشێوەیەك لە ڕێگای بەراوردکردنی ڕووداوە جۆراوجۆرەکان لە مێژوودا دەتوانین پەیوەندییە لۆژیکییەکانی نێوانیان ڕوونبکەینەوە و یاسا دروست بکەین، دۆرکهایم پێیوایە میتۆدی ئەزموونی، بە ڕێگای جیاواز (ڕێگای ڕێکەوتن، ڕێگای جیاوازی، ڕێگای گۆڕان بە ناچاری)، زیاتر لە بواری مێژوو پراکتیزە بکرێت، پێیوایە سێ شێوەی میتۆدی مێژوویی بەراوردکاری هەیە، ئەوانیش:

١. ڕووداوگەلێك پەیوەستن بە تەنیا یەك کۆمەڵگا.
٢. ڕووداوگەلێك پەیوەستن بە بە چەند کۆمەڵگایەکی هاوشێوە.
٣. ڕووداوگەلێك کە لە چەندین نموونەی کۆمەڵایەتی جیاواز وەرگیراون[179].

---

١٧٧- ارمان کوفلیە، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٨.
١٧٨- لەبەشی داهاتوودا زیاتر باس لەمە دەکەین.
١٧٩- سەرچاوەی پێشوو، لا ١٧٠.

میتۆدی مێژوویی ئامانجی گەیشتنە بەو پرەنسیپ و یاسا گشتییانەی کە کۆنترۆڵی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، لەمیانەی توێژینەوەکردنی رووداوەکانی رابردوو، چۆن دروستبووە و چۆن پەرەیسەندووە. ئەو فاکتەرانە چین کە کۆنترۆڵی دروستبوون و پەرەسەندنی کردووە؟ گەڕانەوە بۆ رابردوو میتۆدی مێژوویی لە میتۆەکانی دیکەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان جیا دەکاتەوە، ئەمە میتۆدێکی ناراستەوخۆیە، چونکە پشت بە سەرچاوەکانی پەیوەست بە دیاردە، یاخود رووداو دەبەستێت نەك بە چۆنیەتی ژیان لەگەڵ ئەوە دیاردەیە.

پۆلین یۆنگ(١٨٠) چۆنیەتی مامەڵەکردنی توێژەر لەگەڵ میتۆدی مێژوویی رووندەکاتەوە لەکاتی بەکارهێنانی لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، دەڵێت: ئێمە لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا بەدوای پەرەسەندنی مێژوویدا دەچین بۆ ئەوەی دووبارە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان دروست بکەینەوە، ئێستا بە رابردوو دەبەستینەوە، هەوڵدەدەین لەو هێزە کۆمەڵایەتییە بەراییانە تێبگەین کە ئێستای دروستکردووە، بە مەبەستی دروستکردنی چەند پرەنسیپێك و یاسایەکی گشتی پەیوەست بە رەفتاری مرۆیی کەس و گروپ و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان(١٨١).

لەسەر ئەو بنەمایە میتۆدی مێژوویی پێناسە دەکات بە(پرۆسەیەکی رێکخراو و بابەتییە بۆ ئاشکراکردنی بەڵگەکان، دیاریکردنیان و هەڵسەنگاندنیان و

[180]- Young P. scientific Social survey and Research, New York, 1967.

[١٨١]- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٨.

بەستانەوەیان بەیەکتر، لەپێناو سەلماندنی هەقیقەتگەلێکی دیاریکراو، دەرهێنانی دەرەنجامگەلێك کە پەیوەستن بە چەند ڕووداوێك کە لە ڕابردوودا ڕوویانداوە، ئەو کارەش بە ڕۆحێکی ڕەخنەگرانە ئەنجام دەدرێت بۆ دووبارە بونیادنانەوەی، دیزانییشکراوە بۆ مەبەستێکی ڕاستی چاخی ڕابردوو)[١٨٢].

## هەنگاوەکانی توێژینەوەی مێژوویی

بۆ پەیڕەوکردنی میتۆدی مێژوویی پێویستە چەند هەنگاوێك پەیڕەو بکرێت، ئەمەش بە دەستنیشانکردنی گرفتی توێژینەوە دەست پێدەکات، ئەم هەنگاوە خاڵی هاوبەشە لە نێوان سەرجەم میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی، دوای ئەمەش کۆکردنەوەی زانیاری پێویست دێت لە سەرچاوەی ڕەسەنی گرفتەکە ئەگەر بکرێت، دواتر سەرچاوەی لاوەکیی بە پلە دوو، ئەو هەنگاوانەش ملکەچی پرۆسەی ڕەخنە دەبن، ئەمەش دوو جۆرە: ڕەخنەی ناوەکی و ڕەخنەی دەرەکی، ئەو پرۆسەی ڕەخنەیەش (ناوەکی و دەرەکی)، پێی دەوترێت پرۆسەی شیکردنەوەی مێژوویی، دوای ئەوەش پرۆسە، یاخود یاساکان، کە پایەی سەرەکی و ئامانجی بناغەییە لە کاتی نوسینی ڕاپۆرتی توێژینەوەدا.

## سەرچاوەکانی توێژینەوەی مێژوویی

ئەمەش بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەشدەبێت: سەرچاوە ڕەسەنەکان، ئەمانەش سەرچاوەی هاوچەرخی ڕووداوەکە، یان دیاردەکەن، دووەمیش

[١٨٢]- لویس کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٠.

سەرچاوە لاوەکییەکان، کە پەنای بۆ دەبردرێت ئەگەر هاتوو نەکرا سەرچاوە ڕەسەنەکانمان بەدەستبکەوێت، سەرچاوەی لاوەکی بە پێچەوانەی سەرچاوەی یەکەم ئەڵقەی ڕاستەوخۆ نییە لە نێوان خۆی و ڕووداوەکە، بەشێوەیەکی گشتیش سەرچاوەکانی توێژینەوەی مێژوویی بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبن، گرنگترینیان[١٨٣]:

### ١. تۆمار و بەڵگەنامە فەرمییەکان

ئەمەش چەند جۆرێك لەخۆ دەگریت، وەك تۆمارە شەرعییەکان کە لە دادگا، یاسا، ڕێسا، دیسپلینە کۆمەڵایەتییەکان، ڕاپۆرتە کارگێڕییەکان، ڕاپۆرتەکانی لێژنەکان، ڕاپۆرتی مانگانە هەیە، هەروەها بەڵگەنامەی شەرعی تایبەت بە تاکەکان، چەندین دۆکیۆمێنتی هاوشێوە لەخۆ دەگرێت. ئەو سەرچاوانە بە سەرچاوەی گرنگ و ورد دادەنرێت بۆ زانیارییەکان، چونکە لە لایەنی فەرمی دەردەچێت کە سوورن لەسەر وردی لە کاتی دروستکردن و پاراستنی سەرچاوەکان.

### ٢. ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکان

سەرەڕای ئەوەی کە بەردەوام ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکان پشتی پێ نابەسترێت بە هۆی دژواری سەلماندنی وردیەکەی، جۆراوجۆری شێوەکانی گواستنەوەی ڕووداو، بەڵام ئەو ڕاپۆرتانە بە تایبەتی ئەوەی کە لە ڕۆژنامە بەرێزەکان بڵاو دەبێتەوە هەقیقەتگەلێکی گرنگمان پێشکەش دەکەن و بە تۆمارێکی بەردەوام دادەنرێت بۆ ئەو ڕووداوانەوەی کە ڕۆژانە لە جیهاندا ڕوو

---

[١٨٣]- احمد بدوي، اصول البحث العلمي و مناهجه، الكويت ١٩٧٨، لا ٢٣ و دواتر.

دەدەن، گرنگی ڕۆژنامە وەك سەرچاوەیەکی زانیاری زیاد دەبێت هەرچەندە ڕۆژنامەکە ملکەچی چاودێری نەبێت و لە ژێر فشارە دەرەکییەکان بە دوور بێت.

**٣. ڕاپۆرتی گەواهیدەرەکان لە بارەی ڕووداوەکانەوە (ئەوانەی بە چاوی خۆیان بینیویانە)**

زۆرجار ئەوە ڕوو دەدات، ئەگەر ڕووداوێك یان بابەتێکی توێژینەوە تازە بێت، چەند کەسێك هەن بینویانە، یاخود لەگەڵ دیاردەکەدا ژیاون، ئەوانە بە سەرچاوەیەك بۆ زانیاری دادەنرێن، ڕەنگە بەشێوەی نووسراو، یاخود زارەکی گەواهی خۆیان بدەن.

**٤. سەرچاوە کەسییەکان (وەك نامە و یادداشت و وەرگێڕانەکان)**

ئەوەش زانیاری بە وردەکاری و ڕاشکاوییەوە دەخاتەڕوو زیاد یکە لە دۆکیۆمێنت و تۆمارە گشتییەکان، ئەمەش بە گرنگ دادەنرێت بە تایبەتی لە توێژینەوە بایۆگرافییەکاندا (مێژووی کەسەکان).

**٥. توێژینەوە و نووسینە مێژووییەکان**

**٦. ئەو توێژینەوە وەسفییانەی کە لە پێشوودا ئەنجام دراون.**

**٧. نووسینە ئەدەبی و فەلسەفەییەکان**

**٨. پاشماوەکانی شوێنەوار و پاشماوە جیۆلۆژییەکان**

# باسی سێیەم
# میتۆدی مێژوویی میتۆدێکی ڕەخنەییە
# ڕەخنەگرتنی مێژوویی

دوای ئەوەی توێژەر ئەو سەرچاوانە دیاری دەکات کە بۆی دەگەڕێتەوە، ئەوا دەچێتە هەنگاوێکی گرنگ لە میتۆدی مێژوویی، ئەویش ڕەخنەگرتنە لە بەڵگانامەکان، ئەمەش بە دڵنیابوونەوە لە ڕاستی ئەو بەڵگەنامانەی کە پشتی پێی دەبەستێت، هەروەها دڵنیابونەوە لە کەسایەتی خاوەن بەڵگەنامە و شوێن و کاتی نووسینی، بنەما و پاساوی ڕەخنە و وریابوون و گومانکردنە لە زانیارییە مێژووییە بڕواپێکراوەکان.

ڕەخنەی مێژوویی گرنگە ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرین، کە گروپ و دەوڵەتەکانی ئەمڕۆ مێژوویەکی گوماناوی و شێوێندراو بە کاردەهێنن بە مەبەستێکی سیاسی.

ڕەخنەش بە دوو قۆناغ تێدەپەڕێت: یەکەم: ڕەخنەی دیار، ئەمەش پەیوەستە بە سەلماندنی سەرچاوەی مێژوویی بەڵگەنامەکە و جۆری هێڵی نوسین و کاغەزەکە، دیاریکردنی کەسایەتی دانەر، بوونی ناوی کەسێك لەسەر بەڵگەنامەیەك مانای ئەوە نییە کە خاوەنییەتی، هەروەها کات و شوێنی تۆمارکردن، ئەمەش پێی دەوترێت ڕەخنەی دەرەکی، هەرچی

ڕەخنەی ناوەکییە، بریتییە لە قۆناغی دووەم و جەخت لەسەرە مەبەستی نووسەر لە نووسینەکەی دەکاتەوە، ئایا بەڕاستی باوەڕی بە دروستی ئەوە هەیە کە دەینووسی، ئایا پاساو هەیە بۆ ئەوەی باوەڕ بە دروستی شتەکان بکات؟

یەکەم: ڕەخنەی دەرەکی، یاخود دیار

لەم حاڵەتەدا، توێژەر لە ڕاستی بەڵگەنامەکە دڵنیا دەبێت ، ئینجا چ لە ڕووی ڕووخسار، یاخود ڕەسەنایەتی، یاخود دڵنیابوونەوە لە شوێن و کاتی بێت، واتە بەشێوەیەکی وردتر ئایا ساختەیە، یاخود ساختە نییە، چونکە هەندێکجار شت دەخرێتە بازاڕەوە، لە کتێبە گشتییەکان، یاخود تایبەتەکان، یاخود چەند بەڵگەنامەیەك دەدرێنە پاڵ کەسە بەناوبانگەکان، بەمەبەستی قازانجی ماددی، یاخود دەستەبەرکردنی ئامانجگەلێکی سیاسی، یاخود پاسایی دیاریکراو.

ڤان دالین ئاماژە بۆ پێویستی وروژاندنی چەندین پرسیارێك لە لایەن توێژەر، یاخود ڕەخنەگر لە بارەی بەڵگەنامەیەك دەکات وەك[١٨٤]:

١. ئایا زمانی بەڵگەنامە و شێوازی نووسین و ئەو هێڵەی کە پێی نووسراوە (یاخود تایپکردنی) وەك شێوازی کارەکەی دیکەی و ئەو ماوەیە کە ئەم بەڵگەنامەیەی تێدا نووسراوە؟

[١٨٤]- ڤان دالین، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٨٣.

٢. ئاسا نووسەر شتگەلێکی جەوهەری ڕوونکردۆتەوە کە پێویست بیزانیایە و ئاماژەی بۆ بکردایە؟

٣. ئایا نووسەر شتی نووسیوە لەبارەی چەندین ڕووداو و کاروبار و ناوی شوێنێکی هێناوە کەسێك بیناسێتەوە کە لەم چاخەدا ژیا بێت.

٤. ئایا لە دەستنووسەکەدا شتێك هەیە گومان و دوو دڵی دروست بکات، وەك قسەیەك، یاخود زیادەیەك؟

٥. ئایا سەرچاوەکە وێنەی ڕەسەنی کتێبەکەیە، یاخود کۆپیەکی لێوەرگراوە. ئەگەر گوێزراوەیە لەگەڵ ڕەسەنەکە وەك یەکە؟

٦. ئەگەر دەستنووسەکە بەرواری لەسەر نەبێت، یاخود نووسەرەکەی نەناسراو بێت، ئایا شتێك هەیە لە دۆکیۆمێنتەکە ئەو شتانە ئاشکرا بکات.

## دووەم: ڕەخنەگرتن لە ناوەڕۆکی بەڵگەنامە

دوای ئەوەی توێژەر لە ڕاستی بەڵگەنامەکە دڵنیا دەبێت لە ڕووی ڕەسەنی و شوێن و شوناسی نووسەرەکەی، لە ڕێگای ڕەخنەگرتنی دەرەکی، ئەوا بەرەو ڕەخنەی ناوەکی دەچێت، واتە ڕەخنەگرتن لە ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکە و ڕاستی زانیارییەکانی، بریتییە لە مانای دیاریکراوەکانی هەر وشەیەك لە وشەکانی بەڵگەنامەکە لەگەل لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە مانای وشە و چەمکەکان لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە جیاوازە، هەروەها لەسەر توێژەر پێویستە دڵنیابێتەوە لە پاکی نووسەر و ناوبانگ و بابەخدان و پسپۆڕی لە بارەی ئەو بابەتەی کە لەسەری دەنووسێت.

ڕەخنەی ناوەکی پێویست بە ووژاندنی کۆمەڵێك پرسیار دەکات گرنگترینیشیان[185]:

١. ئایا پسپۆڕانی بواری بەڵگەنامەکە لێهاتوو و جێگای متمانەن؟

٢. ئایا نووسەرەکە توانا و لێهاتویی و شارەزایی هەیە کە وای لێبکات تێبینی ئەو شتانە بکات کە نووسیویەتی؟

٣. ئایا دەکرێت تەمەن، یاخود هەڵچوونەکان، یاخود تەندروستی دەستەیی وای لێ بکات نەتوانێت بە باشی تێبینی بکات و وردبێت لە ڕاپۆرتەکاندا؟

٤. ئایا ئەوەی نووسیویەتی لەسەر بنەمای تێبینیکردنی ڕاستەوخۆ دروستبووە، یاخود گواستنەوە لە وانی دیکە، یاخود وەرگرتن بووە لە سەرچاوەی دیکەوە؟

٥. ئایا بەڵگەنامەکەی ڕاستەوخۆ دوای ڕووداوەکە، یاخود دوای ماوەیەکی کورت یان درێژ پاش ڕووداوەکە نووسراوە؟

٦. ئایا ئەو شتانە تۆمار کردووە کە بینویەتی، یاخود گوێبیستی بووە، یاخود بە پشت بەستن بە یادەوەری نووسیویەتی؟

٧. ئایا شتێك هەیە کاریگەری لەسەر بابەتیبوونی بکات، وەك دەمارگیری، یاخود ئارەزوو کە دووری دەخاتەوە لە ڕاستگۆیی و وردی؟

٨. ئایا ئەمەی نووسیویەتی بە قەناعەتەوە نووسیویەتی، یان لە بەرامبەر پاداشت نووسیویەتی لە بەرژەوەندی کەسێك، یاخود پرسێکی دیاریکراو؟

[185]- فاخر عاقل، اسس البحث العلمي في العلوم السلوكية، بيروتن ١٩٧٩، ل ٧٣.

٩. ئایا نووسەرەکە دژپێکە لەگەڵ خۆی، یاخود دژپێکە لەگەڵ هەقیقەتگەلێکی جێگیر، یاخود نووسەرانی باوەڕپێکراو لەم بوارەدا؟

دوای ئەوەی توێژەر ڕەخنە لە بەڵگەنامەکانی دەگرێت و دڵنیا دەبێتەوە لە ڕاستیەکەی، ئەوا بەڵگەنامە و سەرچاوەکان لە خزمەتی کێشە و گریمانەکانی بەکاردەهێنێت، بەڵام دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەم پرۆسەی ڕەخنەیە مانای گەیشتن بە پلەی باوەڕ یان هەقیقەتی تەواو نییە لە بارەی مێژووی دیاردە یان ڕووداو. بەڵکو پرۆسەیەکە لە هەقیقەتمان نزیک دەخاتەوە، بەگوێرەی تواناش گومانی لێ دوور دەخاتەوە.

باش بە کارهێنانی میتۆدی مێژوویی ئەو سوودانەی خوارەوە بە دەست دەهێنێت:

١. یارمەتیدەرە لە چارەسەرکردنی کێشە هاوچەرخەکان، بە سوود وەگرتن لە شارەزاییەکانی ڕابردوو، واتە بەکارهێنانی ئێستا بۆ پێشبینیکردنی داهاتوو.

٢. جەختدەکاتەوە لەسەر ڕێژەیی هەموو شتێك، بەو مانایەی کە کاروبار و هزرەکان دەگۆڕێن لەگەڵ ڕۆیشتنی کاتدا.

٣. هەل دەڕەخسێنێت بۆ دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی داتاکان و گریمانەکان، یاخود گشتاندنی تیۆرەکان کە لە ئێستا و ڕابردوودا باون.

پێویستی ئەوە دەسەپێنێت میتۆدی زانستی پراکتیزە بکرێت لە توێژینەوەی مێژوو لە هەندێك کۆمەڵگاکان، بەشێوەیەك تیایاندا (دەنگی مردووەکان بەهێزترکەن لە دەنگی زیندووەکان)، ڕابردووش بە هەمو ڕەمز و ڕووداوەکانی زۆر ئامادەن لە ئێستادا، مێژوو هەژمورنی هەیە بەسەر ئێستا وەك وەهمی ڕابردووی مەزنکراوی ئەفسانەیی، بەڵام مانای ئەوە نییە دەستبەرداری مێژوو بین، بەڵکو خۆمان دووربگرین لە کەوتنە ناو حەتمییەتی مێژوویی، یاخود باس لە چارەنووسی مێژوویی بکەین، لێرەدا پێویستە پرسیارێك بکەین، ئایا چیمان لە مێژوو دەوێت؟

سەرەڕای گرنگی میتۆدی مێژوویی، ڕووبەڕووی ڕەخنە بۆتەوە لە لایەن ئەو توێژەرانەی کە گومانیان لە سودی مێژوو هەیە بۆ تێگەیشتن لە یاسا و دیسپلینەکانی کۆمەڵگای مرۆیی، هەندیکیان پێیانوانە میتۆدی مێژوویی ناتوانن بەشێکمان لە هەقیقەتی مێژوویی پێ بڵێت، نەك هەمو هەقیقەت، (جۆ چاڵك) دەڵێت: ئەوانەی ڕابردوویان بینووە تەنیا بەشێکیان بینیوە، تەنیا ئەو بەشەشیان باسکردووە لە یادیان ماوە، هیچ شتێك نەماوە لەسەردەمەکە جگە لەوەی تۆمارکراوە، ئەوەی سەرنجی مێژوونوسانیش دەدات تەنیا بەشێکە لەو هەقیقەتە، بەشێك سەرنجی مێژوونوسانی ڕاکێشاوە، ئەوەی دەکرێت لێی تێبگەین تەنیا بەشێکە لەوەی کە ڕاستە، مێژوونوس تەنیا دەتوانێت لە بەشێك تێبگات و ڕاڤەی بکات[١٨٦].

---

[186]- Gosttschalk L. under standing History, Alfred A kno, Pf New York, 1951.

هەمان بیرۆکەش لە لایەن لویس کۆهین باسکراوە، کۆهین دەڵێت زۆرجار توێژەر لە بارەی مێژوو باوەڕ بە زانیاری ناورد دەکات، ئەمەش وای لێدەکات کاری بیناکردنی ڕابردوو تەنیا وێنەیەکی نەخشەیی بێت و زیاتر لەوەی کە تابلۆیەکی ئەدگار ڕوون بێت[(١٨٧)].

بێگومان میتۆدی مێژوویی بانگەشەی ئەوە ناکات (ناشتوانێت وا بکات ) کە دەتوانێت جێگای توێژینەوەی واقیعی ژیان بگرێتەوە، کێشەکانی ئێستا و پرسەکانی ناڕوات، تەنیا بە مامەڵەکردنی ڕاستەوخۆ نەبێت، پەنابردن بۆ مێژوو تەنیا هەوڵێکە بۆ زیادکردنی تێگەیشتن و ڕووداوەکان بۆ ئەوەی بە ڕوانگەگەلێك بگەین کە یارمەتی توێژە بدات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مێژوو. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وریابین لە وەرچەرخانی بەکارهێنانی خراپی مێژوو بۆ جۆرێك لە سیاسەتی هەلاتن لە ئێستا، ئەمەش تێبینی دەکەین لەو کۆمەڵگایانەی کە ئێستا لەگەڵ کێشەکانی دەژین، بێتوانایی لە داهێنان و دروستکردنی مەرجەکانی ژیانێکی بەشکۆ، بەهۆی ئەوەی لە بارودۆخی خراپ دەژیت، بۆیە پاڵی پێوەدەنێت بۆ ڕابردوو بە تایبەتی ئەگەر ئەو ڕابردووە نەمر بێت و لە ئێستا باشتر بێت، وەك ئەمە حاڵەتی گەلە عەرەبییەکانە، کە تیایدا مێژوو بۆتە ئاڕاستەیەك بۆ ڕاکردن و جۆرێك لە هەلاتن لە ئێستاشی دروستکردووە.

---

[١٨٧]- لویس کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٠.

## بەشی چوارەم

## میتۆدەکانی توێژینەوەی وەسفی (ڕووپێوی کۆمەڵایەتی و توێژینەوەی بار)

توێژینەوە وەسفییەکان لە بەرەوپێشچوونی ڕەوڕەوەی توێژینەوەی زانستی کۆمەڵایەتیدا یارمەتیدەر بوون، بە شێوەیەکی ڕاست لە دەرخستنی کەموکورییەکانی کۆمەڵگا و دانانی نەخشەی چاکسازی کۆمەڵایەتیدا بەکارهاتن، لایەنگرانی توێژینەوەی وەسفی پێیانوایە میتۆدەکانی ئەم توێژینەوەیە نزیکترە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەك لەوانی دیکە، بۆ نمونە میتۆدی ئەزموونی، یاخود میتۆدی بەراوردکاری و هی دیکەش، توێژینەوەی وەسفی لەگەڵ بارودۆخی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەگونجێت کە بە ناجێگیری و گۆڕانکاری دەناسرێنەوە، هەروەها کارتێکەرە چالاکەکان جۆراوجۆر دەبن، ئەو مامەڵە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی دەکات بەوشێوەیەی کە هەیە، لە میانەی بەش و بکەری سەرجەم ڕەهەندەکانی واقیع ئاشکرا دەکات و بەمپێیەش زیاتر تێی دەگەین.

بێست لە پێناسەی توێژینەوە وەسفیەکاندا دەکات و دەڵێت: توێژینەوە وەسفییەکان بایەخ دەدەن بە بارودۆخ و پەیوەندییە هەبوەکان و مومارەسە باو و بیروباوەڕ و ڕوانگە و بەها و ئاڕاستەکانی خەڵك، لە پاڵ ئەو پرۆسە و

کارتێکەرانەی کە تاکەکان هەستی پێدەکەن، لەگەڵ ئەو ئاراستە و ڕەوتانەی کە لە گەشەسەندندان، توێژینەوەی وەسفی لە هەندێك باردا بایەخ بە توێژینەوەکردنی پەیوەندی نێوان ئەوەی هەیە لەگەڵ ڕووداوە پێشینەکان دەدات، کە ڕەنگە کاریگەری لەسەر ڕووداو و بارودۆخەکان هەیە[(١٨٨)].

بیرۆکەی توێژینەوەی وەسفی ئەوەیە کە توێژەر زانیاری ورد کۆ دەکاتەوە، وێنای واقیعی کۆمەڵایەتی دەکات و بەشداری دەکات لە شیکردنەوەی دیاردەکانی، پرۆسەی توێژینەوەی وەسفی یان میتۆدەکانی توێژینەوەی وەسفی بەپێی ئەو زنجیرەیە دەبێت:

**هەنگاوی یەکەم:** دیاریکردنی دیاردە یان دیاردە لێتوێژراوەکان.

**هەنگاوی دووەم:** ئاشکراکردنی شێوازی گونجاو بۆ پێوانەکردنی چەندێتی بۆ سەرجەم توخم و پێکهاتەکانی یەکەی توێژینەوە (واتە بە ژمارەکردن، یان بەکارهێنانی شێوازی ماتماتیکی).

هەنگاوی سێیەم: پشکنینی فاکتەرە جۆراوجۆرە کاریگەرەکان لە ڕێکخستنی دیاردەی لێتوێژراو و ئەرکەکانی[(١٨٩)].

**لە گرنگترین میتۆدەکانی توێژینەوەی وەسفی، بریتین لە میتۆدی ڕووپێو و میتۆدی توێژینەوەی بار، ئێستاش بە جیا باسی هەردووکیان دەکەین.**

[188]- Best J. W. research in Education (prenitice- he;; Englwood (Cliffs, New Jersey 1970).

[١٨٩]- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٢-١٦٣.

# باسی یەکەم
# میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی

## ١. پێناسەی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی

میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە میتۆدەکانی توێژینەوە وەسفییەکان، کە لەسەر کۆ کردنەوە و شیکردنەوەی داتا کۆمەڵایەتییەکان دەوەستێت لە ڕێگای ئامرازەکانی توێژینەوە وەك چاوپێکەوتن، یاخود پرسیارنامە لە پێناو بە دەستهێنانی زانیاری لەسەر ژمارەیەکی زۆری خەڵکی پەیوەندار بە دیاردەی لێتوێژراو. ڕووپێوە کۆمەڵایەتییەکان ئامانجیان دووبارە ئاشکراکردنی ڕێژەی دابەشکردنی هەندێك خەسڵەتی کۆمەڵایەتییە، وەك پیشە و داهات و تەمەن و ئاڕاستەی سیاسی و چەندانی دیکەش، واتە ئامانجی دەستەبەرکردنی زانیارییە لە بارەی هەڵوێستێك، یان کۆمەڵگایەك، یان گرووپێك، شیدەکرێتەوە لە پێناو زانینی هۆکار و دانانی یاسا و گشتاندنەکان.

چەندین پێناسە بۆ میتۆدی ڕووپێوی پێشکەشکراوە:

(توێژینەوەی زانستییە بۆ بارودۆخی کۆمەڵگا و پێداویستییەکان بە مەبەستی پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی تۆکمە بۆ چاکسازی کۆمەڵایەتی).

(توێژینەوەکردنی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییانەی کە کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا هەیە (ئینجا چ کۆمەڵگای خۆجێی، یان لادێ یان ناوچە، یان دەوڵەت، یان نەتەوە بێت)، بە مەبەستی بە دەستهێنانی زانیاری

و داتای تەواوە کە دەکرێت سودیان لێ ببینین بۆ دانانی پرۆژەی ئەنجامدانی چاکسازی کۆمەلایەتی[190].

ویتنی پێناسەی دەکات و دەلێت: (پرۆسەی تۆمارکردنی دۆخی باوی سیستەمە، یان کۆمەلە، یان هەرێمێکە بە مەبەستی شیکردنەوە و ئەنجام دەرهێنان، دەبێت لە کاتێکی دیاریکراو بێت و مەبەست لێی بەدەستهێنانی زانیاری تەواو بێت بۆ بە دەستهێنانی رێساگەلێك بۆ پراکتیزەکردنی کارەکانی داهاتوو[191].

لەو پێناسانە دەبینین کە رووپێو ئامانجی ئاشنابوونە بە لایەنە جیاوازەکانی بارودۆخی کۆمەلگایەك لە کۆمەلگاکان، کە دەکرێت دیاردەیەکی کۆمەلایەتی، یاخود تەواوی کۆمەلگا بێت، یاخود چەند کۆمەلگایەك بێت، بۆ نموونە دەکرێت میتۆدی رووپێو پراکتیزە بکرێت بۆ ناسینی ئاراستەکانی رای گشتی مەغریبی عەرەبی لە چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانە لە رۆژهەلاتی ناوەراست، لە حالەتی پەنابردن بۆ ئەم میتۆدە پێویستە ئەو نموونەیە دیاری بکەین کە نوێنەرایەتی کۆمەلگای توێژینەوە دەکات.

یەکەمجار توێژینەوەیەکی ئاشکراکاری دەکەین لەبارەی دیاردەی لێتوێژراو، دواتر ئەو نمونە دیزاین دەکرێت کە توێژینەوەی لەبارەیەوە دەکرێت، ئەم نمونەش دەبێت چەندین مەرجی تێدابێت کە نوێنەرایەتی کردنی کۆمەلگای لێوێژراو مسۆگەر دەکات بە شێوەیەکی راست، لە بەشی داهاتوو باس لە بابەتی نمونەکان دەکەین. دوای ئەمە ئەگەر پرۆسەی کۆکردنەوەی

---

[190]- Whithney, the elements of research, New York Boston, 1957, p 97.

[191]- روجر ويمر و جوزيف دويمينك، مناهج البحث الاعلامي، ترجمة صالح ابو صبح، دمشق، صبرا للطباعة و النشر، ١٩٨٩، لا ١٦٣.

زانیارییەکان لەڕێگای چاوپێکەوتن ئەنجام بدرێت، ئەوا باروودۆخێکی گونجاو دەڕەخسێنرێت بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن (وەك دیاریکردنی وادە و ئامادەکردنی پرسیار و ئامادەکردنی ئەو توێژەرانەی کە چاوپێکەوتن ئەنجام دەدەن)، بەڵام ئەگەر پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەڕێگای پرسیارنامە بوو، ئەمەی دوایی بەشێوەیەکی ورد ئامادە دەکرێت، ڕێگای گەیشتنی بە کەسە پەیوەندیدارەکان دیاری دەکرێت. دوای ئەوەی پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری ئەنجام دەدرێت، خشتە و ئامارەکان ڕێکدەخرێن، ئەو زانیاریانە شیدەکرێنەوە و ڕاپۆرتێك، یان توێژینەوەیەکی لەبارەیەوە دەنوسرێت، ئەمەش ئەنجام و پوختەی توێژینەوەیەکە. توێژینەوە ڕوپێوییەکان دابەش دەبن: بۆ ڕووپێوی وەسفی و ڕوپێویی شیکاری.

## ڕووپێوی وەسفی

ڕۆڵی ئەمە لەسەر وێناکردن و وەسفکردنی باروودۆخ و ئاراستەکانی ئێستای دیاردەی لێتوێژراو کورتدەبێتەوە، بێئەوەی قوڵبێتەوە لە ئاشکراکردنی هۆکارەکان، بۆ نمونە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە، یان پلاندانان ڕوپێوێك بۆ زانینی ڕادەی بێکاری لە وڵات، یاخود دامەزراوەیەك پرسیارنامەیەك ئەنجام دەدات پێش هەڵبژاردنەکان بۆ زانینی ئاراستەی ڕای گشتی لەبارەی پاڵێوراوەکان، ئەم جۆرە ڕوپێوە کارگێڕییەکان و خاوەن بەرژەوەندییەکان ئەنجامی دەدەن بەشێوەیەکی سوڕی بۆ ئاشنابوون بە دۆخی هەنوکە.

## رووپێوی شیکاری

ئەمە زۆر پـڕ بایـەخترەو وەکـو جـۆری وەسـفی ئەمـەیان زیـاتر وەسـفی توێژینەوەی زانستیی بەسەردا پراکتیزە دەبێت ، ئەو جۆرە روپێوە تەنیا بـە وەسفکردنی دیاردەکە ناوەستێت بەڵکو پەنا بـۆ شـیکرنەوە و رونکردنـەوەی هۆکارەکان دەبات، زۆرجاریش ئەو روپێوە دوو گۆڕاو، یاخود زیاتر هەیـە بـۆ دڵنیابوون لە راستی ئەو گریمانانەی کە دانراون، پاشانیش دەرکردنی ئەنجام کە ئامانجی توێژینەوەکەیە.

روپێو لە میتۆدەکانی دیکە جیادەبێتەوە، بۆ نمونە لە میتـۆدی مێـژوویی بـە فاکتەری کات جیادەبێتـەوە ، میتـۆدی روپێـو بایـەخ بـە واقیعـەکانی ئێسـتا دەدات، کەچی میتۆدی مێژوویی بایەخ بە رابردوو دەدات، بەڵام ئەنجامەکانی روپێو لە بوارێکی دیـاریکراوە دوای ماوەیـەکی زەمـەنی دەبێتـە بەڵگەنامـەی مێژوویی کە دەکرێت بۆ پرسی توێژینەوە پەنای بۆ بەرین. هەروەها روپێو لە میتـۆدی توێژینـەوەی بـار جیادەبێتـەوە بـە قـوڵی و تـەرکیزی زۆر لـە سـەر حاڵەتێکی دیاریکراو.

بـەکارهێنانی شـێوازی روپیـو بـە شـێوەیەی زانسـتی لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا یارمەتیـدەر بـووە بـۆ وەرچـەرخانی ئـەو زانسـتانەی کـە مۆرکی ئەدەبی و فەلسەفییان بەسەردا زاڵە بۆ زانستگەلێك کە بە بابـەتیبون دەناسرێنەوە، پشت بە هەقیقەتگەلێك دەبەستن کە لە واقیعدا وەرگیراوە.

هەروەها چەند دەوڵەتێك میتۆدی ڕووپێوی كۆمەڵایەتییان بەكارهێناوە بۆ خزمەتكردنی ئامانجی كۆمەڵایەتی نەتەوەیی، بەشێوەیەك ڕوپێو یارمەتیدەر بوو لە پرۆسەكانی پلاندانی نەتەوەیی كە ئامانجی گەشەپێدانی ژیانی ئابوری و كۆمەڵایەتی هاووڵاتیان، ئەمەش لە میانەی دانانی زانیاری ورد و ڕاست لەبارەی سەرجەم ڕووەكانی چالاكی كۆمەڵگا و بارودۆخەكەی، هەروەها یارمەتیدەر بووە لە توێژینەوەی كێشە كۆمەڵایەتییەكان و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان.

بەهۆی گرنگی ڕوپێو، ئەوا چەندین دامەزراوە و پەیمانگەی پسپۆڕ لە دەوڵەتە پێشكەوتووەكان بەكاری دەهێنن لەبەر گرنگی زۆر توێژینەوەی كۆمەڵایەتی. ئەو پەیمانگانە ڕووپێوی ڕای گشتی دەكەن، یاخود ڕووپێوی بازاڕ (بازرگانی)، پرۆسەی ئاماری ڕۆتینی، لە ئەمریكادا پەیمانگەی گالۆپ و كۆمپانیای هاریس و سەنتەری نەتەوەیی بۆ توێژینەوەی ڕای گشتی لە زانكۆی شیكاگۆ، لە بەریتانیاشدا سەنتەری ڕووپێوی كۆمەڵایەتی سەر بە حكومەتی بەریتانی لە دیارترین دەزگاكانن، هەروەك چەندین دەوڵەت بەشێكیان لەر وەزارەتەكانیان، یان پەیمانگایەكی تایبەتیان بۆ تەرخانكردووە، ئامانجی ئەنجامدانی ڕوپێووە لە بواری جۆراوجۆر بەهۆی گرنگی ئەو ڕوپێوانە لە سەرجەم بوارەكانی پلانی نەتەوەییدا، ئەمڕۆش چەندین سەنتەر و دامەزراوەی تایبەت و ڕۆژنامە هەن كە ڕوپێو ئەنجام دەدات لەماوەیەك بۆ ماوەیەكی دیكە یان بۆ ئەوانەی كە داوای دەكەن[١٩٢].

١٩٢- معن خليل عمر، الموضوعية و التحليل في البحث الاجتماعي، بيروتن ١٩٨٣، لا ٥٥.

بۆ مسۆگه‌ركردنی بابه‌تیبون له‌ كاتی ئه‌نجامدانی روپێو پێویسته‌ پابه‌ندبین به‌ هه‌ندێك مه‌رج كه‌ هه‌ریه‌كه‌ له‌ جۆن ئاسیلی و ڤان هۆتۆن دیاریان كردووه‌:

١. ده‌سپێكردنی پرۆسه‌ی ڕووپێوكردن بێ هزر و زانیاری پێشوو.

٢. ئاراسته‌كردنی ڕووپێو به‌ شێوه‌یه‌ك لایه‌نه‌ نه‌زانراوه‌كان بۆ توێژه‌ر ئاشكرا بكات، نه‌ك ئاراسته‌یه‌كی جێگیر كه‌ ده‌یزانێت.

٣. خۆدوورخستن له‌ پێشبینیكردنی ئه‌نجامه‌كانی ڕووپێو پێش ئه‌نجامدانی، به‌ومانایه‌ی كه‌ توێژه‌ر له‌ بیرۆكه‌یه‌ك ده‌ست پێ نه‌كات كه‌ ده‌یه‌وێت دووپاتی بكاته‌وه‌.

٤. وردبوون له‌سه‌رجه‌م قۆناغه‌كانی ڕووپێو، سه‌باره‌ت به‌و ئه‌نجامانه‌ی كه‌ ڕووپێوه‌كه‌ پێی ده‌گات.

٥. نه‌شاردنه‌وه‌ی ئه‌و زانیاریانه‌ی كه‌ ویستراوه‌، به‌ڵكو هه‌قیقه‌ت ئاشكرا ده‌كات ئینجا هه‌ڵوێسته‌كه‌مان هه‌رچییه‌ك بێت.

٦. هه‌ڵبژاردنی نموونه‌ی توێژینه‌وه‌ به‌ شێوه‌یه‌ی زانستی بێ لایه‌ن.

٧. دارشتنی پرسیاری پرسیارنامه‌ و دانانی پرسیاری ئیختیاری بۆ ئاشكراكردنی پله‌ی متمانه‌ له‌ نموونه‌كه‌.

٨. گشتاندنی ڕووپێو به‌ شێوه‌یه‌كی ساده‌ و خۆدووركرتن له‌ ئاڵۆزبوون.

٩. ئه‌زموون و هه‌ڵبژاردنی ئه‌نجامه‌كانی ڕووپێو بۆ دڵنیابوونه‌وه‌ له‌ ڕاستییه‌كه‌ی.

### ٢. جۆره‌كانی ڕووپێوی

ڕووپێو چەندین جۆری هەیە، هەندێکیان بە گوێرەی ئامانجی توێژینەوە، هەندێکی دیکە بە هۆی بواری پسپۆڕی، یان بوارەکانی پراکتیزەکردنی پۆلێنی دەکەن، ئێمە سەرەتا جۆرەکانی ڕووپێو بە گوێرەری ئامانج باس دەکەین و دوواتر قولتر دەبینەوەو جۆرەکانی ڕووپێوو لە بواری پراکتیزەکردنیشدا باس دەکەین.

**جۆرەکانی ڕووپێو لە ڕووی ئامانجەکانیانەوە:**

**١) ڕووپێوی وەسفی.**

**٢) ڕووپێوی ئاشکراکاری**

**٣) ڕووپێوی دەستنیشانکردن**

**٤) ڕووپێوی بەدوایەکداهاتن**

**٥) ڕووپێوی ووردەکاری**

هەروەك هەندێکی دیکە هەن ڕووپێو بۆ چوار جۆر دابەش دەکەن ئەوانیش:

**١) ڕووپێوی رای گشتی**

**٢) ڕووپێوی بازاڕ**

**٣) رووپێویی قوتابخانەیی**

**٤) ڕووپێوی کۆمەڵگای خۆجێی**

ئێمە بە وردەکارییەوە باس لەم چوار جۆرە دەکەین:

## یەکەم: ڕووپێوی ڕای گشتی

یەکەمجار ئەو جۆرە لە ئەمریکا سەریهەڵدا و بەتایبەتی لە بواری سیاسی، بەشێوەیەك بەکارهێنراوە بۆ ناسینی ئاراستەکانی ڕای گشتی ئەمریکی پێش هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی. چەندین پەیمانگە و گۆڤاری ناسراو خۆیان تەرخانکردووە بۆ ئەم جۆرە، گرنگترینیان پەیمانگەی گالۆپە کە لە ساڵی (١٩٣٥) دەستی بە چالاکی کردووە لەم بوارەدا.

ڕووپێوی ڕای گشتی شێوازێکە بۆ ئاشنابوون بە بۆچونەکانی خەڵك سەبارەت بە بابەتگەلێکی سیاسی و کۆمەلایەتی، کە خراوەتە بەردەم گفتوگۆ و سەرنجی جەماوەری ڕادەکێشاوە، ئەمەش ئامرازێکە بۆ دڵنیابونەوە و ئاشنابوون بە ئاراستەی ئەولەویاتی تاك و گروپەکان بەرامبەر پرسە نەتەوەیی، یاخود هەرێمایەتی، یاخود جیهانییەکان.

بەکارهێنانی میتۆدی ڕووپێو گەورە بوو لەگەڵ بڵاوبونەوەی شۆڕشی پیشەسازی و تەکنۆلۆجیا و سەرهەڵدانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی پێشکەوتوو لە تیڤی و ڕادیۆ و ڕۆژنامە فرە ئاراستە و پسپۆڕی، هەژموون یان باڵادەستبوونی ئەو ئامرازانەی هاوولاتیان، کاریگەری ئەو هێزانە لەسەر ئاراستە و هەڵبژاردنەکان، ئەمەش وای لێ دەکات ببێتە ئامرازێك و هێزێکی چالاك لە دەستی ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئەو کەرەستانەن.

زۆرجار ڕووپێوی ڕای گشتی لەو کۆمەڵگایانە بڵاودەبێتەوە کە تیایا ئاستی خوێندەواری بەرزە و دیموکراسی ڕێزی لێ دەگیرێت، چونکە ڕای گشتی ڕۆڵی نابێت یان حیسابی بۆ ناکرێت، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە ڕێز لە ڕای گشتی دەگیرێت و ئازادییەکانی تاك بوونی هەیە، کاریگەری دەبێت لەسەر ئەو کەسانەی بڕیار دەدەن. هەروەها پێویستە ئامرازی پەرەسەندوو هەبێت لە ڕووی ڕاگەیاندن و تەکنیکی و ئەو کەسانەی کە پسپۆڕن لەم بوارە. لەبەر ئەوەیە دەبینین وەرگرتنی ڕای گشتی کەمە لە دەوڵەتە عەرەبییە و کۆمەڵگا هاوشێوەکانیان، چونکە تیایدا ڕێز لە ڕای گشتی ناگیرێت و لەبەرچاو ناگیرێت، زۆربەی پرسە چارەنوسسازەکان بڕیاری لەسەر دەدرێت بێ گەڕانەوە بۆ گەل نەك بە پرۆسەی پرسیارنامە و بەهێند وەگرتنی ڕای گشتی، وەك پرۆسەی پرسی یەکێتی عەرەبی، یاخود دیموکراسی، چەند پرۆسەیەکی دیاریکراو ئەنجام دراوە لە سەنتەرەکانی یەکێتی عەرەبی لە بەیروت و پرۆسەی زانینی ئاڕاستەی ڕای گشتی لە بارەی یەکێتی عەرەبییەوە ئەنجامدراوە(١٩٣).

سەرەڕای ئەو گرنگییەی کە بە ڕووپێوی ڕای گشتی دەدرێت، ئەوا دەبێت وریا بین لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەنجامەکانی ڕاپرسیدا، چونکە زۆرجار خزمەتی ئامانج و سیاسەتێکی دیاریکراو دەکات، هێربێرت شیلەر لە کتێبەکەی (ئەوانەی یاری بە عەقڵەکان دەکەن) لە بارەی ڕووپێوی ڕای گشتییەوە لە ئەمریکا دەڵێت:

١٩٣- هربرت شيللر، المتلاعبون بالعقول، عالم المعرفة، الكويت، ١٩٨٣، لا ١٥٢.

"ڕووپێوی ڕای گشتی داهێنانێکی کۆمەڵایەتییە و ناکرێت لە پێکهاتەی دامەزراوەیی جیای بکەینەوە کە لە میانەیەوە کار دەکات، ئەمەش لە کۆمەڵگای ئێستادا مانای وەرگرتنی بۆچونە ئینجا هەرچەندە داڕشتنی لە شێوەی گوزارشتی کردەیی دابڕێژرێت، بە پلەی یەکەم ئامرازێکە و خزمەتی ئامانجگەلێکی سیاسی دەکات و بەردەوام ئامانجەکانی ڕوون نییە، بەڵام ئەو ئەنجامانە پاساوی دەبێت ئەگەر بێتو نهێنی بەرەی سپۆنسەرەکە ئاشکرا بکرێت"[194].

لێرەدا دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان حاڵەتەکانی ڕووپێوی ڕای گشتی کە دەوڵەت یان یەکێك لە دامەزراوەکانی یان دامەزراوەیەکی ئەکادیمی ئەنجامی دەدات لەگەڵ ئەو ڕووپێوانەی کە کۆمپانیا تایبەتەکان ئەنجامی دەدەن، ئەمەی دوایی کار دەکات بۆ لایەنگیری سپۆنسەرەکەی، زۆرجار ئەو ڕووپێوە کار دەکات بۆ شێواندنی ڕای گشتی لەژێر ناونیشانی بێلایەنی و بابەتیبوون، چەند ئاڕاستەیەکی سیاسی دەخاتەڕوو کە تەنیا خزمەتی دەسەڵات و دەستەبژێری دارایی خاوەن دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەکات.

شیلە پێیوایە "ئەو بەڵگانەی کە بە ماوەی نیو سەدە کەڵەکە بووە و سنووری نییە، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە وەرگرتنی ڕای گشتی تەنیا بەسەر خزمەتکردنی ئامانجە دیموکراسییەکان کورت نابێتەوە، بەڵکو ڕێگایەکە بەرەو کارەسات. ڕۆحی بێلایەنی و بابەتیبوون سیمایەکی فریودەرانەی

194- شیللر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٠.

دروستكردوە و وەهمی بەشداریكردنی گەل و ئازادی هەڵبژاردنی دووپات كردۆتەوە، لە پێناو ڕووپۆشكردنی دەزگای ئاراستەكردنی هۆشیاری و باڵادەستبوون بەسەر عەقڵەكانە بەمەش ڕۆژ دوای ڕۆژ پەرەدەستێنێت".(١٩٥)

**دووەم: ڕووپێوی بازاڕ (ڕووپێوی بازرگانی)**

بریتییە لە پراكتیزەكردنی پسپۆڕانە بۆ ڕووپێوكردنی ڕای گشتی لە بوارێكی دیاریكراو، ئەمەش بۆ بواری كاڵا و بەرهەم و مەودای پێشوازیكردنی خەڵك لێیان دەگەڕێتەوە، كە خزمەتی پیاوانی خاوەن پارە و بازرگانی دەكات لە جیاتی سیاسەتمەدارەكان.

ڕووپێوی بازاڕ ئامانجی پێوانەكردنی ڕای گشتییە لە بارەی كالایەكی دیاریكراوەوە و ناساندنی شێوازی بەكاربردنییەتی، هەروەها ناسینی شێوازەكانی پڕوپاگەندەی بازرگانی برەودانە بە كاڵایەك...هتد، بێگومان بە كارهێنانی ڕای گشتی لە مەیدانی بازرگانی ڕوو نادات تەنیا دوای پەرەسەندن و ئاڵۆزبوون نەبێت لە بازاڕ، كۆمپانیاكان لەگەڵ یەكتر كێبڕكێ دەكەن لە پێناو كۆنترۆڵكردنی بازاڕدا.

لە ئەمریكا و لە كاتی جەنگی یەكەمی جیهان (كە پیشەسازی بەرفراوان بوو و وزەی بەرهەمهێنان زیادبووە و مەیلی بەكاربردنی جەماوەری ڕوو لە زۆری

---

[١٩٥]- سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٩.

کردووە)، پێویستییەکی زۆر سەریهەڵدا بۆ دۆزینەوەی ئامرازگەلێك لە پێناو ئاشکراکردن و شیکردنەوەی مەودای ڕۆماڵکردنی پروپاگەندەی بازرگانی کە ڕادیۆ و ئامرازەکانی دیکە دەیگوازنەوە، لە پاڵ مەودای کاریگەرییان لەسەر جەماوەری بەکاربەر.

بەمشێوەیە سەرپەرشتیارانی بازاڕ، ئامانجیان ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستییە بۆ بەکارهێنانی لە لایەن دامەزراوە پیشەسازی و فرۆشتن و بانکەکان لە دیاریکردنی جۆری کاڵا باوەکان، کە دەکرێت بەرهەمهێنانی زیاد بکرێت، یاخود ئەو کاڵایانەی کە برەویان نییە، بەمپێیەش دەبێت بەرهەمهێنانی بوەستێنرێت، هەروەها چێژ و شێوازی بەکاربردنی جەماوەر دەربخات...هتد.

پێوانەکردنی ڕای گشتی لە بواری بازاڕ ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە میتۆدی ڕووپێوی گشتی، پەرەپێدانی شێوازی بەکارهێنانی نموونە و پرسیارنامە و چاوپێکەوتن وەك ئامرازێك بۆ کۆ کردنەوەی زانیاری.

لازارفیلد ئەوەی دووپاتکردەوە کە (توێژینەوەکانی پەیوەست بە بەکاربردنی بازرگانی بەشداریکردووە لە پەرەپێدانی میتۆدەکانی پێوانەکردن بە بەکارهێنانی نموونەکان، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی پرسیارنامە بۆ ڕای گشتی. دواتر وێنە بەدەرکەوت و بوو بە پێویستییەك بۆ تەواوکردنی ژمارەی

دابەشکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، بەمپێیەش ئەو داتایانە بوون بە ماددەی خاوی کایەکی تازەی کۆمینیکاسیۆن و توێژینەوە و ڕای گشتی)[١٩٦].

**سێیەم: ڕووپێوی فێرکاری یان قوتابخانەیی**

ئەم جۆرەی ڕووپێو بایەخ بە پرسەکانی پەیوەست بە پەروەردەو فێرکردن دەدات، پسپۆرەکان ڕادەسپێرێت، ئینجا چ لە دەرەوەی دەستەی وانەگوتنەوە، یان لە ئەندامەکانی دەستەی وانەگوتنەوە، بۆ ئەوە کار بکەن بۆ ڕووپێوکردن لە قوتابخانە و دامەزراوە پەروەردەییەکان، پشت بەو ئەنجامانە دەبەستن کە پێی دەگەن پلان و میتۆدە پێویستەکان دادەنرێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندن.

ئەو زانیارییانەی کە ڕووپێو هەوڵی کۆکردنەوەی دەدات لە بارەی دۆخی پەروەردەوە، ماددی یان مەعنەوی، یاخود خەسڵەتەکانی دەستەی وانەگوتنەوە، بە سیستەم پەروەردەیی لە نێو یەك وڵات یاخود لە نێو چەندین وڵات بەراوردی دەکەن، هەروەها ئەو ڕووپێوانە هەوڵدەدەن ئاشنا بن بە سروشتی قوتابی و خوێندکار و زانینی باکگراوندی کۆمەڵایەتییان یان ئاستی ڕۆشنبیری گشتییان، یاخود زانینی بۆچوونیان لە بارەی سیستەمی تاقیکردنەوەکانەوە...هتد، نموونەش لە ڕووپێوی پەروەدەیی ئەو ڕووپێوە بوو کە چەند توێژەرێك ئەنجامیاندا لەنێو قوتابییەکانی فەلەستین، بۆ زانینی ڕادەی کاریگەری داگیرکردن و کردە سەرکوتکارەکانی لەسەر ئاستی

[١٩٦]- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٢٥-٢٣٠.

خوێندن، بەمشێوەیە بەوە گەیشتن کە ئاستی پەروەدە لای فەلەستنییەکان بەشێوەیەکی سەرنجراکێش زیادتر دابەزی لە حاڵەتی پێش داگیرکردن.

## چوارەم: ڕووپێوی کۆمەڵگای خۆجێی

ڕووپێوی کۆمەڵگای خۆجێی نزیکترین جۆرەکانی ڕووپێوە لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، ئەمەش شێوازێکی کۆن و ڕێگایەکی سەرکەوتووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ڕاستەوخۆ لە مەیداندا. هەندێك پێیانوایە لە کۆندا لای فیرعەونەکانی میسر بەکارهێنراوە بۆ زانینی ژمارەی دانیشتووان، لە سەدەی ڕابردوو کارل مارکس بەکاریهێنا بۆ توێژینەوەکردنی حاڵەتی کۆمەڵایەتی و ئابووری کرێکارە فەرەنسییەکان لە فەرەنسا، دواتر ماکس ڤیبەر لە توێژینەوەی ئەخلاقی پرۆتستانتی بە کاریهێنا.

هەر لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمدا چەندین توێژەر بەناوبانگبوون بە هۆی ئەنجامدانی توێژینەوەی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی، ئەمەش خزمەتی کۆمەڵگاکانیانی کردووە و یارمەتیدەر بووە لە ئاشنابوون بە چەندین پرسی کۆمەڵایەتی و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان. لە گرنگترین توێژینەوەکانی ئەو جۆرە ڕووپێوە ئەم توێژینەوەیە بوو کە جۆن هاوارد لە ساڵی ١٧٧٤ ئەنجامیداوە و توێژینەوەکەی لە بارەی دۆخی بەندینخانەوە و زیندانەکانی بەریتانیا بوو. دواتر توێژینەوەیەکی بەراوردکاری ئەنجامدا لە نێوان بەندینخانەکانی بەریتانیا و دۆخی بەندینخانەکانی دیکەدا.

لـە فەرەنسـادا لابـلای لـە سـاڵی ١٨٥٦ دا توێژینەوەیـەکی ئەنجامـدا بـۆ بـارودۆخی کرێکـارە ئەوروپییـەکان کـە نزیکـەی بیسـت سـاڵی خایانـد، بەشـێوەیەك لەگـەڵ ٣٠٠ خێـزان ژیـا و ئاشـنابوو بـە شـێوازی ژیانیـان، ڕووپیوێکی ئەنجامـدا بۆ بـژێوی ژیانیـان و ڕاپـۆرتێکی لەبارەیـەوە نووسی. هەروەها چاکەی بەکارهێنانی شێوازی تێبینیکردنی بە بەشداریکردن و دانانی پلانێکی گشتی بە وردەکاری دەگەڕێتەوە بۆ لابلای، لـە پـاڵ بـە کارهێنـانی شێوازی پرسیارنامە و ڕاپرسییەکان[١٩٧].

لــە ئــەمریکادا یەکــەم توێژینــەوەی ڕووپێــوی کۆمەڵایــەتی لــە ســاڵی (١٩٠٠_١٩١٩) ئەنجامدرا و پۆل کیلۆج لە ساڵی (١٩٣٠) ئەنجامیدا، ستۆفەر ئەو میتۆدەی پراکتیزە کـرد بۆ ئاشـنابوون بـە ئاراستەی خـەڵك لـە ئـەمریکا بەرانبەر کۆمۆنیزم، هەروەها پۆل لازارفیلد بـە کاریهێنـا بـۆ توێژینـەوەکردنی سـەرکردە و شـێوازی پەیوەنـدیکردن بـە جـەماوەر و ڕەفتـاری ئـابووری و پرۆسەکانی هەڵبژاردن. لـە سـاڵی ١٩٧٧دا هەریەکـە لـە گـرای ماکفیرسـۆن و رالف لە ساڵ توێژینەوەیـەکی ڕووپێویـان ئەنجامـدا لـە ئوسـکوتلەندا لەسـەر (٢٠٠٠٠) کەس لەوانەی کە قوتابخانـەیان لـە مـاوەی پـێش ئـەو توێژینەوەیـە بەجێهێشـتووە. ئـامرازی ڕاپرســییان بــە کارهێنــان بــۆ کۆکردنــەوەی زانیارییــەکان، پرســیارەکانی پرســیارنامە بایــەخی بــە بابەتــەکانی وەك: هەڵسوکەوتی قوتابی لە نێو پۆل، شێوازی مامەڵەکردنی مامۆستا لەگـەڵیان و

[١٩٧]- لویس کوهن و لورنس مانیون، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤٦.

چەندین پرسیاری دیکە دەدات[198]، هەروەها چەندین توێژینەوە کراوە لە بارەی بارودۆخی فەلەستینییەکانەوە لە ماوەی راپەڕینی نێوان (١٩٨٨_١٩٩١) و کاریگەرییەکانی لەسەر ژیان و رەفتارییان.

## باسی دووەم
## توێژینەوەی بار

### ١) پێناسەکردن

توێژینەوەی بار بریتییە لە توێژینەوەیەکی قوڵ بۆ ئەو فاکتەرە ئاڵۆز و جۆراوجۆرانەی کە بەشداری دەکەن لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بە پەنابردن بۆ ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە توێژینەوە.

توێژینەوەی بار لە ڕووپێو جیادەبێتەوە بەوەی کە لە حاڵەتی لێتوێژراو قوڵدەبێتەوە و جەختی لەسەر دەکاتەوە دوای ئەوەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی و کاتی دایدەبڕێت لە حاڵەتەکانی دیکەی دەوروبەری، پۆل ڕیۆ یەکێکە لە گەورە نوێنەرەکانی ئەو میتۆدە و دەڵێت: ئایا زانای کانزا چی دەکات ئەو کاتەی دەیەوێت توێژینەوەی خاکێك بکات؟ ئەو ناچێت بۆ ئەوەی لەملاوئەولا توێژینەوەی پوختەکراوەکان بکات، بایەخیش بە شیکردنەوە هەندەکییە پەرتەوازەکان نادات، بەڵکو ڕاستەیەك لە وەرشەکە دەهێنێت و دەیەوێت

---

[198] - ارمان کوفلیە، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٧.

توێژینەوەی بکات، بەشێوەیەکی هەمەکی شیدەکاتەوە، کۆتاییش بەدوایدا دەچێت[199].

لەم سۆنگەیەوە گرنگترین خەسڵەتی میتۆدی توێژینەوەی بار بریتییە لە قوڵبوونەوە لە حاڵەتی لێتوێژراو، ئینجا چ تاك یان خێزان، یان ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی بێت، بە دوای هەلومەرجەکەیدا دەچێت بە سەرجەم قۆناغەکانی دروستبونییەوە تا ئەوکاتەی کە لە ژێر توێژینەوەدایە. لێرەوە میتۆدی توێژینەوەی بار بە فلاش باك دەچێت لە کارە هونەرییەکان و بەتایبەتی سینەما، ئەوکاتەی بینەر فیلمێك دەبینێت کە بە دیمەنێکی یەکلاییەکەرەوە و مەترسیدار دەستپێدەکات کە پاڵەوانی فیلمەکە پێیدا تێپەڕیوە، دوای ئەوە تەواوی فیلمەکە گوزارشتە دەکات لە نمایشکردنی ئەو قۆناغە، لە پاڵ ئەو هەنگاوانەی کە پاڵەوان (یان ڕووداوەکان) پێیدا تێپەڕیون تاوەکو گەیشتۆتە ئەو دۆخەی ئێستا.

هەمان شتیش بۆ توێژینەوەی بار ڕاستە ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین کە بابەتی توێژینەوە کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی (یان پارتێکی سیاسی) گرنگە، لەم حاڵەتەدا توێژەر فلاش باك دەکات بۆ ژیاننامە و پەیوەندییەکانی لێتوێژراوەکە، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستە بە ژیانی ڕابردووی، ئەمەش بە ئامانجی ئاشکراکردنی ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەرییان لەسەر یەکەی توێژینەوە هەیە، هەروەها بۆ ئەوەی پەیوەندییە هۆکارگەراییەکانی

[199]- ارمان کوفلیە، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٠.

نێوان بەشەکانی ئاشکرا بکات، بە ئامانجی گەیشتن بە گشتاندنی زانستی قوڵی پەیوەست بەو و یەکە هاوشێوەکانی.

بۆچونەکانی جیاوازبوون لە بارەی ئەو پێگەی کە توێژینەوە هەیەتی لە نێو میتۆدەکانی دیکەی توێژینەوەدا، بەشێوەیەك هەندێك نووسەر ئەوەیان ڕەتکردۆتەوە کە توێژینەوەی باری لە خۆیدا بە سەربەخۆیی هەبێت، بەڵکو وەك ئامرازێك لە ئامرزەکانی کۆکردنەوەی زانیاری مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، لەو سۆنگەیەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە توێژینەوە سەرانسۆکان، یان وەسفییەکان، هیچ شتێك نییە ڕێگر بێت لە بەکارهێنانی توێژینەوەی بار لە نێو میتۆدەکانی دیکەدا.

لەم چوارچێوەیەدا ئێرمان کۆفلێ پرسیار دەکات: ئایا میتۆی ئاماری تاکی (توێژینەوەی بار) دەتوانێت بەرەو بڕیاردان و ڕاڤەکردنێکی ڕازیکارمان بەرێت بۆ ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان[٢٠٠]؟

بەلام جۆد و هات[٢٠١] جەخت لەسەرە ئەوە دەکەنەوە کە میتۆدی توێژینەوەی بار، میتۆدێکە نە ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان، (توێژینەوەی بار ئامرازێك نییە لە ئامرازەکانی توێژینەوە، بەڵکو میتۆدێکە لە بنەمادا دروستبووە لەسەر توێژینەوەی یەکە کۆمەڵایەتییەکان بە خەسڵەتە هەمەکییەکەی، ئەوانە لە توێژینەوەی بار دەڕوانن بەوپێیەی

[200]- method in social research, New York, 1952.

[٢٠١]- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٥٠.

ئامرازێکە لە ئامرازەکانی توێژینەوە، شکست دەهێنن لەوەی کە جیاوازی بکەن لە نێوان توێژینەوەی بار وەك میتۆدێك کە شێوازی تایبەتی هەیە لە ڕوانین بۆ هەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان، لەگەڵ ئەو ئامرازانەی کە هاوشانی ئەو میتۆدە بوون هەر لە سەرەتای دروستبونییەوە وەك تێبینیکردن و بەڵگەنامە کەسییەکان[٢٠٢].

ئاراستەی باو مەیلی بۆ ئەوە هەیە کە توێژینەوەی بار میتۆدێکی سەربەخۆیە، تەنیا بە سەر کۆکردنەوە و پۆلێنکردنی زانیاری کورتنابێتەوە، بەڵکو بەدوای حاڵەتەکەدا دەچێت لە تەواوی قۆناغەکانی، زانیارییە کۆکراوەکان شیدەکاتەوە و ڕاپۆرتێك لە بارەیانەوە دەنووسێت کە گوزارشتە لە ئەنجامی کۆتایی توێژینەوە. هەروەك توێژینەوەی بار پشت بە ئامرازە جیاوازەکانی توێژینەوە دەبەستێت، وەك تێبینکردن و چاوپێکەوتن و بەڵگەنامە کەسییەکان ئەگەر توێژینەوەکە پەیوەست بێت بە تاکێك لە تاکەکان.

هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین چەندین ناو بەم میتۆدە بەخشراوە، ئارمان کۆفلیڕ پێی دەڵێت میتۆدی ئاماری کەسی[٢٠٣]، هەرچی فەڕەنسییەکانن، ئارەزوو دەکەن چەمکی میتۆدی مۆنۆگرافی بەکاربهێنن، چونکە مۆنۆگرافیا مانای وەسفکردنی تەنیا یەك بابەتە.

---

٢٠٢- جمال زكي و السيد ياسين، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٩.

٢٠٣- هەمان سەرچاوە، لا ، لا ٢٦٢.

لە چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوەی باردا دەکرێت جیاوازی بکەین لە نێوان توێژینەوەی بار، وەك میتۆدێك کە باس لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات، وەك خێزانێك، هۆزێك، پارتێك...هتج، لەگەڵ توێژینەوەی باری یەك کەس، ئەوانەش دوو جۆرن. مێژووی بار کە ماندێل شێرمان پێناسەی دەکات بەوەی کە چیرۆکی پەرەسەندنی ژیانی تاکێکە لە تاکەکان، کە گەشەی جەستەیی و زیهنی و هەڵچوونی و ڕەفتاری لەخۆ دەگرێت، جۆری دووەمیش مێژووی ژیانی کەسی، کە شێوەیەکە لە شێوەکانی مێژووی بار کە تیایدا تاکی لێتوێژراو ئەو ڕووداوانەی دەخاتەڕو کە پێیدا تێپەڕیووە لە پاڵ ئەو ئاڕاستە و شارەزایانەی کە لە ژیاندا وەری گرتووە.

بۆلن یۆنگ پێیوایە فرێدرێك لابلای یەکەم کەسە بە شێوەیەکی میتۆدی ڕێکخراو میتۆدی توێژینەوەی باری بەکارهێنابێت، ئەمەش ئەوکاتە بوو کە توێژینەوەیەکە قوڵی کرد لە بارەی ئابووری خێزانەکان، هەرچی سپسنەرە بە یەکەم زانای کۆمەڵناسی دادەنرێت کە توێژینەوەی باری بە کارهێنا بێت لە چوارچێوەیەکی فراواندا، ئەمەش لە توێژینەوەکانی لە بارەی مرۆڤی بەراییدا بەدەردەکەوێت(٢٠٤).

بە شێوەیەکی گشتی تیۆری جاشتالت کە لە سەدەی ڕابروو سەرهەڵداوە یارمەتیدەر بووە بۆ بایەخدان بە میتۆدی توێژینەوەی باری، لایەنگرانی ئەو قوتابخانەیە بانگەشەی پێویستی بایەخدانیان کرد بە هەڵوێستی گشتی کە

---

٢٠٤- همان سەرچاوە، لا ٢٦٩.

بوونـەوەری زینـدوو کـارلێکی لەگەڵدا دەکـات، هـەروەها نابێـت بوونـەوەری زیندوو و ئەو گشتە لەیەکتر جیابکرێنەوە کە کارلێکی لەگەڵ دەکات تەنیا بۆ مەبەستی شیکردنەوە نەبێت.

چـەندین پێناسـە هەیـە بـۆ میتـۆدی توێژینـەوەی بـار، ئـەوەی لـە یـەکتریان جیادەکاتەوە توخمی فراوانی و هەمەکیبوونـە، هەنـدێکیان توێژینـەوەی بـار تـەنیا بەسـەر چوارچێوەی تـاك کورتدەکەنـەوە، مانـدێل شـرمان لـە کتێبـی (کێشەکانی ڕەفتار) پێیوایە لـە بنـەمادا مێـژووی بـار چـیرۆکی پـەرەسـەندنی ژیانی تاکێك لـە تاکـەکان لـەخۆ دەگرێـت، کـە گەشـەی لایـەنی جەسـتەیی و زیهنی و هەڵچوونی و ڕەفتاری لەخۆ دەگرێت. چەندین پێناسەی دیکـە هەیـە کە بواری بایەخدانی توێژینەوەی بـار فـراوان دەکـەن، بەشـێوەیەك دەکرێـت تاکێك یان ڕێکخسـتنێك یـان گروپێکـی خـۆجێی لـەخۆ بگرێـت. لەمبارەیـەوە بۆلین یۆنگ دەڵێـت (ئـەوەی کـە میتـۆدی توێژینـەوەی بـار بـەکاردەهێنێت، دەتوانێـت هەڵوێسـت و کـەس و گـروپ و سیسـتەمە کۆمەڵایەتییـەکان تـاقی بکاتـەوە، بەشـێوەیەك ڕوانگـەی بۆیـان ڕوانگەیـەکی گشـتی دەبێـت، بۆیـە دەکرێت توێژەر بە چەند گشتاندنێك بگات لە ڕێگـای توێژینـەوەی ژمارەیـەك لە حاڵەتەکان و کۆکردنەوەی داتا و زانیارییـەکان بەشـێوەیەکی دروسـت.... ئـەو گشـتاندنانە چـەندین فاکتـەری ئاشـکرا کـرد کـە کاریگـەرییان لەسـەر هەڵوێستە گشتییەکەدا هەیە)[٢٠٥].

---

٢٠٥- همان سەرچاوە، لا ٢٦٧.

کلیفۆرد شۆش بە هەمان ئاراستەی دواییدا ڕۆیشت بەشێوەیەك پێیوایە میتۆدی توێژینەوەی بار جەخت لەسەر هەڵوێستێکی گشتی یان کۆکردنەوەی فاکتەرەکان دەکاتەوە، هەروەها جەخت لەسەر وەسفکردنی پرۆسەکان یان بەدواداچوونی ئەو ڕووداوانەی دەکات کە ڕەفتاری پێدا تێپەڕیوە، ڕەنگە بارەکە تاکی، یاخود سیستەم یان کۆمەڵگایەکی خۆجێی بێت، یان هەر گروپێك بە یەکەی توێژینەوە دابنرێت[٢٠٦].

ئەگەر توێژەر بتوانێت زانیارییەکانی لە بارەی بارێکی لێتوێژراوەوە کۆبکاتەوە لە ڕێگای چاوپێکەوتن، یان پرسیارنامە ئەوا باشترین ئامراز بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو حاڵەتە بریتییە لە شێوازی تێبینیکردنی ئینجا چ بە بەشداریکردن یان بێ بەشداریکردن بێت.

**٢) هەنگاوەکانی میتۆدی توێژینەوەی بار و ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی دەکرێن:**

**أ. هەنگاوەکانی میتۆدی توێژینەوەی بار.**

١. دیاریکردنی ئەو دیاردە یان بارەی کە توێژینەوەی لە بارەیەوە دەکرێت، ئینجا چ کەسێك، یان پارتێك، یان کۆمەڵگایەکی خۆجێی بێت..هتد.

٢. دیاریکردنی ئەو چەمك و گریمانە زانستییانەی کە توێژەر لە توێژینەوەکەیدا بەکاریان دەهێنێت.

---

[٢٠٦]- هەمان سەرچاوە، لا ٢٦٨.

٣. دڵنیابوونەوە لە هەبوونی داتا و زانیاری پەیوەست بە بابەتەکە.

٤. ئەگەر توێژەر خەریکی توێژینەوەکردنی توێژێك، یان چینێك بێت...هتد، ئـەوا پێویسـتە ئـەو نموونەیـە هەڵبـژێرێت کـە نوێنەرایـەتی کۆمـەڵگای توێژینەوەکەی بکات.

٥. دیـاریکردنی ئامرازەکـانی کۆکردنـەوەی زانیـاری، وەك تێبینیکـردن و چاوپێکەوتن و بەڵگەنامە کەسییەکان، ئینجا چ بارەکـە تاکێـك یـان کۆمـەڵێك تاك بێت.

٦. ڕاهێنانی ئەو کەسانەی داتاکات کۆ دەکەنەوە و دڵنیابوونەوە لـە توانایـان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی کە پێیان سپێردراوە.

٧. کۆکردنەوەی داتا و تۆمارکردن و شیکردنەوەیان.

٨. دەرهێنانی دەرەنجامەکان و گشتاندنیان.

**ب. ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی میتۆدی توێژینەوەی بار دەکرێن**

سەرەڕای ئەوەی کە میتۆدی توێژینـەوەی بـار جـێگیر بـووە وەك میتـۆدێکی زانستی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانسـتەکانی دیکەشـدا، بـەڵام چـەندین ڕەخنەی ئاراستە کراوە، گرنگترینیان:

١. دژواری پابەندبوون بە بابەتیبوون، بەشێوەیەك تیایدا توخمە خـودێتی و بڕیـاری کەسـی لـە ڕەوتـی توێژینەوەکـە باڵادەسـتە بەسـەریدا، ئینجـا چ لـە قۆناغەکانی هەڵبژاردنی حاڵەتە لێتوێژراوەکان یـان لـە قۆنـاغی کۆکردنـەوەی زانیاری بێت.

٢. نادروستی و ناوردی داتا کۆکراوەکان، ئەمەش پەیوەستە بە توخمی یەکەم، ئەوانە لەو هۆکارانەن کە دەبێتە هۆی گومانکردن لە دروستی داتاکان، هەروەها ڕازیکردنی توێژەر لە لایەن لێتوێژراوەکان و بەمەش ئەوە دەڵێت کە توێژەر ڕەزامەندە لەسەری، یان لێتوێژراو واقیعەکان لە ڕوانگەی کەسییەوە دەگێڕێتەوە، کە ڕەنگە گوزارشت نەبێت لە هەقیقەت، یان باسی ئەو شتانە دەکات کە خزمەت بە ئامانجەکانی دەکات و مەزنیان دەکات، چەندین شت فەرامۆش دەکات، تەنیا بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ مەبەستە کەسییەکانی ناگونجێت.

٣. ڕوودانی هاوسۆزی لە نێوان توێژەر و ئەوکەسانە کە پەیوەندییان بە باری لێتوێژراو هەیە، بە تایبەتی ئەگەر بێت و توێژینەوەکە لە ڕێگای تێبینیکردن بە بەشداریکردن بێت، ئەمەش لە بەهای زانستی توێژینەوەکە کەمدەکاتەوە.

٤. دژواری گشتاندنی دەرەنجامەکان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تاقانەیی هەر بارێك و دژواری گشتاندنی بەسەر بارەکانی دیکەدا ئەگەر هاتوو لە یەك جۆریش بن.

# بەشی پێنجەم

## میتۆدی ئەزموونگەری

### باسی یەکەم
### پێناسەکردن

هەروەك لە پێشوتر باسمان کرد میتۆدی زانستی لەسەر تێبینیکردن و ئەزموون و سۆراخکاری و بەراوردکردن دادەمەزرێت، ئەم توخمانەش پێکهێنەری میتۆدی ئەزموونگەرین، واتە میتۆدی ئەزموونگەری نزیکترین میتۆدە لە میتۆدە زانستییەکانەوە،هەروەها لە زانستە کۆمەڵایەکاندا ئەو توێژەرانەی لەژێر کاریگەری دەستکەوتەکانی میتۆدی ئەزموونگەری بوون لە زانستە سروشتییەکاندا، هەوڵی گواستەوەی ئەو میتۆدەیان بۆ بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا.

بەڵام پراکتیزەکردنی میتۆدی ئەزموونگەری لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، دەبێت بە وریایەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، لە بەر تایبەتمەندێتی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و سەختی کۆنترۆڵکردنی ئەو هۆکارانەی کاریگەریان بەسەر ئەم دیادەوە هەیە کە لە ژێر ئەزموندایە .

حەسـەن سـاعاتی جیـاوازی لـە نێـوان میتـۆدی ئـەزمونکراو و میتـۆدی ئەزمونکردنـدا دەکـات ،بـە بۆچـوونی ئـەو یەکـەم لەسـەر فـرە ئـەزمونکراو درووست دەبێت ،واتە یەك رووداوێکـی دووبـارەبووەی خـۆ بـەخۆ لـە کـات و شـوێنی جیـاوازدا ،لێـرەدا توێـژەر یـان تێبینـەر دەسـت ناخاتـە نـاو ئەزمونکراوەکـەوە بـەڵکو تـەنیا سـەرنجی دەداتـێ و یاسـاکانی بەدەستدێنێ ،بەڵام میتۆدی ئەزمونکردن لەسەر تاقیکردنەوە و ئـەزمونکردنی بەرنامـە بـۆ دانراو بەمەبەست لەلایەن توێـژەرەوەو لـەکات وسـاتی دیـاریکراودا درووسـت دەبێت([207])

میتــۆدی ئەزموونگــەری لەســەر بنەمایــەك دەوەســتێت (کــە کاروبــارە هاوشـێوەکان لـە بـارودۆخی هاوشـێوەیەدا ڕوو دەدەن)، ئەمـەش بـە هـەوڵی توێـژەر بـۆ کـۆنترۆڵکردنی هـەموو گـۆڕاو و فاکتـەرە سـەرەکی یـاخود بـە کاریگەرەکان لـە پێکهێنـانی دیـاردە، بـە ئاوارتـەکردنی یـەك گـۆڕاو، توێـژەر دەیگۆڕێت بە ئامانجی دیاریکردن و پێوانەکردنی کاریگەری لەسەر پرۆسەکە. ئەمەش مانـای ئەوەیـە کـە ئەوکاتـە ئـەزموونکردن دەکرێـت بـوونی هـەبێت، ئەگەر بکرێت گۆڕاوەکان کۆنترۆڵ بکرێن.

بەشێوەیەکی گشتی ناوی ئەزموونکردن بەو پرۆسەی توێژینەوەیە دەڵێن کـە توێژەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی کـۆنترۆڵی دەکـات، واتـە بـیر لـە ئەنجامـدانی دەکاتــەوە لــە بــارەی بابــەتێکی دیـاریکراوەوە و لــە شـوێنێکی دیـاریکراو و

---

207

کاتێکی دیاریکراو، بە گوێرەی چەند ئامانجێکی دیاریکراو، هەروەها دەتوانێت دووبارە ئەزموونی بکاتەوە دوای ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاری لە بابەت یان شوێنەکە یان زەمان یان لە هەموویان، ئەم پرۆسەیەش زیادتر لە جارێك ڕوو دەدات، بەشێوەیەك دەکرێت بەراورد بکەین لە نێو ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستی دەهێنێت، تاوەکو بەهۆیەوە تێبینی دروستبوو لەسەر ببینین، واتە تێبینیکردن هەستەکی سۆراخکاری زانیاری و یاسا کۆمەڵایەتییەکان بکەین[٢٠٨].

وەك باوە ئەزموونکردن بە پرسیارێك دەست پێدەکات کە توێژەر دەیخاتەڕوو: ئایا بەخشینی پشوویەکی کورت بە کرێکارەکان لە کاتی کارکردندا دەبێتە هۆی باشدیکەکردنی بەرهەمهێنان؟ ئایا بەرنامەکەکانی هۆشیارکردنەوە لە تیڤی لە بارەی ئالودەبونەوە بە مادده هۆشبەرەکان کاریگەری لەسەر ئەو خەڵکە دەبێت کە بەکاریدەهێنن؟ ئایا ئاستی خوێندەواری کاریگەری لەسەر جێگیری پەیوەندییە هاوسەرگیرییەکان دەبێت؟ ئایا پەیوەندی هەیە لە نێوان ئایین و ڕەفتاری ئابووری؟ دوای ئەمە توێژەر دەستدەکات بە پراکتیزەکردنی ڕێساکانی میتۆی ئەزموونی لەسەر نموونەکە. بەشێوەیەك توێژەر دەچێتە قۆناغی وەسفکردن و شیکردنەوە، یان شیکردنەوەی مێژووی ئەو ڕووداو و کەسانەی پەیوەندییان بەو پرسیارە هەیە کەر توێژەر دایدەنێت، بەڵکو لەسەر ئەزموونکردن دەوەستێت ئەمەش

---

٢٠٨- حسن الساعاتي، تصميم البحوث الاجتماعية، بيروت ١٩٨٢، ل ٢٤٣.

بە چارەسەرکردنی فاکتەری دیاریکراو لەسەر دیاردە لێتوێژراوەکان واتە کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوەکان لە ژێر کاریگەری مەرجەکانە.

لێرەوە میتۆدی ئەزموونی لە میتۆدەکانی دیکە جیادەبێتەوە کە لەسەر تێبینیکردنی ئاسایی وەستاوە، ئەمە تێبینییەکی کۆنترۆڵکراوە، بەوشێوەیەی کە بیفردگ گوزارشتی لێ دەکات و دەڵێت: ئەزموون بریتییە لەوەی توێژەر دیاردەیەکی دیاریکراو دەهێنێت و دەیخاتە ژێر بارودۆخێکی زانراو بە دوورخستنەوەی تەواوی کاریگەرە دەرەکییەکان بە پێی توانا، بەومەرجەی کە توێژەر بتوانێت بە وردی تێبینی ئەمە بکات بۆ ئەوەی بتوانێت پەیوەندییەکانی نێوان دیاردە جیاوازەکان ئاشکرا بکات[٢٠٩].

کەواتە توێژەر مەبەستدارانە کۆنترۆڵی ئەو بارودۆخە دەکات کە ڕۆڵێکی گرنگ لە پێکهاتنی دیاردەی لێتوێژراو دەگێڕن و بە شێوەیەك بەڕێوەی دەبات کە لەگەڵ گریمانەکانی بگونجێت، سادەترین ئەزموون گۆڕان لەخۆ دەگرێت لە بەهای گۆڕاوێك کە پێی دەوترێت گۆڕاوی سەربەخۆ (تێبینی کاریگەری گۆڕاوێك دەکات لەسەر گۆڕاوێکی دیکە کە پێی دەوترێت گۆڕاوی پاشکۆ)، لێرەدا جیاوازە لەگەڵ توێژینەوەی وەسفی، لە توێژینەوە وەسفییەکاندا توێژەر دەیەوێت هۆکارەکانی پشت ئەو دیاردانەی کە بە کردەیی ڕوویداوە بزانێت، کەچی لە توێژینەوەی ئەزموونی بارودۆخەکان ڕێکدەخات بۆ ئەوەی ڕووداوەکان ڕووبدات، ئەگەر توێژینەوە وەسفییەکان

---

٢٠٩- احمد بدر سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٠.

وەسفی ئەوە بکات کە هەیە، ئەوا توێژینەوەی ئەزموونی هەوڵی زانینی شتێك دەدات کە دەکرێت بوونی هەبێت.

بۆ ئەوەی ئەزموونکردن لە میتۆدی زانستی سەرکەوتوبێت، لە ژێر بارودۆخی کۆنترۆڵکراو ئەنجام دەدرێت، بە گوێرەی توانا، کۆنترۆڵکردنیش لەسەر سێ شت دەبێت.

### ١. کۆترۆڵکردنی ژینگە

مەبەست لێی دروستکردنی ژینگەیەکی لەبارە لە کاتی ئەزموونکردندا و کاریگەرە نێگەتیڤەکانی لێ دوور دەخاتەوە کە ڕەنگە ئەزموونەکە بە لاریدا بەرن و کاریگەری لەسەر بکەرەکانی هەبێت.

### ٢. کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوەکان

هەرچەندە کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوەکان توند تر بێت، ڕێژەی دروستی ناوەکی زیاتر دەبێت.

### ٣. کۆنترۆڵکردنی هەڵبژاردنی تاکەکان

بەمانای کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی تاکەکانی نموونەکەیە ئینجا چ کۆنترۆڵە گروپ یان ئەزموونە گروپ بێت.

ئۆگۆست کۆنت بە یەکەم کەس دادەنرێت کە میتۆدی ئەزموونگەری لە کۆمەڵناسی بەکارهێناوە، بە شێوەیەك جیاوازی کردووە لە نێوان دوو جۆری

ئەزموونکردن: یەکێکیان ئەزموونی ڕاستەوخۆ و ئەویتریشیان ئەزموونکردنی نا ڕاستەوخۆیە، بەڵام گومانی هەبوو لەسەر بەسودی ئەمەی دوایی و توانای لە توێژینەوەکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، بەهۆی بێتوانایی لە کۆنترۆڵکردنی هەموو توخمە چالاك و پێوستەکان لە دیاردە بۆ ئەنجامدانی ئەزموون، کۆنت پێیوایە ئەزموونکردنی ڕاستەخۆ لەسەر تێبینکردنی هەستەکی وەستاوە، چونکە هەموو ئەو شتانەی لە پشت شتی بەرهەستن بوونیان نییە، بۆ ئەوەی هەموو پرسێك زانستی و ڕاست بێت لە ئەزموونی ناڕاستەخۆشدا، پێویستە بتوانرێت بخرێتە ژێر ئەزموون لە واقیعی ئەزموونیدا.

بەڵام چاکەی دانانی بنەما و ڕێساکانی میتۆدی ئەزموونی بۆ جۆن سیتوارت میل دەگەڕێتەوە لە کتێبی (سیستەمی لۆژیك) (System of Logic)[210]، بەشێوەیەك سێ شێوازی سەرەکی داناوە بۆ دروستکردنی بەڵگەکان، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شێوازە بەکاردەهێنرێت بۆ ئاشکراکردنی یاساکان، بەڵام تاکە ڕێگایە بۆ سەلماندن، ئەمەش پشت بە بوونی پرەنسیپی هۆکارگەرایی دەبەستێت، هۆکاریش ئەو پێشەکییە جێگیرەیەکە لەسەر هیچ مەرجێك ناوەستێت، بە تەنیاش بەسە بۆ دەرهێنانی ئەنجامەکان و بێ دواکەوتن، ئینجا بارودۆخەکە هەر چییەك بێت، (بەڵام هۆشداریدا لەوەی کە ئەم ڕێسایانە بێ گیان نین، هەروەك بە کەڵك پراکتیزە کردن نایەت لەسەر

210- Mill. A sesteme of lobic vol. L.N.Y. Londom Harpar and Eros, 1981>

هەموو بارەکان)، ئەو ڕێگا و شێوازانەی کە میلّ ئاماژەی بۆ کردوون بریتین لە شێوازی ڕێکەوتن و شێوازی جیاوازی و شێوازی پەیوەستبوون لە گۆڕان.

**باسی دووەم:ڕێگاو نەخشەسازیەکانی میتۆدی ئەزموونگەری**

میتۆدی ئەزموونی چەندین هەنگاو پەیڕەو دەکات لەوانە: دیاریکردنی گرفتی توێژینەوەکە، دارشتنی گریمانە گونجاوەکان لەگەڵ گرفتەکان، دواتر دیاریکردنی گۆڕاوی سەربەخۆ و گۆڕاوی پاشکۆ و دواتریش چۆنییەتی پێوانەکردنی پاشکۆ، دیاریکردنی مەرجە پێوستەکانی کۆنترۆڵکردن، کۆنترۆڵکردنی ئامرازە پەیڕەوەکراوەکان لە ئەنجامدانی ئەزموون، وەك باوە پێی دەوترێت فاکتەر. هەرچی ئەو گۆڕاوەیە کە دەمانەوێت کاریگەری بپێوین لەسەر دیاردەکە، گۆڕاوی سەربەخۆ یان گۆڕاوی ئەزموونییە، هەرچی ئەو گۆڕاوەی دەمانەوێت کاریگەری گۆڕاوی سەربەخۆی لەسەر بپێوین پێی دەوترێت گۆڕاوی پاشکۆ یان پشت پێبەستراو، بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ کاریگەری ڕۆژنامە لەسەر ئاراستەی سیاسییەکانی تاکەکان بپێوێن، ئەوا گۆڕاوە سەربەخۆکە ڕۆژنامەیە، هەرچی گۆڕاوی پاشکۆیە ئاراستە سیاسییەکانە.

لە سەرەتادا باس لە میتۆدی ئەزموونگەری دەکەین بەوشێوەیەی کە میلّ دایناوە، دواتریش قسە لەسەر نەخشەسازیەکانی ئەزموونکردن، یان کۆمەڵێك توێژینەوەی ئەزموونگەری دەکەین

## ١) شێوازەکانی میتۆدی ئەزموونگەری

### ١. شێوازی ڕێکەوتن

ئەو شێوازە دەوەستێتە سەر ئەوەی کە ئایا ئەو بارودۆخانەی کە دەبێتە هۆی ڕووداوێکی دیاریکراو جیادەبێتەوە بە بوونی توخمێکی هاوبەشی جێگیر لە نێویاندا، واتە لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو توخمەدا هەیە، هەیە لەوکاتەی کە تیایدا توخمەکانی دیکە دەگۆڕێت، ئەوەی توخمی جێگیرە هۆکاری ڕوودانی دیاردەیە، دەکرێت پرسەکە بە نێگەتیڤی لێی بڕوانین و بڵێین: ناکرێت ڕەگەزێکی دیاریکراو هۆکاری ڕوودانی دیاردەیەکی دیاریکراو بێت ئەگەر ئەو دیاردەیە بەبێ ئەو ڕوو بدات.

میل گوزارشت لەمە دەکات و دەڵێت (ئەگەر یەك بار یان زیاتر لە دیاردەی لێتوێژراو بوونی هەبوو لە یەك بارودۆخدا، ئەمە تاکە بارودۆخە تیایدا کە سەرجەم ئەو بارانە تێیدا بوونی دەبێت کە هۆکاری ڕوودانی ئەو دیاردەیەن).

**بۆ نموونە**

- باری یەکەم، فاکتەرەکانی أ.ب.ج دەبێتە هۆی ص.
- باری دووەم، فاکتەرەکانی د.ه.ج دەبێتە هۆی ص.

لەم دوو حاڵەتەدا دەگەینە ئەوەی کە توخمی ج هۆکاری ڕوودانی ئەنجامی (ص)ە، چونکە توخمی هاوبەشی نێوانیانە.

ئەگەر توێژەرێکی کۆمەڵایەتی بینی کە تەواوی ئەو لادەرانەی کە توێژینەوەیان لە بارەیەوە ئەنجامدراوە لە ناوچەی هەژارنشین گەورەبوون یان سەر بە گەڕەکی میللین، پاڵی پێوەدەنێت بەو دەرەنجامە بگات کە هەژاری، یان بنەچەی کۆمەڵایەتی هۆکاری ئەو لادانانەیە.

بەڵام ئەو شێوازە توێژەر دەخاتە نێو هەڵە و بەرەو پەنابردرن بۆ شێوازێکی ئاسانی دەبات، چونکە بوونی توخمی (ب) لە هەردوو حاڵەتدا یان چەند حاڵەتێك کە بۆتە هۆی ئەنجامی (ص)، ئەمە مانای ئەوە نییە کە بە ڕەهایی (ب) هۆکاری (ص)ە، ڕەنگە (ب) تەنیا توخمێکی لاوەکی بێت و بوونی لە هەموو بارەکاندا هەبێت، یاخود بوونی پەیوەستە بە بوونی توخمێك کە توێژەر چاوی لێ پۆشیووە، لە نموونەی پێشوو ڕەنگە هەژاری هۆکاری سەرەکی لادانەکان بێت، نەك نەزانی، یان نەخوێندەواری، یان هەڵوەشانەوەی خێزان...هتد، هەروەك مەعقوڵیش نییە هەموو هەژارێك لادەر بێ.

### ٢) شێوازی جیاوازی

پوختەی ئەم شێوازە ئەوەیە کە ئەنجام بە هۆکاری بوون و نەبوونی بەستراوەتەوە، ئەگەر هۆکار بوونی هەبێت، ئەوا ئەنجامیش بوونی هەیە، ئەگەر هۆکار نەبوو ئەنجامیش بونی نییە. ئەگەر ئەنجامی ٢ لەو حاڵەتانە بوونی هەبوو کە فاکتەری (ج) بونی هەبوو، ئەو ئەنجامە وندەبێت ئەوکاتەی

ئەم فاکتەرە بوونی نامێنێت، دەکرێت بڵێین (ج) هۆکاری لە ئەنجامی (ص)دا.

میل ئەمە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: ئەگەر هەردوو بار لەیەك دیاردە هەبێت لە حاڵەتێکدا، بەڵام لە ئەوی دیکە بوونی نەبێت، لە هەموو بارودۆخەکان جگە لە یەك بارودۆخ نەبێت، تەنیا لە حاڵەتی یەکەمدا بوونی هەیە، ئەو تاکە دۆخەی کە هەردوو حاڵەت تیایدا جیاوازن بریتیین لە ئەنجامی دیاردەیەك یان هۆکاری یان بەشێکی پێویست لەم هۆکارە[٢١١].

لەگەڵ ئەوەی کە جیاوازی سوودی خۆی لە بواری زانستە سروشتییەکاندا سەلماندووە، چونکە ئەمە وردە و دەکرێت لە ڕووخساردا فاکتەرە کاریگەرەکان کۆنترۆڵ بکرێت بەپێی توانا و بە وردی تێبینی بکرێت، بەڵام سەرکەوتنی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا لە هەمان ئاستدا نەبوو، چونکە ڕووداوە مرۆییەکان دژوارە بە شێوەیەکی ڕەها بە ئەنجام و فاکتەرێکی دیاریکراو یان چەند فاکتەریکی دیاریکراو ببەسترێتەوە، زۆرجار ڕوداوێکی کۆمەڵایەتی ئەنجامی کارلێکی چەندین فاکتەر و کارتێکەرە، کە چونەتە ناویەك و دژوارە لەیەکتریان جیابکەینەوە، شێوازی جیاوازی ئەو بنەمایەیە کە بیرۆکەی ئەزموونە گروپ و کۆنترۆلە گروپ لەسەر دەوەستێت لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا (وەك کەمێکی دیکە دەبینین).

**٣) شێوازی پابەندێتی لە گۆڕان، یان گۆڕانی ڕێژەیی**

---

[٢١١]- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠١.

میلّ لە بارەی ئەو شێوازەوە پێیوایە: (ئەگەر لە دوو حاڵەت یان زیاتر بڕ و بەهاکەی گۆڕانی بەسەردامات، ئەوا گۆڕان بەسەر بڕ و بەهای فاکتەرێکی دیکەدا دێت، دواتر ئەمەی دوایی ناگۆڕێت ئەگەر گۆڕان بەسەر ئەویتردا ڕوو نەدات، دەکرێت بڵێین کە یەکێك لە و گۆڕانانە هۆکار یان ئەنجامی گۆڕانی ئەویترە).

دەکرێت پەنا بۆ ئەو شێوازە بەرین ئەگەر دژوار بێت یەکێك لەو دوو شێوازەی دوایی پراکتیزە بکەین، ئەمەش (بەوشێوەیەی کە لە سەرەوە ڕوونکراوەتەوە)، لەسەر ئەو بنەمایە کە ئەگەر دوو دیاردە، دوو پێشەکی و ئەنجامی لە پێشنیە زانراو هەبێت، هەر گۆڕانێك لە پێشەکییەکانی هەریەکە لەو دیاردەیە دەبێتە هۆی گۆڕان لە ئەنجامەکانی هەردوو دیاردە، پێویستە بە ڕێژەی دیاریکراو، پەیوەندی هۆکارگەرایی هەبێت لە نێوان پێشەکی و ئەنجامەکان.

**بۆنموونە:**

- أ، ب، ج١ دەبنە هۆی ص١.
- أ، ب، ج٢ دەبنە هۆی ص٢.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەیوەندییەکی هۆکارگەرایی هەیە لە نێوان (ج، ص) و پێوانی پەیوەندی نێوان ئەو دوو گۆڕاوە کە فاکتەرەکان بەیەکەوە گرێدان بەکاردەهێنرێت، ئەمەش بەردەوام لە نێوان +١، —١، لە حاڵەتی

یەکەمدا بەیەکەوەبەستانی پێویستی، زۆربون لە یەکێك لە گۆڕاوەکان زۆربونی ڕێژە لە ئەوی دیکە دروست دەبێت، کەموکوڕی لە یەکێکیان دەبێتە هۆی کەموکوڕی ڕێژەیی لە ئەوی دیکە، لە حاڵەتی دووەمدا بە یەکەوە بەستانەوەی نێگەتیڤ یان پێچەوانە دەبێ، زۆربوونی یەکێك لە گۆڕاوەکان گۆڕانێکی ڕێژەیی لە گۆڕاوەکەی دیکە دروست دەبێت، کەموکوڕی لە یەکێك لە گۆڕاوەکان دەبێتە هۆی زۆربون لە گۆڕاوەکەی دیکە.

بەڵام ئەو سەرنجەی لەسەر ئەمەیە، ئەوەیە کەپەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو ڕەنگە پەیوەندییەکی هۆکارگەرایی بێت، یان ئەرکگەری دەبێت و گوزارشتە لە بەیەکەوەبەستانەوەی نێو دوو دیاردە لە یەك کاتدا، ئەمەش خەسڵەتی زاڵە لەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی کە تیایدا پەیوەندییە ئەرکگەرییەکان بڵاودەبێتەوە زیاتر لە ڕێژەیی.

## باسی سێیەم:

## نموونەکانی نەخشەسازیکردنی ئەزموونگەری

### یەکەم: شێوازی یەك گروپ

سادەترین نەخشەی ئەزموونگەری پێویستی بە گروپێك لە لێتوێژراوەکان هەیە، توێژەر پشت بە تێبینیکردن دەبەستێت، توێژەر گۆڕانێك دەپێوێت کە بەسەر گروپدا دێت دوای ئەوەی دەکەوێتە ژێر کاریگەری فاکتەرێك، یان گۆڕاوێکی دیاریکراو. ئەگەر توێژەر بیەوێت توێژینەوەی کاریگەری ماوەکانی پشوو بکات لەسەر کاری کرێکارەکان، لە پێشودا بەرهەمی کرێکاری لە

دامەزراوەیەکی دیاریکراو دەستنیشان دەکات، ماوەی پشووەکەی پێدەدرێت و دواتریش چاودیری ئەوە دەدات کە ئایا گۆڕان لە بەرهەم دروستبووە، ئەو گۆڕانەش دەپێوێت.

بۆ ئەوەی شێوازی یەك گروپ ئەنجامی پۆزەتیڤ بەدەست بهێنێت، دەبێت دڵنیابین لەوەی کە ئایا سەرجەم فاکتەرەکانی دیکە کۆنترۆڵکراوە کە کاریگەرییان لەسەر ئەزموون هەیە. ئەمەش هەندێکجار دژوارە کۆنترۆڵ بکرێت.

**دووەم: شێوازی گروپە هاوسەنگەکان**

تیایدا توێژەر دوو گروپی هاوسەنگ دروست دەکات، دەبێت هەردوو گروپە هاوشێوەکان لە لایەنی خەسڵەتە جیاوازەکانی وەك تەمەن، ڕەگەز، ئاستی زیرەکی، باککگراوندی خێزانی و کۆمەلایەتی...هتد لێك نزیك دەبنەوە.

توێژەر فاکتەری ئەزموونی بەکاردەهێنێت لە یەکێك لەو دوو گروپە، پێیان دەوترێت (ئەزموونە گروپ) و گروپەکانی دیکە بەجێدەهێڵدرێت بێ ئەوەی هیچ کارتێکەرێکی تێکەڵ بێت، ئەمەش پێی دەوترێت (کۆنترۆڵە گروپ)، دوای ماوەیەکی دیاریکراو تێبینی جیاوازی نێوان ئەو دوو گروپە دەکەین، بەشێوەیەك هەردوو گروپ لە هەموو شتێك هاوشێوەن جگە لە فاکتەری ئەزموونی، هەر گۆڕانێك بەسەر گروپی ئەزموونیدا بێت هۆکارەکەی فاکتەری ئەزموونییە.

بۆ نموونە، توێژەرێك دەیەوێت کاریگەری بەرنامەی تیڤی لە بارەی ماددە هۆشبەرەکان ئاشکرا بکات لەسەر ئالودەبوانی ماددە هۆشبەرەکان، بەمەش

لەم حاڵەتەدا پەنا بۆ هەردوو گرووپی ئالودەبوان بە ماددە هۆشبەرەکان دەبات (بۆ نموونە) لەم حاڵەتەدا پەنا بۆ هەردوو گرووپی ئالودەبوو بە ماددە هۆشبەرەکان لە بەندینخانەدا دەبات) و ڕەچاوی ئەوە دەکات کە هەردوو گروپەکە هاوسەنگ بن، یەکێکیان (ئەزموونە گروپ) دەخاتە ژێر فاکتەری ئەزموون واتە دەبێت تیڤی هەبێت و بەرنامەکانی هۆشیارکردنەوە بڵاودەکاتەوە و ئەوانی دیکەی لێ بێ بەش دەکرێت، دوای ماوەیەکی زەمەنی توێژینەوە دەکات: ئایا گۆڕان ڕوویداوە بەسەر ڕەفتاری هەڵوێستی گرووپی یەکەم؟ ئایا چ گۆڕانێك ڕوویداوە کە هۆکارەکەی بۆ بەرنامەکانی تیڤی بگەڕێتەوە.

بەڵام ئەو ئاستەنگانەی کە ڕووبەڕووی ئەو شێوازە دەبێتەوە بێتوانایی دەستەبەربوونی دوو گرووپی تەواو هاوشێوەیە، تەنانەت ئەو جیاوازییە سادەیەی کە توێژەر بایەخی پێ نادات کاریگەری کەڵەکەبووی دەبێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر ئەنجامی ئەزموون دەبێت.

**سێیەم: شێوازی گرووپی بەدووای یەکداهاتن**

لەم جۆرەدا توێژەر تەنیا بە یەك کۆنترۆڵە گروپ ناوەستێت، بەڵام گروپێکی دیکە یان زیاتری بۆ زیاد دەکات، بەو مەرجەی ئەو گروپانە هاوسەنگ بن و دواتر فاکتەری ئەزموونی بەسەر گروپەکان پراکتیزە دەکات یەك لە دوایەك. هەر گروپێك لە گروپە ناوەکییەکان لە توێژینەوەی بەدووای یەکدا هاتندا وەك ئەزموونە گروپ و کۆنترۆڵە گروپ دەبن لە سەروبەندی قۆناغە جیاوازەکانی توێژینەوەدا.

سەرەڕای ئەوەی کە میتۆدی ئەزموونی نزیکترین میتۆدە لە میتۆدی توێژینەوەی زانستی ڕاستەقینە، پراکتیزەکردنی ئەم میتۆدە لە بواری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لێوڕێژە بە وریایی و ڕاستی، لەم حاڵەتەدا بۆ توێژەر ئاسان نییە ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەری لەسەر دیاردەکان هەیە سنووردار دەکات، تەنانەت ئەگەر توانی ئەمەش بکات، ئەوا ناتوانێت ڕوونەدانی هەندێك شت مسۆگەر بکات کە کاریگەرییان لەسەر دیاردە هەیە، مرۆڤ بە سروشتی خۆی گۆڕاوە لە هەڵوێست و ڕەفتاریدا، زۆرجاریش دژوارە ئەزموون ئەنجام بدات بۆ دڵنیابوونەوە لە دیاردەکان، بۆ نموونە ناکرێت ئاشنا بین بە ئەنجامەکانی جەنگ لەسەر گەلێك، بەهۆی میتۆدی ئەزموونگەری، هەروەك هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە سیاسەتە گشتییەکان وەك سیاسەتی دەرەکی ناکرێت ملکەچی ئەزموون بکرێت، ئەگەر بکرێت پەنا بۆ شتێك بەرین کە هاوشێوەی ئەزموون بێت لە بواری سیاسەت، (تیۆری یارییە) کە دۆخێکی هاوشێوەی ڕۆڵە سیاسییە کردەییەکان دروست دەکات.

سەرەڕای هەمو ئەوانەش، ئەم میتۆدە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان پراکتیزە کرا، بەشێوەیەك چەندین ئەزموونی سەرکەوتوو ئەنجامدرا و ئەنجامەکانیشی سەرکەوتنی باشیان بەدەستهێنا، لە بوارەکانی دەروونناسی کۆمەڵایەتی، لە بوارەی سۆسیۆلۆجیا، تەنانەت لە بواری سیاسەتیشدا، بۆ نموونە زانینی ڕادەی کاریگەری شێوازە جیاوازەکانی فەرمانڕەوایی بەسەر ڕەفتاری بە کۆمەڵ، هەردوو زانای ئەمریکی ئەزموونیان لەمبارەیەوە ئەنجامدا، ئەو زانایانە چوار کۆمەڵە منداڵیان هێنا (تەمەنیان لە دەوربەری ١١ ساڵە بۆ ئەوەی ڕەفتاریان سروشتی و دەستکرد نەبێت)، بەشێوەیەك

هەڵبژاردن کە هاوشێوەبون لە هەموو بارودۆخەکان مسۆگەر بکات، دواتر بۆ ماوەی شەش هەفتە ئەو منداڵانەی خستە بەردەم سی جۆری ئاراستەکردن و سەرکردەی سیاسی و دیموکراسی، ئانارشیزم، هەندێکجار کەسێك لە نێو گروپەکەدا بە تەنیا بڕیاری دەدات و دەسەپاند و سەرکوتی دەکردن، بەمەش کەشێکی دەسەڵاتخوازی دەرەخساند، جارێکی دیکەیش بە شێوەیەك مامەڵە دەکات کە هاوشێوەی رەفتاری دیموکراسییە، بەشێوەیەك راوێژی بە هەموویان دەکرد لە هەموو بڕیارەکاندا، هەندێك جاری دیکەیش کەشێکی ئانارشیزمی دروستدەکات و واز گروپەکە دەهێنێت بێ ئەوەی دەستوەربداتە بڕیارەکان، لە هەموو حاڵەتەکانیشدا چاودێر و سەرنجی پەرچەکردارەکانی منداڵەکان و شێوازی رەفتاریانی دەکرد[٢١٢].

---

[٢١٢]- محمدم طه بدوي، النظرية السياسية، منشورات الكتب المصري الحديث، ١٩٨٦، لا ٣٠٢_٣٠٣.

# بەشی شەشەم

## میتۆی بەراوردکاری

## باسی یەکەم

### پێناسەکردن

میتـۆدی بـەراودکاری بەکـەڵك پراکتیزەکـردن دێـت لـە سـەرجەم زانسـتە کۆمەلآیەتییەکاندا، توێژینـەوەی سۆسیۆلۆجی بـە سروشـتی خـۆی دەکرێـت بەراوردکاری تێدا بکرێت، بـەڵکو بـەراودکاری بـە یـەکێك لـە گـرنگترین ئـەو بنەمایانــە دادەنرێــت کــە کۆمەڵناســە دامەزرێنــەرەکان لــە توێژینــەوە کۆمەلآیەتییــە بەراییــەکان پشــتیان پــێ بەســتاوە لــە دانــانی بنــەماکانی کۆمەڵناسـی. دۆرکهـایم و زاناکـانی دیکـەی کۆمەڵناسـی پێیانوایـە میتـۆدی بەراوردکاری باشترین ئـامرازە لـە توێژینـەوەکانی کۆمەڵناسـی، بەشـێوەیەك میتۆدی مێژوویی و میتۆدی بەراوردکاریان تێکەڵ کردووە.

دۆرکهایم جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە زۆر بەسـودە بـەراوردکاری بکـەین هەتا لە نێوان چەند کۆمەڵگایەکدا کـە لـە یـەك جـۆرن یـان لـە چـەند جـۆری جیاوازن، چونکە دوو کۆمەڵگای یەك جۆریش یەك شت نین، هەر کۆمەڵگایەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆیە بە سودە دوو کۆمـەڵگا یان چـەندین کۆمـەڵگا بەراورد بکەین کە لە یەك دۆخـدا نـین، بەمـەش زنجیرەیـەك گۆڕانکـاری تـازە ئاشکرا دەکەین و بەرواردیان دەکەین.

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕوون ئاشنا بین بە میتۆدی بەراوردکاری و بەراوردی دەکەین بە میتۆدەکانی دیکە.

**میتۆدی بەراوردکاری و میتۆدی توێژینەوە بار**

زۆرینەی توێژینەوە مەیدانییەکان بە تایبەتی توێژینەوەی ڕێکخستنەکان، جەخت لەسەر میتۆدی توێژینەوەی بار دەکەن، لەو ڕوانگەیەی کە ڕێکخستنەکان هەزاران کەس لەخۆ دەگرن، ئەمەش وا دەکات توێژینەوەکردنی سەرجەمیان دژوار بێت،بۆیە یەك بار یان دوو بار توێژینەوە دەکرێت و ئەنجامەکانیش دەگشتێنرێت، بەڵام ئەو ڕەخنەیەی کە ڕووبەڕووی بە باشدتر زانینی میتۆدی توێژینەوەی بار بەسەر میتۆدەکانی دیکە دەکرێت، ئەوەیە کە توێژینەوەی بار لە حاڵەتێکدا بەسوودە ئەگەر چەقی بایەخدانەکە زانینی خەسڵەتەکانی ڕەفتاری تاکەکان بێت، بەڵام ئەگەر ویستمان ئاشنا بین بە خەسڵەتەکانی بونیادی ڕێکخستن، پێویست نییە کاتێکی زۆر لەمە خەرج بکەین، یاخود کۆششێکی مەزن لە ڕووپێوی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامەکان خەرج بکەین، بەڵکو تەنیا بەسە بارودۆخی ئەو ڕێکخستنە (دیاردەی لێتوێژراو) بکەین بە بارودۆخی ڕێکخستنەکانی دیکە لە میانەی شیکردنەوەیەکی تیۆری وردی کەلەپورەوە . ئەو ڕێکارەی دواییش وا دەکات توێژەر ناچار بێت جەخت لەسەر ئەو پرەنسیپانە بکاتەوە کە کۆنترۆڵی پەرەسەندنی ڕێکخستنەکان دەکات و وا دەکات ئەرکەکانی ئەنجام بدات[٢١٣].

**میتۆدی بەراوردکاری و میتۆی ئەزموونگەری**

ئەو توێژەرە کۆمەڵایەتییانەی کە ئارەزووی پراکتیزەکردنی ڕێساکانی میتۆدی زانستییان هەیە لە توێژینەوەی کۆمەڵگادا، لە چوارچێوەی

---

[٢١٣] - محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٨.

وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە باس لە دژواری ئەزموونکردن دەکەن لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان، پێیانوایە میتۆدی بەراوردکاری لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی هاوشێوەی ئەزموونکردنە لە زانستە سروشتییەکاندا، بەراوردکردن ئینجا ئەوەی کە درێژکراوەی زەمەنی، یان درێژکراوەیەکی ئاسۆیی هەیە وەك ئەزموونکردنە لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتییدا، لەمیانەیەوە توێژەر دەتوانێت ڕووەکانی وەرچەرخان و پەرەسەندن دیاری بکات کە بەسەر دیاردەدا دێت، هەروەها دەتوانێت ئەو کارتێکەرانە دیاری بکات کە مۆرکێکی دیاریکراو بە دیاردە دەبەخشێت لە بارودۆخێکی دیاریکراودا، هەروەها لە ڕێگای بەراوردکردندا دەکرێت ئەو یاسایانە ئاشکرا بکەین کە کۆنترۆڵی هەندێك دیاردەی کۆمەڵایەتی دەکەنەوە.

میتۆدی ئەزموونگەری تێکەڵ بە میتۆدی بەراوردکاری، ئەو کاتەی توێژەر میتۆدی ئەزموونگەری بەکاردەهێنێت لە ڕێگای گروپە جێگۆڕکێکان، ئەوا لە هەمان کاتدا بەراوردکردنیش ئەنجام دەدات، چونکە بەراورد دەکات لە نێوان ئەنجامەکانی ئەزموون لە نێوان حاڵەتی پێش تێکەڵکردنی فاکتەری گۆڕاو و دوای تێکەڵکردن و پێش بەکارهێنانی گروپی جێگۆرکێ و دوایی، ئەزموونکردن لە نێو خۆیدا توخمی بەراوردکردنی تێدایە.

**میتۆدی بەراوردکردن و میتۆدی مێژوویی**

وەك لە پێشودا باسکرا، بەراوردکاری یان لە نێو دیاردە، یان کۆمەڵە هاوچەرخەکانە، یان لە نێو دیاردە دیاردە و کۆمەڵە هاوچەرخ و رابردووخوازەکانە، بۆیە پێویستە میتۆدی بەراوردکاری هەندێکجار پشت بە مێژوو ببەستێت، لە لایەکی دیکەوە مێژوو میتۆدێك نییە بۆ کەڵەکەکردنی ڕەوتی ڕووداوەکان، بەڵکو توێژەر پەنای بۆ دەبات لەپێناو دەرخستنی یاسای گشتی لە بارەی دیاردەیەك لە میانەی بەراورکردنی ئەو دیاردەیە لە

ڕەوتی مێـژوو، لێرەدا ئەوە سەرهەڵدەدات کە پێـی دەوترێت مێـژووی بەراوردکاری. دۆرکهایم بە باشترین کەس دادەنرێت لەوانەی کە مێژوو و میتۆدی بەراوردکاریان پێکەوە کۆکردۆتەوە، بەشێوەیەك پێیوایە ناتوانین دامەزراوەیەك بناسین بێ بەدواداچوونی پەرەسەندنە مێژووییەکەی، لە پاڵ بەراورودکردنی قۆناغەکانی پەرەسەندنی، بەشێوەیەك دەڵێت: دامەزراوەی لێتوێژراو هەنگاو بە هەنگاو دروستبووە، ئەو بەشانەی پێکهێناوە و یەکتریان دروستکردووە، دواتر بە خێرایی، یان بە هێواشی زیاتر بوونە. کەواتە ئەوەندە بەسە بەدوای ڕەوتی پێکهاتنی لە مێژوودا بچین تاوەکو ئەو ڕەگەزە جیاوازانەمان بۆ دەربکەوێت کە لێی پێکدێت، کە دواتر پەرتەوازە بوون(٢١٤).

ئارمان کۆفلی پێیوایە مێژووی بەراوردکاری لە کۆمەڵناسی یەکسانە بە میتۆدی ئەزموونگەری، لەمەشدا پشت بە قسەیەکی دۆرکهایم دەبەستێت: تەنیا یەك ڕێگامان هەیە بۆ دیارخستنی بوونی پەیوەندی لۆژیکی نێوان دوو ڕووداو (وەك پەیوەندییەکی هۆکارگەرایی)، ئەم ڕێگایەش بریتییە لە بەراوردکردنی نێوان حاڵەتەکان، دواتر توێژینەوە لە بارەی ئەو گۆڕانکارییانە بکەین کە بەسەر بارودۆخێك دادێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پەیوەستی یەکێکیان بە ئەویتریانەوە.

ڕەنگە لە ساتی یەکەم وەها دەربکەوێت کە بەراوردکردن پێویستی بەوە نییە میتۆدێکی تایبەت بێت، لەو ڕوانگەیەی کە نزیکە توێژینەوەی زانستییە، توێژەری زانستی پەنا بۆ بەراوردکردن دەبات ئینجا ئەو میتۆدە هەرچییەك بێت کە پەیڕەوی دەکات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئامانجی زانست توێژینەوەکردنی جیاوازی لە دیاردەکانە، هەروەها دیاریکردنی ئەو دیاردانەی کە لەم جیاوازییە سەرهەڵدەدەن. ناکرێت ئەمە ئەنجام بدرێت تەنیا بە

٢١٤- ارمان کوفلیە، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٦.

بەراوردکردنی ئەو دیاردانە نەبێت، پرۆسەی بەراوردکردن لە هەموو پرۆسەیەکی دڵنیابوونەوە لە ڕاستی گریمانەکاندا بوونی هەیە. چۆن دەکرێت دڵنیابین لە ڕاستی گریمانەکان ئەگەر بەراوردی نەکەین بە واقیعی دیاردەی لێتوێژراو؟ هەروەك لە پێشودا باسکرا میتۆدی تایپ ئایدیال بەراردوکردن وەك پایەیەکی سەرەکی لە پایەکانی خۆی بەکاری دەهێنێت، بەشێوەیەك بەراورد دەکرێت لە نێوان واقیع لە لایەك و تایپ ئایدیال لە لایەکی دیکە بکرێت بۆ زانینی ڕووەکانی ڕێکەوتن و جیاوازی تیایاندا.

بەڵام هەموو ئەوانە ئەوە ڕەتناکەنەوە کە بەراوردکردن میتۆدێکی سەربەخۆ بێت، بەڵکو ڕۆجۆن مارش لە کتێبەکەی (کۆمەڵناسی بەراوردکاری) (١٩٦٧) پێیوایە دەبێت لە کۆمەڵناسی بەراوردکاری بڕوانین بەوپێیەی لقێکی سەربەخۆیە و مەیدانێکی تایبەتی خۆی هەیە[(٢١٥)].

میتۆدی بەراوردکاری یارمەتیی توێژەر دەدات خەسڵەتە گشتییەکانی دیاردە ئاشکرا بکرێت لە ڕابردوو و لە ئێستا و لە ئاییندەدا، ئەمەش لە ڕێگای دەرخستنی خەسڵەتە هاوبەش و جیاوازەکانی نێوان دوو دیاردە یان دوو کۆمەڵگا و زانینی پلەی پەرەسەندنی یان دواکەوتنی دیاردەکە لە مێژوودا.

**بوارەکانی پراکتیزەکردنی میتۆدی بەراوردکاری**

وەك لە پێشودا باسکرا توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان پەنا بۆ بەراوردکاری دەبەن ئینجا چ بە ڕێگای ڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بێت، بەشێوەیەك زۆرجار بەراوردکاری جێگای ئەزموونکردن دەگرێتەوە، بەڵام چەندین بواری دیکە هەیە زیاتر لە ئەوانیتر لەگەڵ پێداویستییەکانی میتۆدی بەراردوکاری دەگونجێت، گرنگترین بوارەکانیش ئەمانەن:

**١. توێژینەوەی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان لەڕەهەندە جیاوازەکانیدا**

---

٢١٥- محمد علي محمد، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٥٤.

ئەم بوارە بە گرنگترین بوارەکانی پراکتزەکردنی میتۆدی بەراوردکاری دادەنرێت، بەشێوەیەك توێژەر دوو سیستەمی کۆمەڵایەتی بەراورد دەکات (یان زیاتر) لەگەڵ یەکتر، بۆ ئاشنابوون بە ڕووەکانی جیاوازی و لێکچونی نێوانیان. ڕاستە هیچ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بوونی نییە کە بە تەواوی هاوشێوەی یەکێکی دیکە بێت، چونکە هەموو کۆمەڵگایەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام ئەو تایبەتمەندییانە ڕێگر نین لە بوونی چەندین توخمی هاوبەش کە سەرچاوەکانیان سروشتی مرۆییە و ملکەچی پەرەسەندن دەبن، هەروەها ڕێگر نییە لە ئاشنابون بەو یاسا و فاکتەرە هاوبەشانەی کە ڕێگای پێدەدات فاکتەرە ڕیزپەڕ، یان هاتوەکان کە لە هەر کۆمەڵگایەکدا تایبەتمەندی بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ببەخشێت، ئەمەش یارمەتی دەرە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانە و سنووردارکردنی ئەگەر نێگەتیڤ بێ، یان توێژینەوەکردن و تێگەیشتن و هەوڵی گشتاندنی ئەگەر پۆزەتیڤ بێت.

هەروەها ترێژینەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆجێین، وەك سیستەمی خزمایەتی، یان بیروباوەڕە ئایینی نەریتەکان، نموونەش لەسەر ئەو توێژینەوە بەراوردکارییانە ئەو توێژینەوانەیە کە زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجیا لەسەر کۆمەڵگا نەریتییەکان ئەنجامیانداوە، ئینجا چ لە میانەی بەراوردکردنیان بێت لەگەڵ یەکی دیکە یان بەراوردکرنیان بێت بە سیستەمەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ. توێژینەوەی دیکەیش لەم بارەیەوە هەیە ئیڤانز بریچارد لە بارەی سیستەمەکانی خزمایەتییەوە لە کۆمەڵگای بەرایی و کارەکانی فۆرتس

**٢. توێژینەوەی سیستەمە کۆمەڵایەتییە گشتگیرەکان**

ئەو جۆرە توێژینەوەیە ڕەنگە مۆرکێکی گشتی وەربگرێت لە بەراوردکردنی سەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان لەگەڵ یەکی دیکە، وەك

بەراوردکردنی کۆمەڵگای سۆسیالیستی لەگەڵ کۆمەڵگای سەرمایەداری، یان کۆمەڵگای دەسەلاتخوازی لەگەڵ کۆمەڵگایەکی دیموکراسی، یان ڕەنگە ڕەهەندێکی بەراوردکردنی کۆمەڵگاکان لەسەر شارستانییەتەکان وەربگرێت، وەك بەراوردکردنی کۆمەڵگا دەوارنشینەکان (البدویە) یان بەراییەکان لەگەڵ کۆمەڵگا شارستانیەکان (وەك لە نموونە ئیبن خەلدوندا دەیبین).

**٣. توێژینەوەی کولتوور و ڕەفتار**

ئەم جۆرە بایەخ بە توێژینەوەکردنی ڕووە لێکچوو و جیاوازەکانی شێوازە کولتوورییەکان لە کۆمەڵگا گۆڕاوەکان و ڕەنگدانەوەیان لەسەر ڕەفتاری تاکەکان دەدات، زانایان لە میانەی بەراوردکانی کولتوورەکان لەگەڵ یەکتر ئەوەیان بینی کە هەندێك کولتوور یارمەتیدەری سەرهەڵدانی کەسایەتی سەربەخۆ و سەرکردەییە لە نێو تاکەکانی کۆمەڵگادا، هەندێکی دیکەیان کەسایەتییەکی ملکەچی و خۆبەدەستدەر دروست دەکات، لەمبارەیەوە ڕالف لێنتۆن باس لەوە دەکات کە کولتوور پشکی شێری لە پێکهاتنی کەسایەتی بەردەکەوێت، تێگەیشتنیش لە کەسایەتی تەنیا بەسەر لایەنی سایکۆلۆجی کورتنابێتەوە، بەڵکو پێویستە بابەخ بە ژینگەی کولتووری بدەین وەك ڕەهەندێکی دیاریکەری کەسایەتی(٢١٦). نموونەش لەسەر توێژینەوە تازەکان لەمبارەیەوە ئەوانەن کە بایەخیان بە بەراوردکردنی کۆمەڵگا یابانی داوە بە کۆمەڵگاکانی دیکە، بەتایبەتی عەرەبی، هەروەها تیشکیان خستۆتە سەرە ئەوەی کە چۆن یابان توانییویەتی لە ماوەیەکی پێوانەییدا ببێتە شارستانیترین دەوڵەت لە جیهان کەچی کۆمەڵگای عەرەبی هەر لە شوێنی خۆی ماوەتەوە، وەلامەکەش ئەوەبوو کە کولتووری کۆمەڵگای یابانی وا لە

---

[216]- Ralph Lanton status and roles, sociology Marcello Tuzzi (ed) Randon House New York, 1971 p 92.

تاکەکانی خۆی دەکات کارەکەی خۆیان خۆش بوێت و رێز لە کات و سیستەم بگرن و بە پیرۆزی دابنێن.

٤. توێژینەوەکردنی رێکخستنەکان

وەك زانراوە ئەوانەی بایەخ بە رێکخستنەکان دەدەن ئامانجیان گەیشتنە بە خەسڵەتە گشتییەکان (سەرجەم رێکخستنەکان لە رووی جۆر و جیاوازی ئامانجەکانی) سەندیکا، پارتی سیاسی، کۆمەڵەکان، کۆمەڵەکانی فشار...هتد، هەروەها ئاشنابوون بە میکانیزم و بنەما چەسپاوەکانی بوونی کاری ئەو رێکخستنانەن کە جێگیر نابێت تەنیا بە توێژینەوەکردنی حاڵەتی یەك بار و گشتاندنی ئەنجامەکانی توێژینەوە بەسەر سەرجەم رێکخستنەکان نەبێت، بەڵکو باشتر وایە بەشێوەیەکی بەراوردکاری توێژینەوە بکرێن.

لێرەوەیە توێژینەوەی بەراوردکاری رێکخستنەکان بایەخ بە دانانی گریمانە و هەوڵی تاقیکردنەوەیان دەدات لە میانەی چەندی نموونەی رێکخستنی لێتوێژراو، بۆ نموونە گروپە فەندەمینتاڵیستەکان[٢١٧] ، زۆرجاریش ئەو گریمانانە لە بارەی ئەم سێ بوارەی خوارەوە دەخولێتەوە:

١. تاك، بەمانای رۆڵی کەسایەتییە سەرکردایەتییەکان لە ژیانی رێکخستن و یەکانگیرییەکەی، بەشێوەیەك زۆرینەی رێکخستنەکانی دەوڵەتانی جیهانی سێ جیادەبنەوە بە سەنتەربونیان لە دەوری یەك سەرکردە، یان رێکخستن، بەڵکو رەنگە هەندێکجار سیستەم لە نێو بچێت ئەوکاتەی سەرکردە دەمرێت یان واز لە پارتەکەی دەهێنێت.

٢. دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان تاکەکان، واتە شیکردنەوەی تۆڕەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێو سیستەم و خەسڵەتەکانی بونیادی گروپ.

---

[٢١٧]- عبالنعيم مسعد (جدلية الاتسبعاد و المشاركة، مقارنة بين جهاد الانقاد الاسلامية في الجزائر و الجماعة الاخوان المسليمن في الاردن)، مجلة المستقبل العربي، بيروت عدد ١٤٥، مارس ١٩٩١، لا ٥٤.

٣. بواری سێیەمیش بایەخ بە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی هەمان ڕێکخستن دەدات، لە ڕووی بەرنامە و ئامانجەکان یان دامەزراوە ناوەکییەکان و پەیوەندییان بە دەسەڵات و کۆمەڵگاوە.

## باسی سێیەم:
## هەندێك نموونەی پراکتیکردنی میتۆی بەراوردکاری

بۆ ئەوەی بتوانین لە میتۆدی بەراوردکاری تێبگەین ئەوا چەند پراکتیکردنێکی دەخەینەڕوو کە لە لایەن چەند توێژەرێکەوە ئەنجامدراوە.

**یەکەم: بەراوردکردنی ئەرستۆ لە نێوان سیستەمە سیاسییەکانی سەردەمی خۆیدا**

ڕەنگە کۆنترین بەراوردکاری لەم بوارەدا ئەنجام درابێت ئەوەی ئەرستۆیە (٣٨٤_٣٢٢)، بۆ گەیشتن بە باشترین سیستەمی سیاسی، ١٥٨ دەستوری توێژینەوە کردووەو بەیەکەوە بەراوردی کردون، لەم بەراوردکردنەدا بە دابەشکردنێکی شەش دانەیی گەیشتووە کە هەموو جۆرەکانی دەستوور یان سیستەمەکان لەخۆ دەگرێت، بەمەش سێ دەستووری باشی داناوە ئەوانیش: پاشایەتی، ئەرستۆکراسی و حکوومەتی دەستووری. لە بەرامبەریشیاندا سێ سیستەمی خراپ و گەندەڵی داناوە: حوکمی ستەمکار، حوکمی ئۆلیگارشی و حوکمی دیموکراسی ئاژەواگێڕ. بە بەراورکردنی نێوانیان گەیشتە باشترین حوکم، بە باشترین شێوە باسی لە کاری میتۆدی بەراوردکاری دەکات، ئەوکاتەی دەڵێت: یەکەمجار هەوڵبدەین توێژینەوەی هەموو جۆرەکانی هەڵسوکەوت بکەین تەنانەت لایەنی بەشەکییە تۆمارکراوەکانیش لە لایەن ئەوانی پێشوو و پاشان توێژینەوەی دەستوورەکانی کۆمەڵگا دەکەین، دوای ئەمە تێبینی ئەو توخمانەی کە شارستانییەت دەڕوخێنن، یان دەیپارێزین لە

پـاڵ توێژینـەوەکردنی سـەرجەم دەسـتورەکان، هـەروەها دەرخسـتنی ئـەو هۆکارانەی کە وا دەکات هەندێك حوکم بـە بـاش دابنرێـت و ئـەوی دیکـە بـە خراپ، بەمەش بە تواناتر دەبین لـە ناسـینی باشـترین دەسـتوور، هـەروەها دەمانـەوێت بـزانین چـۆن دەسـەڵات دابـەش دەبێـت؟ پایـە ئـەخلاقی و شەرعییەکانی چین؟[218]

**دووەم: بەراوردکردنی ئیبن خەلدون لە نێوان کۆمەڵگا دەوارنشین و کۆمەڵگا شارنشینەکاندا**

ئـیبن خەلـدون کۆمـەڵگای دەوارنشـینی بـە کۆمـەڵگای شارنشـینی بـەراورد کردووە لای عەرەبەکان، بەراوردەکەش ورد بوو کە ڕەنگدانەوەی تێگەیشتنی مەرجـەکانی میتـۆدی مێـژوویی بـەراوردکاری بـوو، لـە تێبینیکـردن بـە بەشداریکردن سەرچاوەی دەگرت کـە بـۆی ڕەخسـابوو بـەهۆی ئـەوەی کـە خـەڵکی ناوچـەکەیە و لەگـەڵ پرۆسـەکانی گۆڕانکـاری تیایـدا ژیـاوە، ئـیبن خەلدون بەراوردی هۆی لەسەر دوو ئاست ئەنجامدا:

١. لەوەی پەیوەستە بە سیسـتەمی حـوکمڕانی و پەیوەنـدی بـە دەمـارگیری هۆز هەیە، پێیوایە دەوڵەت لە چاخی دەوارنشـینی لەسـەر دەمـارگیری هـۆز دروستبووە، هەرچەندە ئەو دەرمارگیرییە بەهێز بێت ئـەوا دەوڵـەت بـەهێزتر دەبێت هەرچـەندە هۆزایـەتی بـەرەو پـێش بـڕوات بـۆ شارسـتانییەت هێنـدە دەمارگیرییەکەی بێ هێز دەبێت[219].

٢. تایبـەت بـە شـێوازی ژیـان، دەورانشـین و شارنشـین بـەراورد دەکـات، خەڵکانی بەدەوەی (لە ژیانیـادا پشـت بـە بەرهـەمی سروشـتی دەبەسـتن لـە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ، کاری ئەوان تـەنیا بەسـەر دەسـتەبەرکردنی

[218]- ابراهيم ابراش، تاريخ الفكر السياسي، الرباط، بابل للطباعة وز النشر، ١٩٩.

[219]- محمد عابد الجابري، العصبية معالم نظرية الخلدونية في التاريخ الاسلامي، البيضاء، ١٩٨٢.

بژێوی ژیان و جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێبون کورت دەبێتەوە، لەمە زیاتر بایەخ بە جوانکاری و شکستی زیاد لە پێویست نادەن، خانوەکانی خۆیان لە خۆڵ و دار و بەرد چاکنەکراو دروست دەکەن تەنیا بۆ ژیان نەك هیچ شتێکی دیکە).

دوای ئەوەی ئیبن خەلدون وەسفی ژیانی دەورانیشتی دەکات ئەوا دەست دەکات بە وەسفکردنی ژیانی شارنشینی، کە تیایدا کۆمەڵگا زیاتر ئاڵۆز دەبێت، دەڵێت (دواتر ژیانی ئەو خەڵکە دەوارنشیانە فراوانتر بوو، زیاتریان لە پێداوێستی خۆیان بە دەستکەوت، ئەمەش وای لێکردن جێگر بن و ماڵی بن، خواردن و جلوبەرگیان زیاد بوو و خانوەکانیان گەورە بوو و پلانی شار هاتەکایەوە)[٢٢٠].

## سێیەم: بەراوردکاری سپنسەر لە نێوان کۆمەڵگای سەربازی و کۆمەڵگای پیشەسازی[٢٢١]

سپنسەر بەراوردێکی کرد لە نێوان کۆمەڵگای پیشەسازی و کۆمەڵگای سەربازی، ئەو خەسڵەتانەی دیاری کرد کە لە یەکتریان جیادەکاتەوە:

---

٢٢٠ - ابن خلدون، مقدمة، بيروت ١٩٨٧، لا ٢٠.

٢٢١- معن خليل عمر، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠١

سەرچاوە رەسەنەکەش ئەمەیە:

Smelser Neil J. Alexide foqyeville, comparative methods in sociology (ed) van vallier university of Califonia Berketer 1971.

| | خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای سەربازی | خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای پیشەسازی |
|---|---|---|
| ١ | کۆمەڵگایەکی هێرشبەر و بەرگریکارە لە یەك کاتدا و بایەخ بە بەرهەمهێنانی ئەو کاڵایانە نادات کە سوودی گشتی بۆ کۆمەڵگا هەیە | کۆمەڵگایەکی ئاشتیخوازە و بایەخ بە بەرمهێنانی ئەو کاڵایانە دەدات کە سوودیان بۆ کۆمەڵگا هەیە. |
| ٢ | هاوکاریکردنی نێوان تاکەکان ناچارییە | هاوکاریکردنی تاکەکانیان ئیختیاری و لۆژیکییە بەگوێرەی گرێبەستێکی فەرمی و نووسراو |
| ٣ | سەرجەم رێکخستنەکانی بۆ هەموو کۆمەڵگایە نەك تایبەت بێت بە یەك توێژی دیاریکراو | زۆرینەی رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بە توێژە بەرهەمهێنانەکان |
| ٤ | بوونی تاك لە کۆمەڵگادا لە خزمەت دەوڵەتە لەگەڵ بوونی سنوور بۆ خاوەندارێتی تاکی | دەوڵەت لە خزمەت تاکدایە و ئازادی تاکی هەیە لەگەڵ هەندێك کۆت لەسەر ئازادی تاکی |
| ٥ | بەرێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەت سەنتەرییە | بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەت ناسەنتەرییە |
| ٦ | بونیادی پلەبەندی کۆمەڵایەتی تیایدا تۆکمەیە و پێگەکانیش بە بۆماوە دەمێنێتەوە | بونیادی کۆمەڵایەتی تیایدا نەرمە و پێگە کۆمەڵایەتییەکان بە بۆماوە نامێنێتەوە |
| ٧ | خاوەنی سەربەخۆیی ئابووری و | نەبوونی سەربەخۆیی ئابووری و |

| | | |
|---|---|---|
| | توانستی خودییە | پشت بەستن لە چالاکییە ئابوورییەکان بە یەکتر |
| ٨ | بەها و خەسڵەتە کەسییەکان ڕێکخراوە و تاکەکان وەلا و دڵسۆزیان بۆ دەسەڵات هەیە | کەسایەتی تاک سەربەخۆیە و تاک تیایدا بەرگریکارە یان لە دژی ناچاری دەسەڵاتە |

**چوارەم: ئەو بەراوردەی کە ئالمۆن و ڤێربا ئەنجامیاندا لە بارەی پەیوەندی کولتوور بە دیموکراسی**

لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨ و ١٩٦٣ هەردووکیان بەراودێکیان ئەنجامدا لە بارەی شێوازەکانی کولتووری باو لە لە چوار دەوڵەتدا ئەوانیش ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و مەکسیک، ئامانجی ئەو توێژینەوەیەش ئاشنابوون بوو بە ڕۆڵی کولتوور لە پەرەسەندنی دیموکراسی، ئەو توێژینەوەیان لە دەوری چوار ئاستی کولتووری دەخولێتەوە ئەوانیش: کولتوور (هاووڵاتییان)، کولتووری ملکەچی، کولتووری بەشداریکردن، ئەنجامی توێژینەوەکە ئەوەیە کە کولتووری بەشداریکردن لە ئەمریکا و بەریتانیا باوە، بەڵام دوو وڵاتەکەی دیکە کولتووری ملکەچی و کولتووری پاشکۆیی تێدا زاڵە(٢٢٢).

**پێنجەم: ئەو بەراوردەی کە هاشم شەرابی ئەنجامیدا لە نێوان کۆمەڵگای مۆدێرن و کۆمەڵگای باوکسالاری.**

---

-[222] G. Almond and Nerba, The civic culture political attitudes and democracy in five nations princetion 1963

ئەو بەراوردکردنەی ئەنجامدا بە گوێرەی چەند وتەیەك[٢٢٣].

| | وتە | مۆدێرنە | باوکسالاری |
|---|---|---|---|
| ١ | مەعریفە | هزر/عەقڵ | ئەفسانە/بیروباوەڕ |
| ٢ | هەقیقەت | پرۆسە/ڕەخنە | ئایینی/میتافۆری |
| ٣ | زمان | شیکارگەرایی | بەیانی |
| ٤ | دەسەڵات | دیموکراسیزم و سۆسیالیزم | دەسەڵاتی باوکسالاری تازە |
| ٥ | پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان | ئاسۆیی | ستوونی |
| ٦ | توێژە کۆمەڵایەتییەکان | چین | خێزان/خێڵ / تیرە |

**شەشەم: ئەو توێژینەوە ڕەخنەییەی کە نەسر محەمەد عارف ئەنجامیدا لە نێوان تیۆرەکانی گەشەپێدانی سیاسی هاوچەرخ و ئەلتەرناتیڤی ئیسلامی[٢٢٤].**

[٢٢٣]- هشام شرابي، النظام الابوي و اشكالية تخلف المجتمع العربي، بيروت مركردز دراسات الوحدة العربية، ١٩٩٢، لا ٣٦.

[٢٢٤]- نصر حمد عارف، نظريات التنيمية السياسية المعاصرة، دراسة نقدية مقارنة في ضوء المنظور الحضاري الاسلامي، الدرا العالمية و المعهد العالمي للفكر الاسلامي، الرياض، ١٩٩٤.

تیۆرەکانی گەشەپێدانی سیاسەتی هاوچەرخی باسکرد و شیکردەوە، بنەما ڕۆژئاواییەکەی دەرخست لە پاڵ ئەو قەیرانەی کە لە دەوڵەتانی جیهانی سێدا هەیە، هەروەها ئەلتەرناتیڤە ئیسلامییەکەی خستەڕوو کە پشت بە چەمکی خەلافەت و ئاوەدانی مرۆیی وەك بنەما و دەسپێك دەبەستێت.

## حەوتەم: بەراوردکردنی نێوان دامەزاوە داراییە نێودەوڵەتییەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە تایبەتەکان

| | ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان/ بوارەکانی بەراوردکردن | دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانی دارایی(سندوقی دراو، بانکی جیهانی) | ڕێکخراوە تایبەتەکان (نموونەی یونیسکۆ و ڕێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵ و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و ڕێکخراوی کار) |
|---|---|---|---|
| ١ | ئامانج لە چالاکی وەك بەدەردەکەوێت لە ومارەسە و بەرهەم دیارە. | ئاوێزانکردنی دەوڵەتانی جیهانی سێ بە سەرمایەداری نێودەوڵەتی، خزمەتکردنی زیاتر بە ئامانجی گەورە پشکداران و قەرز وەرگرەکان، پاراستنی دۆخی هەنوکەیی لە دابەشکردنی دەسەلات و سامان لە جیهان و خودی دامەزراوەکان | هاوکاری نێودەوڵەتی لەگەڵ ڕەچاوکردنی تاقیکردنەوەی سەرجەم لایەنەکان، هەوڵدان بۆ باشترکردنی دۆخی جیهانی سێیەم بە تایبەتی پێداویستییە سەرەکییەکانی گەلەکان. گۆڕانی ناشتییانەی دۆخی هەنوکەیی و ئەنجامدانی چاکسازی پلەبەپلە لە ئاراستەی تێرکردنی پێداویستییە سەرەکییەکان |
| ٢ | ڕێبازی پەیڕەوکراو | ئایدیۆلۆجیای لیبراڵی (لەگەڵ پراکتیزەکردنی بە گوێرەی دەوڵەت و ملکەچنەکردن بۆ پێداویستییەکان لە لایەن بەهێزترین لایەن لە | ڕەزامەندی لە هەڵبژاردنی تێکەڵ لە تێکەڵکاری لیبراڵی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | دامەزراوەكاندا) | |
| ٣ | چـــــــۆنییەتی بڕیاردان | كێشەی یەكلاییكەرەوەی گەورە پشـكداری دەنگـدان، كـەمترین ئەندام زۆرینـەی دەنگیـان هەیـە بە هۆی قەبارەی بەشدارییان. | بڕیارەكـە ئـەنجامی بەشداریكردن و رەچـاوكردنی ڕوانگــەی جیـاوازی لایەنــەكان و لــە كـاتی پێویسـتی دەنگدان و زۆرینەی ئەندامەكان كە زۆرینەی دەنگیان هەیە |
| ٤ | بابــەتیبون لــە چالاكی و بڕیار | فاكتـــــەرە سیاســـــی و ئایدیۆلۆجییــەكان كــە لەگــەڵ پرەنســـیپ و ئامانجـــەكان و پەیماننامــە و پێداویسـتییەكانی گەشـەپێدان و مافــەكانی مــرۆڤ دەگونجێت | فاكتەری سیاسی و ئایدیۆلۆجی كە هاوسـەنگیان هەیـە زۆرجـار لەگـەڵ پرەنســـیپەكان و ئامانجـــدان و پێداویســـتییەكانی گەشـــەپێدان و مافەكانی مرۆڤ دەگونجێت |
| ٥ | توانا داراییـەكان و دۆخی دارایـی (لـە شێوەی یارمەتی) نموونــــــــە، پەروەردەكردن | زۆر گرنگـە، جێگــای ئارامییــە، دەســتەبەركردنی قــازانج لــە قەرزە مەرجدارەكان. | سنووردارە بە ڕوانین لە كارەكان بێتوانایی بەردەوام دیارییەكان، بەخشش، بەشداریكردن لە پرۆژەكان، پێكهێنـانی شـارەزایی خــۆجێی و ملكەچــكردنی بــۆ پێداویســتییەكانی پــەروەردەكردن ڕێگـاگرتن لـە جیـاوازی و گشـتاندنی پـــەروەردەكردن و یارمەتیـــدانی لاوازترین توێژ. |
| ٦ | تەندروستی | ملكەچــــــكردنی بـــــۆ پێداویســتییەكانی تەقەشــوف، ئەنجامــدانی چاكســازی لـــەم بارەیـــەوە، هانـدانی خوێنـدنی تایبـــەت، لەگـــەڵ بەهێنـــد وەرگرتنـی نـاوەڕۆكی هانـدانی بایەخدان بە بازاڕ | ڕێزگرتنـــــی زۆری هەڵبژاردنــــە شارستانییەكان ئیعتیبـــــاراتی چـــــاودێریكردنی تەندروستی بۆ هەمووان |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | کێڵان و خۆراک | ئەنجامدانی تەقەشوف، هاندانی کەرتی تایبەت، ملکەچکردنی تەندروستی بۆ توانای کڕین. | بایەخدان بە چاودێری تەندروستی سەرەتایی، چەمکی دەرمانە سەرەکییەکان، بایەخدانی بە زیان لێکەوترین توێژەکان هاندانی تێرکردنی خود لە خۆراک و کشتوکاڵی ژیان و هاندانی دەستوەردان بۆ پاڵپشتیکردنی توانای گەیشتن بە خۆراک و هۆشداری لە کاتی پاشکۆیی خۆراکدا. |
| ٨ | کار و بارودۆخی کار | ئاوێزانکردنی جوتیاری نیشتیمانی بە بازاڕی نێودەوڵەتی: هاندانی کشتوکاڵی هەناردەکردن، گرنگی توانای کڕین بۆ بە دەستهێنانی خۆراک، هەقیقەتی نرخەکان و ڕۆڵە گەورەکەی لە پارمەتیدانی خۆراک، پاشکۆیی تەکنۆلۆجی و بازرگانی و دارایی لە بواری جوتیاری | هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی پاشکۆیی تەکنۆلۆجی و بازرگانی و دارایی |
| ٩ | بەرهەم | زیادبونی بێکاری بەهۆی پاشکۆیی و خراپی دابەشکردنی سامانەکان، دانانی کار لە نێو تێچووی بەرهەمهێنان کە دەبێت فشاری بخرێتە سەر وەک توخمێکی کێبڕکێ. | بانگهێشتکردن بۆ پەرەپێدان و بەکارهێنانی گەورەترین کارامەیی خۆجێی، بانگهێشتکردنی بەشداریکردنی توخمی مرۆیی، بانگهێشتکردن بۆ ڕەچاوکردنی بارودۆخی کار و ڕێساکانی مافی مرۆڤ لە کاردا |
| | | بەرهەمهێنان و دووبارە | کەمکردنەوەی ڕادەی زۆری |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | بەرهەمهێنانـــەوەی بـــەرفراونی قــۆرخکردن و دوورخســتنەوە و توندوتیژی | قـــۆرخکردن و دوورخســـــتنەوە و توندوتیژی |

سەرەڕای ئەو لایەنە پۆزەتیڤانـەی کـە ئـەم میتـۆدە بەدەستیهێناوە، بـەڵام لایەنی نێگەتیڤی گشی هەیە گرنگترینیشیان: ئەوەیە کـە بەشـێوەیەکی ڕوون هۆکاری بوونی دیاردە نیشان نادات یـان هۆکـاری سـەرهەڵدانی؟ لەگـەڵ ئـەو کارتێکەرە نێگەتیف یان پۆزەتیڤانەی کە بۆتـە هـۆی سـەرهەڵدانی؟ لـە پـاڵ ئەمەش ئەم میتۆدە دواهاتەکانی بەراوردکردنی ڕوون نەکردۆتەوە؟ واتە دوای ئەوەی ڕووە لێکچوو و جیاوازەکانیمـان زانـی، دواهـات و شـوێنەرەکانی ئـەو خەسڵەتانە چین کە میتۆدی بەراوردکاری ئاشکرای کردوون؟ هەروەها پێمـان ناڵێت کاریگەرییەکانی چییە لەسەر تەواوی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە؟ زیاتریش لەمە، ئـەو بەراوردکردنـەی کـە لـە ڕێگـای ئـەم میتـۆدە ڕوو دەدات پەیوەندی بە دەرەوەی دیاردە هەیـە نـەك نـاوەوەی، بۆیـە بـەراوردکردنێکی قـوڵ نییـە و تـەنیا بەسـەر دەرخسـتنی ڕووە لێکچـوو و جیاوازەکـانی نێـوان دیاردەکان کورت دەبێتەوە، ڕەنگە جیاوازی شاراوە لە پشت ئەو لێکچوون و جیاوازییانە هەبێت و لەبەرچاو نەبێت، ئەمەش وادەکات توێژینەوەی، توێـژەر تەنیا گشتاندنێك ڕووکەش بێت. دەبێت ئاماژە بـۆ ئـەوە بـدەین کـە خـاڵێکی جەوهەری هەیە و ئەو میتۆدە فەرامۆشی کردووە، ئەویش ئەمەیە کە ناکرێـت توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجام بـدەین بـە دابـڕاوی لـەو ژینگـە کۆمەڵایەتییـەی کـە تێیـدا سـەریهەڵداوە، ئەمـە دابـڕاو نییـە لـە پەیوەندییـە

کۆمەڵایـەتی و شارسـتانییەکان، فەرامۆشـکردنی ئـەم خاڵـەش لەلایـەن لایەنگیرانی میتۆدی بەراوردکاری ئەنجامدراوە.

لە کۆتاییشدا گۆڕانی ڕیشەیی سەرەکی ڕوودەدات لە ماوەی زەمەنی نێوان بەراوردی یەکەم و دووەم (لەکاتی بەراوردکردنی دوو دیاردەی دیاریکراو لە دوو ماوەی زەمەنی جیاوازیان)، ئەمەش کاریگەری لەسەر ڕاستی و دروستی ئەنجامەکانی بەراوردکردن و جێگیربوونیان هەیە.

## بەشی حەوتەم

# شیکردنەوەی ناوەڕۆک

## باسی یەکەم: پێناسەکردن و تایبەتمەندییەکانی

### ١. پێناسەکردنی شیکردنەوەی ناوەڕۆک

سەرەڕای ئەوەی کە گرنگی شیکردنەوەی ناوەڕۆک وەك میتۆد و ئامرازێکی توێژینەوە سەرەتا لە ڕاگەیاندن بەدەرکەوت، بەڵام دواتر توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان بایەخیان پێدا و دەرکیان بە گرنگییەکەی کرد لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێگەیەی کە پرۆسەکانی کۆمینیکاسیۆن هەیەتی لە نێو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و لەو کاتەش کە وشە و دەنگ و وێنە بوون بە ڕەگەزە کاریگەرەکان لەسەر ڕەفتاری خەڵك و ئاراستەیان، هەروەها کاریگەرییشی زۆربوو لەسەر بیروباوەڕ و هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکانییاندا.

دەبێت لە نێوان شیکردنەوەی ناوەڕۆکی هەڕەمەکی و لەخۆوە و شیکردنەوەی ناوەڕۆك وەك میتۆدێکی زانستی جیاوازی بکەین کە میکانیزم و ڕێسای خۆی هەیە، لەسەر دیاریکردنی گرفت و دانانی گریمانە و هەوڵی تاقیکردنەوەیان دروستبووە، عەقڵی مرۆڤ بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و

لەخۆوە چەندین پرۆسەی زیهنی ئەنجام دەدات و لەمیانەیەوە هەموو ئەو شتانەی کە دەیانبینێت و دەیانخوێنێتەوە و دەیان بیستێت شیدەکاتەوە، مرۆڤ وەرگری گوتارە[٢٢٥]. مرۆڤ بە شێوەیەکی لەخۆوە گوتار شیدەکاتەوە ،بەگوێرەی توانای عەقڵی و ئاستی زانستی، بەمەش چەندین خوێندنەوە و شیکردنەوەی تایبەت بە دەق دەبەخشێت، لێرەوە هەندێك پێیانوایە دەق مانایەکی هەیە لای دروستکەری گوتار و مانایەکی دیکەی هەیە لای ئەو کەسەی کە وەریدەگرێت و زۆربەی جاریش بەگوێرەی ئارەزووی خۆی ناوەڕۆکی گوتارەکە شیدەکاتەوە، بەمپێیەش خوێندنەوە دەبێتە داهێنانی دەقێك لەسەر دەقێکی دیکە.

بەڵام میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆك وەك میتۆدێکی زانستی شیکردنەوە یان تێگەیشتنێکی هەرەمەکی نییە بۆ گوتار، هەروەك شیکردنەوەی ناوەڕۆکی گوتار نییە بۆ دڵنیاکردنەوەی بیرۆکەیەکی لە پێشینە لە بارەی گوتار، هەروەك ئەمە حاڵی خوێندنەوەکانی دەقی ئایینە، وەك لای زانایانی موسڵمانان و ئەوروپا ناسراوبوو، ئەوکاتە لە ئەوروپا هەندێك ناوڕۆکی دەقی ئینجیلیان لە سوێد لە ساڵی (١٦٤٠) شیکردەوە، شیکردنەوەی ناوەڕۆك وەك میتۆدێك تەنیا لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم و لە بواری ڕاگەیاندن

---

٢٢٥- وشەی گوتار وەك لەم بەشە و بەشەکانی تر دێت، وەرگێڕاوی وشەی (Discourse)ە، ئەو وشەیەش چەندین مانای هەیە، بە تایبەتی لای بونیادگەراکان کە کایە دەلالەیەکەی بەفراوان دەبێت، لەڕووی مانای فەرهەنگییەوە ئەم وشە واتە: (هەر قسەیەك کە لە یەك ڕستە زیاتری بێت ئینجا چ نوسراو یان شێوازی تر بێت،)، بەو مانایەی کە ڕەنگە گوتار ئامرازی نەنوسراوی هەبێت، گوتار قسە نیە، چونکە گوتار سیستەمێکە لە وتە کە ڕێسا و تایبەتمەندی خۆ هەیە کە شێوازی نوسین و شێوەی ڕستە و وێنە میتافۆرییەکانی دیاری دەکات، لەپاڵ دەستەواژە بەکارهاتووەکان، لەگەل جۆری ئەو ئیشکالیەت و بابەتە سەرەکیانەی کە دەگوترێت یان ناگوترێت.

سەریهەڵدا، بەشێوەیەك توێژەرەکانی ئەو بوارە و بە دیاریکراویش (پڕوپاگەندە) هەستیان بە گرنگی شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی ماددەی ڕاگەیاندن کرد بۆ ئاشنابوون بە مەودای سەرکەوتوویی و دەستەبەرکردنی ئاماجی ڕۆشنبیرکردنی تایبەت پێی، هەندێکیان جەختیان لەسەر گرنگی ئەمە کرد لە میانەی هەردوو جەنگەکانی جیهان، دواتریش لە چوارچێوەی جەنگی سارد لە نێوان هەردوو ئۆردوگان.

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا هاوپەیمانەکان بەهۆی چاودێریکردنی ڕادیۆ ئەوروپییەکان و بەتایبەتی گۆرانییە میللییەکان و مۆسیقاکان هەوڵی زانینی ئاستی ئامادەباشی و خۆسازدانیاندا ،دوواتر بەروادیان کرد لەگەڵ ئەو ڕادیۆنانەی کە لە بەشە داگیرکراوەکانی دیکە هەیە، دوای جەنگ توێژەرەکان شیکردنەوەی ناوەڕۆکیان بەکارهێنا بۆ توێژینەوەکردنی پڕوپاگەندە لە ڕۆژنامە و ڕادیۆکان، گرنگی ئەم میتۆدەش لە ساڵی ١٩٥٢ بەدەرکەوت ئەوکاتەی بێرنارد بێرلسۆن کتێبە بە ناوبانگەکەی لە بارەی شیکردنەوەی ناوەڕۆك بڵاوکردەوە(٢٢٦).

لەم کاتەوە ئەو میتۆدە بە چڕی لە توێژینەوەکانی بواری ڕاگەیاندن بەکاردەهێنرێت و لە وێشدا بۆ توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان گوازرایەوە(٢٢٧).

[226]- berleson, Bernard content analysis in commincation research Clenol III The free press P 1952.

[٢٢٧]- روجر ویمر و جوزیف دویمینك، مناهج البحث الاعلامي، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٠٤.

چەندین پێناسە بۆ میتۆدی شیكردنەوەی ناوەڕۆك كراوە، بەپێی جیاوازی سەردەم و پەرەسەندنی ئامرازەكان پێناسەكانیش جیاوازبوون، هەروەها لە بەكارهێنانی خودی ئەو ئامرازانە لە توێژینەوەكردنی گرفتە تازە و ماددە جیاوازەكاندا .

كابلان بەوە پێناسەی كردوە كە مانای ئاماری قسە و گوتارە سیاسییەكانە، هەرچی بێرلسۆنە (١٩٥٢) پێناسەی كرد بەوەی كە (شێوازێكی توێژینەوە و وەسفكردنێكی بابەتییانەی سیستماتیكی و چەندایەتییە بۆ ناوەڕۆكی دیاری نامەكە)، هەرچی ئیستۆنە پێناسەی كرد بەوەی كە (شێوازێكە بۆ گەیشتن بە دەرەنجامەكان، ئەمەش لە ڕێگای ئاشنابوونی بابەتییانە و سیستماتیكیانە بە خەسڵەتە دیاریكراوەكانی نامەكان). هەرچی بێزلییە (١٩٦٩) شیكردنەوەی ناوەڕۆكی پێناسەكردووە بەوەی كە (یەكێكە لە شێوازەكانی ئامادەكردنی زانیاری بەشێوەیەك ناوەڕۆكی پەیوەندی دەبێت بە داتاوە، كە دەكرێت پوختی بكەین و بەراوردیان بكەین، ئەمەش لە ڕێگای پراكتیزەكردنی بابەتی و سیستماتیكیانەی ڕێساكانی پۆلێنكردنی توێژەكان)(٢٢٨).

والیزەر وینەر (١٩٧٨)(٢٢٩) پێناسەی دەكات بەوەی كە (ئەنجامدانێكی ڕێكوپێكە و بۆ پشكینكی ناوەڕۆكەكانی زانیاری تۆماركراو) بەكاردەهێنرێت،

---

٢٢٨- احمد بدر، الاتصال بالجماهير، بين الاعلام و الدعاية و التنمية، الكويت، ١٩٨٢، لا ٣٣.

229- W;aizer, M. H. and Wiener P. I. Research and (ed) New York, Harpar and Row, 1978.

هەرچی کێرلنگدەرە، پێناسەی دەکات بەوەی (میتۆی توێژینەوەکردن و شیکردنەوەی پەیوەندییە بەشێوەیەکی رێکوپێك و بابەتی و چەندێتی بە ئامانجی پێوانەکردنی گۆڕاوەکان)(٢٣٠).

لە کتێبی (شیکردنەوەی ناوەڕۆکدا) سەمیر محەمەد حسێن، پێیوایە شیکردنەوەی ناوەڕۆك یەکێکە لە ئامرازە بەکارهاتووەکان لە توێژینەوەی ڕاگەیاندن و هەندێك ئەمەیان وەك میتۆدێکی سەربەخۆ بەکارهێنا، هەرچی خودی توێژەرە (سەمیر محەمەد حسێن) باسی لێوەکردووە بەوپێیەی شێواز و ئامرازێکی توێژینەوەییە کە بە تەواوکاری بەکاردەهێنرێت لەگەڵ ئامرازەکانی دیکە لە چوارچێوەی میتۆدی ڕووپێودا، بەمشێوەیە پێناسەی کردووە:

"شیکردنەوەی ناوەڕۆك شێوازێك یان ئامرازێکی توێژینەوەی زانستییە، دەکرێت توێژەرەکان بەکاریبهێنن لە بوارە جۆراوجۆرەکانی توێژینەوەدا، بە تایبەتی لە بواری زانستی ڕاگەیاندن بۆ وەسفکردنی ناوەڕۆکی دیار و دووتوێی ماددەی ڕاگەیاندنی لێتوێژراو، لە ڕووی شێوە و ناوەڕۆك، بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی توێژینەوە کە لەسەر شێوەی پرسیار و گریمانەی سەرەکی توێژینەوە دارێژراوە بە گوێرەی ئەو پۆلێنانەی کە توێژەر دیاری کردوون، ئەمەش بە ئامانجی ئەوەی کە دواتر ئەو زانیارییانە یان لە وەسفکردنی ئەو ماددانەی ڕاگەیاندن یان لە ئاشکراکردنی باکگراوندی هزری

230- Kerlinger. F. foundations of behavioral Research and (ed) New Yorkm Holt, Rinehar and Winston, 1973.

و کولتووری و سیاسی بەکاربهێنێت کە نامەی ڕاگەیاندن لێ دروستکراوە، یاخود بە ئامانجی ئاشنابوون بە مەبەستی ئەو کەسانەی کە کاری کۆمینیکاسیۆن ئەنجام دەدەن، لەمیانەی وشە و ڕستە و ڕەمز و وێنە و تەواوی شێوازەکانی گوزارشتکردن لە ڕووی شێوە و ناوەڕۆك، بەلاّم بەو مەرجەی کە پرۆسەی شیکردنەوەکە بەشێوەیەکی سیستماتیك ئەنجام بدرێت، بەگوێرەی بنەما میتۆدۆلۆجی بابەتییبوون، دەبێت توێژەر پشت بە شێوازی چەندێتی ببەستێت بەشێوەیەکی سەرەکی"[٢٣١].

زۆری پێناسەکان وامان لێ دەکات لە بارەی میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆك بڵێین کە پێناسەیەکی جێگیر نییە بۆ میتۆدەکە هێندەی چەند پرەنسیپێکی گشتی هەن و دەچنە ژێر ناونیشانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك، ئێمە لەگەڵ ئەو قسەیە کۆکین کە لۆرانس باردین دەڵێت: شیکردنەوەی ناوەڕۆك ئامرازێکی نەرمە و لەژێر دەستی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بە گوێرەی سروشتی توێژینەوە و ئامانجەکانی بەکاری بهێنێت و بیگونجێنێت، بۆیە سروشتییە جۆراوجۆر بێت بەوپێیەی گوتاری لێتوێژراو جۆراوجۆرە، ئەمە وەك خاڵێکی هاوبەشە، یان پرەنسیپێکی گشتییە و بەشداری دەکات لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ناڕوون و شاراوەیە لە گوتار بەپشت بەستن بە تەکنیکەکانی شیکردنەوەی ورد و میتۆدۆلۆجی، لەسەرو هەمووشیان هەڵهێنجاندن وەك شێوازێکی بەڵگاندن[٢٣٢].

---

[٢٣١]- سمير محمد حسين، تحليل المضمون (تعريفاته و مفاهيمه و محدداته و استخداماته الاساسية و وحداته و فئاته)، وانبه المنهجية و تطبيقاته الاعلامية، ارتباطه ببحوث الاعلام و الدعاية و الرأي العام، القاهرة، عالم الكتب، ١٩٨٣.

[٢٣٢]- احمد اوزي، تحليل المضمون و منهجية البحث، مطبع النجاح الجديدة، ط١ ١٩٩٣، لا ١٣.

ڕەنگە لازوێل[٢٣٣] سەرکەوتووتر بێت لە ئەوانی دیکە ئەوکاتەی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی پوخت کردووە و گوتی: وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەیە: کێ گوتی و بۆ گوتی؟ بۆ کێ دەیڵێ؟ چۆن دەڵێت؟ شوێنەوارەکانی ئەمە چییە؟

کەواتە شیکردنەوەی ناوەڕۆک شێوازێکە و یارمەتی توێژەری کۆمەڵایەتی دەدات تێبینی ڕەفتاری تاکەکان بکات بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ، لە میانەی شیکردنەوەی ئەو شتانەی کە دەینوسن، یان دەیڵێن، هەروەها زانای کۆمەڵناسی لە کاتی پەنابردنی بۆ شێوازی شیکردنەوەی ناوەڕۆک گریمانەی ئەوە دەکات کە شێوازی کۆمینیکاسیۆن کاریگەری لەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتی هەیە و دەکەوێتە ژێر کاریگەریشی. بۆ نموونە یارمەتی دەدات توێژینەوەی ئاسەواری توندوتیژی لە بەرنامەکانی تیڤی بکات لەسەر ڕەفتاری منداڵان، یان کاریگەری چاپکراوە ئاینییەکان یان وتارە ئاینییەکان یان ئەو تۆمارکراوانەی کە هەڵگری گوتارێکی ئاینییە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا، یان توێژێك لێیان. هەروەها یارمەتی توێژەر دەدات ئاشنابێت بە هەڵوێستی پارتێك لە پارتە سیاسییەکان لەسەر پرسێك لە میانەی شیکردنەوەی بۆ ئەو ڕۆژنامەیەی ئەو پارتە دەری دەکات...هتد.

## ٢. تایبەتمەندییەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك

233- Lasswell Harold, D and Letes, Nathan (eds) language of Politics New York George w. stewart.

خەسڵەتەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك بەوشێوەیە کە (سەمیر محەممەد حسێن) کردوویەتی بریتین لە:

١. شێوازێکە پشت بە دووبارەبوونەوەی هاتنی وشەکان، یان ڕستە، یان ماناکانی نێو لیستەکانی شیکردنەوەی ماددەی ڕاگەیاندن دەبەستێت.
٢. لایەنە بابەتی و شێوەییەکان شیدەکرێتەوە.
٣. پەیوەستبوونی پرۆسەی شیکرنەوە بە گرفتی توێژینەوە و گریمانە و پرسیارەکانی توێژینەوەکەوە.
٤. پشت بەستن بە شێوازی چەندێتی بە مەبەستی شیکردنەوەی چۆنایەتی لەسەر بنەمای بابەتیبوون.

هەرچی بێرلسۆنە، شەش خەسڵەتی داناوە کە شیکردنەوەی ناوەڕۆك جیا دەکاتەوە و دەڵێت:

١. . تەنیا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بە کاردەهێنرێت.
٢. لە بنەمادا بۆ دیاریکردنی کاریگەرییەکانی کۆمینکاسیۆن بە کاردەهێنرێت.
٣. تەنیا بەسەر لایەنەکانی ڕێزمان بەکاردەهێنرێت.
٤. دەبێت بابەتی بێت.
٥. دەبێت سیستماتیك بێت.
٦. دەبێت چەندی بێت.

لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەدەین، ئەوکاتەی بێرلسۆن پێناسەی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی کرد بەوەی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی دیارە ئەوا مانای شیکردنەوەی ماناکانە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ و سادە، واتە خوێندنەوەی مانا ڕوونەکانی نێو دێڕەکەیە، بێ قوڵبونەوە لە مانا شاراوەکانی دێڕەکە، لەگەڵ ئەوەشدا بەتاڵ نییە لە ڕیسککردن، چونکە ڕەنگە وشە زیاتر لە مانایەکی هەبێت، هەروەك هەر وشەیەك یان زانیارییەك بە تەنیا گوزارشت نییە لە شتێك، مانایەکی دیکەی دەبێت ئەگەر خرایە نێو کۆنتێکستی گشتی دەقەکە، واتە لە میانەی پەیوەندی بە زانیارییەکان، یان داتاکانی دیکە، لە قۆناغی یەکەمی پراکتیزەکردنی شیکردنەوەی ناوەڕۆك واتە لە قۆناغی بە ڕەمزکردن، لەسەر توێژەر پێویستە پابەند بێت بەمانای دیاری ناوەڕۆکەکە، هەرچی لە قۆناغی دووەمە واتە لە قۆناغی ڕاڤەکردن، ئەوا یارمەتی دەدات لە توێژینەوەی مانا شاراوەکان و دووتوێی دێڕەکان.

بەومانایەی شیکردنەوەی ناوەڕۆك دەبێت چەندی و چۆنی بێت لە یەك کاتدا. لە بابەتێکی پێشوی ئەو کتێبە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە زمانی ماتماتیك ئەگەر بە وردی جیادەکرێتەوە، بە زانستییەکەی ڕەنگە پوچ بێت ئەگەر ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی لەگەڵدا بێت بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکان، ئەوەی شیکردنەوەی چۆنییەتی پێویست دەکات ئەوەیە کە گوتار (هەروەك لە پێشودا پێناسەمان کرد) ڕەنگە هەڵگری ڕەمز و دەلالەت و شێوازی گوزارشتکردن بێت کە نەکرێت بیکەین بە ژمارە یان زمانی ئامار، ئەمە ڕەنگە گرنگی زیاتر لە گوتار بەدەربکەوێت وەك لە گرنگی نووسراو، بۆیە پێویستە

توێـژەر شـیکردنەوەی چـەندێتی و چـۆنییەتی بـەکاربهێنێت، شـیکردنەوەی چەندێتی بۆ ئەوانەیە کـە ڕوون و ڕاسـتەوخۆ و شـیکردنەوەی چۆنییەتی بـۆ ئەوەیە کە ڕوون و ڕاستەخۆیە لە پاڵ ئەو مانایانـەی لـە دووتـوێی دێڕەکانـدا هەیە و بە ڕاستەوخۆ نەگوتراوە.

لە پاڵ هەردوو جۆری شـیکردنەوەی نـاوەڕۆك (چـەندێتی و چـۆنێتی)، چـوار جۆر یان پۆلێنی دیکە هەن، ئەوانیش:

١. شیکردنەوەی ئاشکراکاری و هەوالگری و شیکردنەوەی ئاڕاستەکراو.
٢. شیکردنەوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ.
٣. شیکردنەوەی گۆڕاوەکان و شیکردنەوەی هەڵسەنگاندن.
٤. شیکردنەوەی چەمکئامێزی دوولایەنە.

## باسی دووەم
## بەکارهێنان و یەکە و توێژەکانی

### ١) بەکارهێنانەکانی

میتـۆدی شـیکردنەوەی نـاوەڕۆك دەسـتەبەرداری میتـۆد و ئـامرازە بـاو وناسراوەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی نابێت، بـەڵکو پـەنای بـۆ دەبـات لـەو حاڵاتانـەی کـە پراکتیزەکردنـی شـێوازی دیکـە لـە توێژینـەوە دژوار دەبێـت، دەسـتکەوتی میتـۆدە نەریتییـەکانی دیکـە بـەکاردەهێنرێت، یـان هـەروەك

لاسوێل و لانەر دەڵێن لەسەری پێویستە لەو شوێنە دەست پێ بکات کە میتۆدە نەریتیەکانی دیکە کۆتاییان پێهێناوە.

ئێستا ئەمە ڕوندەکەینەوە کەی پەنا بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆك دەبەین، دواتره ئەو بوارانەی کە لە توێژینەوەکانی بواری ڕاگەیاندن و بواری کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنرێت، (ئەحمەد بەدر) باس لەوە دەکات کە لەم حاڵاتانەی خوارەوە پەنا بۆ ئەم میتۆدە دەبەین[٢٣٤]:

١. کاتێك پەنا بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆك دەبەین، کە ئەو داتایانەی توێژەر کۆی دەکاتەوە، تەنیا بەسەر بەڵگەی دۆکیۆمێنتی کورت ببێتەوە، چونکە لە حاڵەتە ئاساییەکاندا باشتر وایە توێژەر ڕاستەخۆ پەیوەندی بە سەرچاوە و کەسە پەیوەندیدارەکان بە بابەتی توێژینەوە بکات، زانیاری لێیان بە دەست بکەوێت بەهۆی شێواز و ئامرازە دیارو ناسراوەکانی توێژینەوە (تێبینیکردن، چاوپێکەوتن، پرسیارنامە)، بەڵام ئەگەر نەکرا ئەو ئامرازانە بەکاربهێنرێت، بەهۆی دژواری تێبینیکردن دیار یان دژواری چاوپێکەوتنی لێتوێژراوەکان، یان پەیوەندیکردن پێیان، پێویستە (لە دوورەوە) توێژینەوەی ئەوانە بکرێت، واتە لە ڕێگای ئەو گوزارشتانەی کە لەوەوە دەرچووە (گوتارەکان، ڕۆژنامە، ڕادیۆکان....هتد).

لە لایەکی دیکەوە دەکرێت شیکردنەوەی ناوەڕۆك بەکاربهێنرێت تەنانەت لە حاڵەتی بەکارهێنانی چاوپێکەوتن، یان پرسیارنامە. شیکردنەوەی ناوەڕۆك

---

[٢٣٤]- احمد بدر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

بەکاردەهێنرێت بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کراوانەی کە توێژەر لە لێتوێژراوەکانی دەکات.

٢. ئەوکاتە پەنا بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆك دەبردێت، کە ناسینی زمانی لێتوێژراو کارێکی یەکلاییکەوەرە بێت سەبارەت بە توێژینەوەکە.
٣. ئەوکاتە پەنا بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆك دەبەین کە قەبارەی ماددە پشکنراوەکان گەورەترە بێت لە توانای توێژەر لە توێژینەوەکردنی، بۆیە توێژەر پەنا بۆ پراکتیزەکردنی شێوازی نموونە یان نموونەی هەڵبژاردن دەبات، لە توێژینەوەکردنی ئەم ئامرازانەی ڕاگەیاندن.

هەرچی بێرلسۆنە، مەبەستەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی لەم سێ خاڵەدا کورتکردۆتەوە:

١. بۆ دیاریکردنی خەسڵەتەکانی ناوەڕۆك
٢. بۆ دیاریکردنی ئەو ڕێکارانەی کە پەیڕەو کراوە لە نمایشکردنی ماددەی گەیاندن یان ئامانجی پیشکەشکارانی.
٣. مەبەستگەلێك پەیوەستن بە جەماوەر و ئاسەوارەکانی گەیاندنەوە.

بەڵام گرنگترین بوارەکانی بەکارهێنانی ئەم میتۆدە ئەوانەن:

**١) وەسفکردنی ناوەڕۆکی کۆمینیکاسیۆن**

بەو مانایەی کە توێژینەوەی شیکاری خەسڵەتەکانی ماددەی لێتوێژراو پۆلێن دەکات، یان وەسفدەکات بۆ دیاریکردنی ئەوەی کە چی تێدایە، نموونەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە (ئادەم و فێریێ ١٩٧٧) ئەنجامیاندا، ئینتیما وەزیفی و حیزبییەکانی میوانەکانی بەرنامەی چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی لە ڕۆژی یەکشەمە، توێژینەوەکرد[٢٣٥].

## ١. تاقیکردنەوەی گریمانەی خەسڵەتەکانی گوتار

واتە دانانی چەند گریمانەیەك کە ئامانجی ئاشکراکردنی پەیوەندی نێوان خەسڵەتەکانی سەرچاوەی گوتار و خەسڵەتەکانی گوتارە، یان ئەو نامانەی کە ئەو سەرچاوەیە دەینێرێت، ئەمەش بە مەبەستی ناسینی ئەوەی کە ئایا سەرچاوەی گوتار کاریگەری هەیە لەسەر ناوەڕۆکی گوتار.

## ٢. بەراوردکردنی ناوەڕۆکی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن یان گوتاری سیاسی بە جیهانی دەرەوە

بەو مانایە کە شیکردنەوەی ناوەڕۆك لەم حاڵەتەدا هەوڵدەدات ڕاستی گوتار بزانێت، هەروەها ئایا گوتار گوزارشتە لە واقیع یان تەنیا گوتارێکی پڕوپاگەندە ئامێز و دیماگۆجییە و پەیوەندی بە واقیعەوە نییە؟ باشترین نموونەش دەکرێت پەیوەندی نێوان گوتاری دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤە بە واقیعی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤە لە چەندین دەوڵەتی جیهان، یاخود

[٢٣٥]- روجر ويمر و جوزيف دومينيك، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠٦.

بەراوردکردنی گوتاری ناسیۆنالیزمی عەرەبی و ئازادکردنی فەلەستینە لە واقیعی کردەیی لە ئاراستەی یەکێتی عەرەبی و ئازادکردنی فەلەستین.

### ٣. هەڵسەنگاندنی وێنەی گروپەکان لە کۆمەڵگادا

توێژەر دەتوانێت شیکردنەوەی ناوەڕۆك بۆ ئاشنابوون بە ڕوانگەی کۆمەڵگا بەکاربهێنێت، بۆ یەکێك لە توێژە کۆمەڵایەتییەکان، وەك ئافرەت، یان دەستەبژێری سیاسی، ئەمەش لە میانەی شیکردنەوەی ئەو نووسراوە لە بارەی ئەو توێژە نووسراون، ئینجا چ لە ڕووی ڕێژەی ئامادەییان لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و گوتار بە شێوەیەکی گشتی بێت، یاخود لە میانەی ئەو زمان و شێوازی گوتار بێت (پاڵپشتیکردن، هاوسۆزی، بێزراوی، ڕەتکردنەوە) کە پێی نووسیووە.

### ٤. هەڵسەنگاندنی وێنەی هەر کۆمەڵگایەك لای کۆمەڵگاکانی تر

چەندین توێژەری عەرەب و موسڵمان ئاشنابوون بە ڕوانگەی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی بۆ عەرەب، یان موسڵمان، لە میانەی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکانی قوتابخانە یان فیلمە سینەماییەکانەوە، یان ئامرازەکانی ڕاگەیاندنەوە، بەشێوەیەك بە ئەنجامێك گەیشتن کە وێنەی عەرەبی و موسڵمانان لە گوتاری ڕۆژئاوا هاومانای جیاواز و تیرۆریستە، یاخود ئەو کەسەیە کە بەدوای چێژدا دەگەڕێت[٢٣٦]، لەم نێوکۆیەدا ئەو توێژینەوەیە

---

[٢٣٦]- صورة العرب في المدارس الامريكية، مجلة المستقبل العربي، بيروت، العدد ٢٦، يوليو ١٩٨١، ل ٢٤.

هەیە کە (ئەیاد قەزان) ئەنجامیداوە، کە مامۆستای کۆمەڵناسییە لە زانکۆی کالیفۆرنیا، لە بارەی وێنەی عەرەب لە بابەتەکانی خوێندن لە ئەمریکا، هەروەها توێژینەوەی (عەفیف بۆنی) لە بارەی وێنەی عەرەبەوە لە عەقڵی رۆژئاوایی لە میانەی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەو کتێبانەی لە بارەی عەرەبەوە نوسراون، لە چوار ئینسکلۆپیدیا کۆی کردنەوە ئەوانیش بەریتانیا و یەهودییەکان و سۆڤیات و فەڕەنسییەکان بوون ، بەشێوەیەك لە سەرەتادا ئەو چوار ئینسکلۆپیدیای بەراورد کرد و دواتر ناوەڕۆکی پەیوەست بە عەرەبی شیکردەوە، بەوە گەیشت کە وێنەی عەرەب زۆر نێگەتیڤە(٢٣٧).

## ٥. ئاشنابوون بە هەڵوێستی نووسەرێکی دیاریکراو یان پارتێك لە بارەی پرسێك لە پرسەکان

ئەو پرسانەی ڕەهەندێکی جیهانی یان نیشتیمانیان هەیە، بۆ نموونە دەتوانین هەڵوێستی سەرکردەیەکی سیاسی بزانین لە میانەی شیکردنەوەی گوتارەکەی، ئەمەش لە لایەن نیڤین نەسرەوە ئەنجامدراوە(٢٣٨) ئەوکاتەی گوتاری (جەمال عەبدولناسر)ی شیکردەوە بۆ ئاشنابوون بە پەردسەندنی هزری نەتەوەیی. یان ئەوەی (سەید یاسین) ئەنجامیداوە لە کاتی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی هزری نەتەوەیی عەرەبی هەر لە پێش جەنگی یەکەمی جیهان تاوەکو کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەی، یان شیکردنەوەی

---

٢٣٧- عفيف البوني، (صورة العرب في العقل الغربي، من خلال الموسوعات العليمة العربية)، مجلة المستقبل العربي، بيروت، العدد ١٠١، يوليو ١٩٨٧، لا ١٦.

٢٣٨- السيد ياسين تحلي مضمون الفكر القومي العربي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيوت ١٩٨٠.

گوتاری سەرکردەی عەرەبی لە ماوەیەکی دیاریکراو بۆ ئاشنابوون بە پەرەسەندنی هەڵوێستی لە پرسی ململانێی عەرەبی_یەهودی. بۆ نموونە شیکردنەوەی ناوەڕۆکی گوتاری سەرۆکی فەلەستینی (یاسر عەرەفات) لە ماوەی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم و بەراوردکردنی بە گوتارەکانی پێش کۆنفرانسی مەدرید، یاخود ئەوەی کە توێژەرێکی عەرەبی لە زانکۆیەکی ئوردنی ئەنجامیدا لە شیکردەوەی ناوەڕۆکی ئەدەبیاتی ئەدیبی فەڵەستنیی (سەمیەر عەزام) بۆ ئاشنابوون بە پێگەی فەڵەستین لە ئەدەبەکەیدا[٢٣٩] یان ئەوەی کە (مەهدی مەنجەرە) ئەنجامیدا بۆ شیکردنەوەی هەردوو وتەی عەرەفات و ئیسحاق رابینی لە کاتی واژوکردنی پەیماننامەی ئاشتی لە واشنتۆن، ئەو توێژەرە جەختی لەسەر ئەو تەوەرانە کردەوە کە یاسر عەرەفات باسی کرد و بەراوردی کرد بەو تەوەرانەی کە (رابین) جەختی لەسەر کرد.

هەروەها دەکرێت ئاشنا بین بە هەڵوێستی پارتێك لە بارەی پرسێکی دیاریکراو بە شیکردنەوەی ستوونی سەرۆکەکە لە ڕۆژنامە فەرمییەکەی یان گوتارەکانی ئەمینداری گشتی.

### ٢) هەنگاوەکانی میتۆدی شیکردنەوەی ناوەڕۆك و یەکەکانی

### یەکەم: هەنگاوەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك

٢٣٩- فخري طميلة، فلسطين في ادب سميرة عزام، مجلة المستقبل العربي، بيروت عدد ٩٨، ابريل، ١٩٧٨، ٦٧.

ئەو کەسەی کە شیکردنەوەی ناوەڕۆك بەکاربهێنێت، دەبێت پابەند بێت بە چەند هەنگاوێکی ئیجرائی و پەیڕەویان بکات، ئێستا دەیانژمێرین و گرنگترینیشیان ڕووندەکەینەوە:

١. داڕشتنی گرفت و گریمانەی توێژینەوەکە.
٢. دیاریکردنی کۆمەڵگای نموونە: ڕۆژنامە، کتێب، بەرنامەکانی ڕادیۆ و گۆرانییە میللییەکان...هتد.
٣. هەڵبژاردنی نموونە، ئەگەر ڕۆژنامە بێت، دیاری دەکەین، کە چ ڕۆژنامەیەکە، یان ئەو ماوەیە دیاری دەکەین کە ڕۆماڵی ئەو ڕۆژنامەیە دەکات، یان ئەگەر بەرنامەی ڕادیۆیە، ئەوا جۆری بەرنامە و سەعاتەکانی پەخشکردن دیاری دەکرێت.
٤. هەڵبژاردنی یەکەی شیکردنەوە، ئەمەش گرنگترین توخمی میتۆدە و دوای کەمێکی تر باسی دەکەین.
٥. ئامادەکردنی پۆلێنەکانی شیکردنەوە.

پۆلێنەکان یان توێژەکان یەکەی مەزن یان ئەو بەهایانەن کە نموونە لەسەر بنەمایەوە هەڵدەبژێرێت، تیایدا مەودای دووبارەبوونەوەی یەکەکانی شیکردنەوە دەستنیشان دەکرێت، مەرجە ئەو توێژانە بە دوورخستنەوەی ئاڵوگۆڕ و کشتگیری و جێگیری جیاببنەوە، ئەگەر توێژەر چارەسەری کێشەکانی ڕەگەزپەرستی بکات لە ئەورووپا، دەکرێت گوتاری لێتوێژراو بۆ توێژەکان دابەش بکات، موسڵمانەکان، عەرەب، ڕەشپێستەکان،

یەهودییەکان، ڕەنگاورەنگەکان...هتد. لەم حاڵەتەدا موسڵمانەکان دەکەونە زیاتر لە حاڵەتێك، دەکرێت بخرێنە خانەی ڕەنگاورەنگەکان، لەسەر توێژەر پێویستە خۆی لەمە دووربخاتەوە و کارەکەی خۆی نەشڵەژێنێت، هەرچی گشتگیرییە، مەبەست لێی: توێژەکانی شیکردنەوەیە و هەموو یەکەکانی شیکردنەوە لەخۆ دەگرێت؟ هەرچی جێگیرییە مەبەست لێی: ڕێکەوتنی ڕەمزکراوەکانە لەسەر ئەوەی کە هەموو یەکەکانی شیکردنەوە دەخرێنە شوێنی گونجان لە نێو توێژەکاندا.

٦. دامەزراندنی سیستەمی پێوانەکردنی چەندایەتی —ژماردن.

ئەمەش بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆکی چەندایەتی پێویستە، چونکە بایەخ دەدات بە ژمارەی دووبارەبوونەوەی یەکەکانی شیکردنەوە و هەر چوار ئاستی پێوانەکردن: پێوانەکردن بە گوێرەی ناو، پێوانەکردن بەگوێرەی ڕێکخستن، پێوانەی قۆناغەکان و پێوانەکردنی ڕێژە.

٧. چڕکردنەوەی ناوەڕۆك

مەبەست لێی دانانی یەکەی شیکردنەوەیە لە دەستەیەك لە دەستەکانی بە ڕەمزکردن، ئەوەی ئەم پرۆسەیە ئەنجامی دەدات پیی دەوترێت بە ڕەمزکردن، هەندێکجاریش کۆمپیوتەر بۆ ئاسانکردنی پرۆسەکە بەکاردەهێنرێت.

٨. شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی داتاکان

دوای پرۆسەی بە ڕەمزکردن و دانانی خشتە و ئامار، توێژەر ئەو ئامارانە شیدەکاتەوە و ڕاڤەیان دەکات لەسەر بنەمای ئەو گریمانانەی کە لە سەرەتای توێژینەوەکەیدا دایناوە

دووەم: یەکە وتوێژەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك

أ. یەکەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك

ئەم یەکەیە بچوکترین بەشە یان بچوکترین کەرتی ناوەڕۆکی لێتوێژراوە و پێی دەوترێت یەکەکانی بە هێماکردن و پرۆسەکەش پێی دەوترێت کۆد بۆ دانان. چەندین یەکەی بە ڕەمزکردنیش هەیە وەك وشە، یان بابەتێکی گشتی یان برگەیەك، یان ڕووبەرێك، یان زەمانێك یان کەسایەتییەکان، ئەو وشانە بە ئاسانترین یەکەی بە هێماکردن دادەنرێن کە دەکرێت کاریان پێ بکرێت.

١. یەکەی وشە

بچووکترین یەکەیە کە لە شیکردنەوەی ناوەڕۆك بەکاردەهێنرێت، ئەو یەکەیە وشە و پێکهاتەکانی لەخۆ دەگرێت، وەك ڕستە، لە کاتی بەکارهێنانی وشە وەك یەکەیەك لە شیکردنەوەی ناوەڕۆك، ئەوا توێژەر هەوڵدەدات لیستگەلێکی دەست بکەوێت کە دووبارەبووەکان و هاتنی وشەکان یان چەند توێژێکی تێدا بێت لە بابەتی شیکردنەوە. بۆ نموونە زانینی ئاراستەی ئاشتەوایی و ناتوندوتیژی دەوڵەتەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە میانەی شیکردنەوەی گوتاری سەرۆکەکانی، زانینی ڕادەی دووبارەبوونەوەی

وشەی ئاشتی و هاوماناکانی لەم گوتارانەدا، لە بەرامبەر وشەی جەنگ و هاوماناکانی.

### ٣. یەکەی بابەت

بابەت (بەشێوەیەکی کورت) بریتییە لە چەند ڕستەیەکی سادە، بکەر و تەواوکار، یان بە مانایەکی دیکە، بابەت گوزارشتە لە بیرۆکەیەك کە لە بارەی ڕسکێکی دیاریکراو دەخولێتەوە، بابەتیش وەك یەکەی شیکردنەوەی لە پرسە سیاسی و ناسیاسییەکان بە کاردەهێنرێت، بۆ نموونە (نەخوێندەواری لە ئەفریقیا بەربلاوە)، یاخود (عەرەب لە قۆناغی شکستدا دەژین). بابەت وەك یەکەیەکی شیکردنەوە بە گرنگترین یەکەی شیکردنەوە دادەنرێت و ڕێگا بە ئاراستەکان نادات تیایدا بەدەربکەون.

### ٤. یەکەی کەسایەتی

بە شێوەیەك کەسایەتی خەیاڵی، یان مێژوویی وەك یەکەیەك لە شیکردنەوەی چیرۆك، یان دراما و وەرگێڕان و ژیاننامەکان بەکاردەهێنرێن.

### ٥. یەکەی دەستەواژە

مەبەست لێی: ئەو یەکە سروشتییەیە کە بەرهەمهێنەری بابەتی کۆمینیکاسیۆن بە کاری دەهێنێت، ئەم دەستەواژەش دەکرێت کتێبێك یان وتارێك یان بەرنامەیەك، یان بێژەرێك یان گوتاربێژێك..هتد بێت، شیکەرەوە

ئەوە شیدەکاتەوە کە ئایا ئەم دەستەواژەیە (پاڵپشتیکەرە، بێلایەنە، بەرهەڵستکارە)، ئەوکاتەی توێژەر بابەتێك توێژینەوە دەکات، یەکەی دەستەواژە بە کاردەهێنرێت کە ماددەکان بە ژمارە زۆر و گەورە بن، جیاوازییەکانی نێوانیان کەم و بێ دەلالەت بێت.

## ٦. یەکەی ڕووبەر و زەمەن

بریتییە لە دابەشکردنی ناوەڕۆك بەگوێرەی لایەنی ماددی کە لەگەڵ سروشتەکەی بگونجێت، ئەگەر ماددەکە نووسراو بێت بۆ دێڕ، یان ستوون، یان لاپەڕە دابەش دەکرێت، بەڵام ئەگەر بابەتەکە بیستراو بوو، بۆ چرکە و خولەك دابەش دەکرێت، بۆ نموونە: توێژینەوەیەك لە بارەی ڕۆڵی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە هۆشیارکردنەوە مەترسییەکانی جگەرەکێشان. لە ماددەی نووسراودا (بۆ نموونە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان)، ئەو دێڕ و ستوونانە دیاری دەکەین کە بۆ دەرخستنی مەترسییەکانی جگەرەکێشان تەرخانکراوە، لەگەڵ ئەوانەی بۆ دەرخستنی بەرژەوەندی جگەرەکانی تەرخانکراوە، بۆ نموونە لە ڕادیۆ و تیڤیدا، بە ژمارەی چرکەکان یان خولە تایبەتکراوەکان بۆ وریاکردنەوە لە مەترسییەکانی جگەرەکیشان تەرخان دەکەین لە پاڵ ژمارەی چرکە و خولەکان بۆ دەرخستنی خراپ ڕوانین بۆ جگەرەکێشان.

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە توێژەر دەتوانێت زیاتر لە یەکەیەك بە کاربهێنێت، دەکرێت یەکەی وشە، یان یەکەی ڕووبەر، یان یەکەی کات

بەیەکەوە و لە یەك کاتدا بەکاربهێنێت، ئەمەش پەیوەستە بە سروشتی گرفت و ناوەڕۆکی بابەتی لێتوێژراو.

**ب. توێژەکانی شیکردنەوەی ناوەڕۆك**

بۆ ئەوەی شیکردنەوی ناوەڕۆك ببێتە میتۆدی و ئامرازێکی بە کەڵك بۆ توێژینەوە، لەسەر توێژەر پێویستە بە شێوەیەکی ڕوون توێژەکانی شیکردنەوەی دابڕێژێت، لەم بوارەشدا پێویستە هەر لە سەرەتاوە جیاوازی بکەین لە نێوان ماددە و شێوەدا. سەبارەت بە ماددە بۆ نموونە ئەو پرسیارانە دەکرێت چۆن نووسراوە، یان گوتراوە؟ سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك جار تێکەڵاوی لەمەدا دروست دەبێت لە نێوان چی گوترا و چۆن گوترا، بەڵام زۆر بە سودە جیاوازی بکەین لە نێوانیاندا.

**١. توێژی (چی گوتراوە):**

لە ژێر ئەم پرسیارە ئەو توێژانە بوونیان هەیە

**١) توێژی بابەتی پەیوەندی**

ئەمەش گشتیترین توێژە، باس لەو بابەتە دەکات کە ماددەی کۆمینیکاسیۆن لە دەوری دەخولێتەوە؟ هەڵوێستی چییە لە گرفتی توێژینەوەکە، پاڵپشتیکارە، یان نێگەتیف یان پۆزەتیڤە؟

بۆ نموونە هەڵوێست لە فرە حیزبی لەگەڵدایە یان لە دژە.

**٢) توێژی بەها یان ئامانجەکان**

تیایدا توێژەر هەوڵ دەدات ئەو بەها و ئامانجانە بزانێت کە کەسەکە باوەڕی پێیەتی.

**٣) توێژی ئامرازە پەیڕەوکراوەکان**

ئەو شێوازانەی کە پەیڕەوکراوە بۆ دەستەبەرکردنی ئەنجام و ئامانجەکان، ئەگەر توێژی بەها هەوڵی زانینی ئامانج بدات، ئەوا توێژی ئامرازە پەیڕەوکراوەکان هەوڵ دەدات شێوازی دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجانە بزانێت.

**٤) توێژی خەسڵەت یان توانستەکان**

ئەو توێژە خەسڵەتەکانی کەسایەتی تاکەکان لە خۆدەگرێت، وەك تەمەن، ڕەگەز، پیشە، هەندێك خەسڵەتی سایکۆلۆجی و خەسڵەتەکانی تایبەتەکانی کۆمەڵگا و سیستەمەکان دەگرێتەوە وەك ئاستی کۆمەڵایەتی و ئایینی.

**٥) توێژی ژێدەر، یان سەرچاوە**

واتە ناسینی ئەو کەسایەتی یان گروپەی کە گوزارشتەکان بە کاردەهێنێت، گرنگی ئەو توێژەش لە شیکردنەوەی ئەو بابەتانە بەدەردەکەوێت کە گفتوگۆی لە بارەیەوە دەکرێت، بۆ نموونە لە کاروبارە ئایدیۆلۆجیاکاندا. بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەی مەودای بابەتیبونی بەرهەمی ماددەی کۆمینیکاسیۆن ئاشکرا دەکرێت، هەروەها لە بارەی سروشتی ئەو ژێدەرەی کە بۆی دەگەڕێنەوە.

**٦) توێژی بکەر**

بۆ دیاریکردنی کەسەکان، یان ئەو گروپانە پراکتیزە دەکرێت کە لە ناوەڕوکدا ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لە جێبەجێکردنی کارە سەرەکییەکانی بابەتەکە.

**٧) توێژی ئەو شوێنەی کە ماددەی پەیوەندیی لێ دەردەچێت**

ئەگەر گۆڤار یان ڕۆژنامە یان کتێب بێت، گرنگە شوێنی دەرچوونی بزانرێت.

**٨) توێژی جەماوەری مەبەستدار یان قسەبۆکراوان**

ئەو کاتە بە کاردەهێنرێت کە هەوڵی ناسینی گروپ و خەسڵەتەکانی دەدرێت، لە پاڵ جیاوازی لە نێوان ئەوەی بەرەو گروپێك ئاڕاستە دەکرێت لەگەڵ ئەوەی بۆ گروپێکی تر ئاڕاستە دەکرێت.

**٢. توێژی تایبەت بە شێوە (چۆن ئەوەی گوتوویانە، گوتراوە)؟**

مەبەست لەمە: ئەو شێوە یان قاڵبەیە کە ماددەی کۆمینیکاسیۆن تێدا بەتاڵ کراوەتەوە، ئەو توێژانەش بریتین لە:

**١) توێژی شێوەیی یان شێوازی ماددەی کۆمینیکاسیۆن**

بۆ نموونە لە ڕادیۆدا جیاوازی دەکرێت لە نێوان ماددەی هەواڵی و شانۆگەری و گۆرانی و قسە و بەرنامە ئایینەکان و ڕاگەیاندنەکان...هتد.

**٢) توێژی شێوەی گوزارشتەکان**

واتە: ڕێسا زمانەوانییە پەیرەوکراوەکان لە نامە و پێکهاتە بونیادییەکانی، ئەمەش بۆ ڕستەی ڕاستەقینە دابەش دەبێت، ئەو ڕستانەی گوزارشتن لە بەباشتر زانین و ڕستەی ساتیر.

**٣) توێژی توندی لە گوزارشت:**

لەسەر مەودای پێوانەکردنی ئەو هەڵچوونە دەوەستێت کە ناوەڕۆکی تێدا بەدەردەکەوێت، هیچ پێوەرێکی جێگر نییە کە پشتی پێ ببەسترێت بۆ زانینی توندی گوزارشت یان پلەی هەڵچوونی.

بۆ نموونە: نامەی سەرۆکی ئەمریکی جۆرج بۆشی باوك بۆ سەرۆکی پێشوی عێراق سەددام حوسێن لەسەروبەندی قەیرانی کەنداو، تاریق عەزیز کە

بەرپرسێکی عێراقی بوو ئەوکات، ڕەتی کردەوە وەری بگرێت لەو ڕوانگەیەی کە بە شێوازێکی توند نووسراوە، نابێت بەو شێوازە قسە لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەت بکرێت.

**٤) توێژی زمانی بەکارهێنراو**

پەتی یان عامییە، مەودای گونجانی زمان لەگەڵ ئاستی ئەو جەماوەرەی قسەیان بۆ دەکرێت.

**٥) توێژی ڕووبەر یان زەمەنی تەرخانکراو بۆ بابەتی شیکراوە**

**٦) توێژی پێگەی ماددە لە نێو بابەتی شیکردنەوەدا**

بۆ نموونە: لە تیڤیدا، ئایا لە سەرەتای پەخشە یان لە کۆتاییدایە؟ لە ڕۆژنامەشدا، ئایا لە لاپەڕەی یەکەم یان لە لاپەڕەکانی ناوەوەدایە؟

**٧) توێژی دووبارەکردنەوەی ناوەڕۆک**

ئایا ناوەڕۆک لە هەمان ئامرازی پەیوەندییە یان زیاتر لە ئامرازێکە؟ بە هەمان شێوەیە یان بە شێوەی جیاوازە؟

**٨) سەرنجڕاکێشان**

ئایا ماددەکە بە ڕەنگ یان بێ ڕەنگ بڵاودەکرێتەوە؟ ئایا وێنەی لەگەڵدایە؟ ئایا بە خشتە و ئامار پاڵپشتی کراوە یان نەخێر؟

پوختەی قسە، دەڵێین شیکردنەوەی ناوەڕۆک وەک میتۆدێک یان ئامرازێکی توێژینەوە دەکرێت سەرکەوتوو یان ناسەرکەوتوو بێت، ئەمەش بۆ سروشتی کێشەی توێژینەوە و ئەو گریمانانە دەگەڕێتەوە کە توێژەر دایاندەنێت. لەسەر توێژەر پێویستە پێیوانەبێت کە هەر هێندە بڕاری کرد و ئاماری ئەنجامدا لە ڕێگای شیکردنەوە ناوەڕۆک، بە ئامانجی خۆی گەیشتووە، ڕەنگە ئەو کارەی بگاتە ئەنجامی ورد، بەڵام هیچ مانایەکی نەبێت، یاخود تەنیا ئەنجامگەلێکن بەهایەکی پوچییان هەیە.

# دەروازە سێیەم

## نەخشەسازیکردنی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی

## رێکارەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی

بەشی یەکەم: توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، مەرج و نەخشەسایکردنی

بەشی دووەم: دیاریکردنی بابەت و گرفتی توێژینەوەکە

بەشی سێیەم: دیاریکردنی چەمك و دانانی گریمانەی زانستی

بەشی چوارەم: نموونەکان، یاخود نموونە دەستنیشانکردن

بەشی پێنجەم: ئامرازەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی _مەیدانی

بەشی شەشەم: نووسینی راپۆرتی توێژینەوەکە

# دەستپێك

لە پێشودا ئەوەمان ڕوونکردەوە کە میتۆد ئەو ڕێگایەیە کە توێژەر دەیگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، پابەندبوون بە میتۆدی زانستیش وادەکات هەر لە سەرەتاوە توێژەر ئەو هەنگاوە گەورانە دیاری بکات کە پەیڕەوی دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، ئەم هەنگاوانەش پێیان دەگوترێت (پلانی توێژینەوە یان نەخشەسازی توێژینەوە).

ئەو دەروازەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو هەنگاوانە تەرخان دەکەین، ئێمە دەروازەیەکی سەربەخۆمان تەرخانکردووە بۆ میتۆدەکان، بۆیە لێرەدا دوبارە باس لە دیاریکردنی میتۆدی توێژینەوە ناکەینەوە، کە بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت لە دیزایینکردن. بەمشێوەیە لەم دەروازەیەدا باسی بابەتەکان دەکرێت، لە بەشی یەکەمدا: پێناسەی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، هەروەك باس لە مانای دیزایینکردنی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دەکەین، لە بەشی دووەم: کێشەی توێژینەوە، لە بەشی سێیەمیشدا: دیاریکردنی چەمکەکان و دانانی گریمانە زانستییەکان، لە بەشی چوارەمیشدا: دیاریکردنی نموونەی توێژینەوە، لە بەشی پێنجەم: دیاریکردنی ئامرازەکانی توێژینەوەی زانستی. لە دوابەشیشدا: نووسینی ڕاپۆرتی توێژینەوە.

شایانی باسە ئەو هەنگاوانە لە سەرجەم توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەسوودە، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت و زیاتر بۆ توێژینەوە مەیدانی و پراکتیکییەکان دەگونجێت.

## بەشی یەکەم

# توێژینەوەی کۆمەڵایەتی
# مەرج و نەخشەسازیکردنی
## باسی یەکەم
## توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی

مەعریفەی زانستی بەوە وەسفدەکرێت کە مەعریفەیەکی ڕێکخراو و وردە، ڕێکخستن و وردییەکەشی لە ئەنجامی ئەوەیە کە مەعریفەیەکە پشت بە شێوازی توێژینەوەی زانستی دەبەستێت، بەڵام بۆ ئەوەی توێژینەوەیەکیش بە زانستی ناوزەد بکرێت دەبێت چەند مەرجێکی تێدا بێت[٢٤٠].

### ١. پێناسەکردنی توێژینەوەی زانستی (Scientific Research)

دەستەواژەی (توێژینەوە) چەندین پێناسەی بۆ کراوە و زۆربەشیان لە دەوری ئەوە دەخولێنەوە کە بە ئامرازێك دادەنرێت بۆ زانین و گەڕانی

[٢٤٠]- یەکێکە لە گرنگترین سەرچاوەکان لەبارەی ڕێکارەکانی توێژینەوەی زانستی بەتایبەتی بۆ قوتابیە تازەکان بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەن بۆی بگەڕێنەوە: (ثريا عبد الفتاح ملحس، منهج البحوث العليمة للطلاب الجامعيين،بيروت، منشورات دار الكتاب اللبانيى، ١٩٩٧).
_ احمد شلبي، كيف تكتب بحثا، او رسالة، القاهرة، ط ١، ١٩٨١.

ڕێکخراو و ورد کە توێژەر ئەنجامی دەدات بە مەبەستی ئاشکراکردنی زانیاری و پەیوەندی تازە، یاخود پەرەپێدان و ڕاستکردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە بوونیان هەیە، ئەمەش بە پشت بەستن بە هەنگاوەکانی میتۆدی زانستی.

بەگەڕانەوە بۆ مانای زمانەوانی وشەی (توێژینەوە)، بەوشێوەیەی لە فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیاکاندا هاتون، دەبینین کە توێژینەوەی شتێك واتە داواکردنییەتی، یاخود پشکنینییەتی، توێژینەوە پرسیار و گەڕانە، ئەم مانایە جێر و ناجێگیرە، چەندین مانا لەخۆ دەگرێت کە بە یەکەوە نەبەستراون، ئەگەرچی ئاسانە دیاریکردنی وشەی توێژینەوە لە زانستە سروشتییەکاندا، بەڵام لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان وشەیەکی زۆر فراوان و ناڕوونە، بەڵام ئەگەر خرایە پاڵ وشەی زانستی زیاتر دیاریکراوتر دەبێت.

لەو پێناسانەی کە بۆ وشەی توێژینەوە کراوە، چەند دانەیەك باس دەکەن: بریتییە لە گەڕانێکی ڕێکخراوە کە ئامانجی زیادکردنی مەعریفەی زانستییە، دەکرێت لە ڕێگای ئەزموونی زانستییەوە پێی بگەین و لە ڕاستییەکەی دڵنیابینەوە، هەروەها ئەمە گەڕانێکی وردە و مەبەست لێی ئاشکراکردنی فاکتگگەلێك و ڕێساگەلێکی گشتیین کە دەکرێت لە داهاتودا لێیان دڵنیاببینەوە(٢٤١). هەروەها توێژینەوە: ئامرازێکە بۆ گەڕان کە دەکرێت بەهۆیەوە بگەین بە چارەسەرێك بۆ کێشەیەکی دیاریکراو، ئەمەش لە ڕێگای

241- Whitney, F The elements off Research op cit p 5.

گەڕانێکی گشتگیر و ورد بۆ سەرجەم ئەو بەڵگانەی کە دەکرێت لێیان دڵنیابین پەیوەندییان بەم کێشە دیاریکراوە هەیە[٢٤٢].

هەرچی کێرلنگەرە، توێژینەوە بەوە پێناسە دەکات کە: (هەوڵێکە بۆ دڵنیابوونەوە لە پێشنیارە گریمانەییەکان لە بارەی پەیوەندییە گریمانەکراوەکانی نێوان دیاردە سروشتییەکان، بە شێوەیەکی زانستی ڕەخنەیی ڕێکخراو و دیسپلینکراو).

لەم پێناسانەوە دەگەینە دەرەنجامێك کە توێژینەوەی زانستی بە خەسڵەتی داهێنان و دروستکردن جیا دەکرێتەوە ، توێژەر شتێکی تازە دادەهێنێت، یاخود دووبارە پرسێك چارەسەر دەکات کە لەپێشوتر کەسی دیکە باسیی کردووە، بەڵام بەشێواز و هزرێکی تازە. خەسڵەتی دروستکردن و داهێنان کە توێژینەوەی زانستی پێ جیادەکرێتەوە هەر ئەویشە جیای دەکاتەوە لە خوێندن (Study) ئەمەی دوایی ئەو ناکاتە مەرج بەسەر نووسەرەکەی کە شتێکی تازە دابهێنێت، چونکە تەنیا توێژینەوەیەکی تیۆرییە و هیچ شتێکی تازە ناخاتە سەر مەعریفە.

بە هۆی ئەوەی کە توێژینەوەی زانستی کارێکی داهێنەرانەیە، بارزن و گراف بە پەیکەرێکی هونەرییان چواندووە، توێژەریش بە پەیکەرتاش، یاخود هونەرمەند. هەروەك چۆن پەیکەرتاش، یاخود هونەرمەند هەموو شارەزایی و توانا و لێهاتوییەکەی بەکاردەهێنێت لە پێناو ئەوەی کە پەیکەرەکە لە ڕووی

---

٢٤٢- عبدالباسط محمد حسن، هەمان سەرچاوە، لا ١٢٤.

وردی و جوانییەوە بەباشترین شێوەی دەربچێت، تاوەکو ببێتە جێگای ڕەزامەندی جەماوەر و خەڵکیش وەك کارێکی هونەری قبوڵی بکەن، ئەمە بۆ توێژەرەیش ڕاستە، ئەو سەرجەم شارەزایی و مەعریفە و کاتی خۆی بەکاردەهێنێت، تاوەکو توێژینەوەیەك ئەنجامبدات کە بە داهێنان جیابکرێتەوە و لە لایەن جەماوەرەوە قبوڵ بکرێت[٢٤٣].

لەوەی پێشوودا چەندین خەسڵەتمان بۆ بەدەرکەوت کە دەکرێت توێژینەوەی زانستی لە ئامرازەکانی دیکەی توێژینەوە جیابکرێتەوە کە هزرەکانی پێشووی نەسەلمێنراو، یاخود شارەزایی کەسی بەکاردەهێنن.

یەکەم: پرۆسەیەکی ڕێکخراو و دیسپلینکراوە، توێژەر زانیارییەکانی بە ڕێکەوت، یاخود بە پشت بەستن بە بیرکردنەوەی ئەبستراکت، یاخود شارەزایی کەسی بەدەست ناکەوێت، بەڵکو پابەند دەبێت بە ڕێکاری ورد، کە کێشە و گریمانەکانی خۆی لەبەرچاو دەگرێت.

دووەم: لەسەر سۆراخکاری ورد و هەڵهێنجاندن ئەگەر پێویستی کرد دروست دەبێت، بەومانایەی کە لە واقیعدا سەرچاوە دەگرێت، بەشێوەیەك توێژەر سەرجەم بەشەکانی دیاردەی لێتوێژراو لەبەرچاو دەگرێت.

سێیەم: توێژینەوەی زانستی توێژینەوەیەك نییە لە پێناو توێژینەوە، یان مەعریفەیەك بێت لە پێناو مەعریفە، بەڵکو توێژینەوەیەکە باس لە کێشەیەکی

243- Jaques Barzan and H E. Graff the modern Resercher (New York, 1957) p 56.

دیـاریکراو دەکـات کــە دەیــەوێت چارەســەری بــۆ بدۆزێتــەوە، یــاخود بەشـێوەیەکی زانسـتی ڕاڤـەی بکـات لــە میانــەی یاسـا و تیـۆر، یـاخود دیزایینکردنی خاوەن ڕاستگۆیی.

چوارەم: ئەو دەرەنجامانەی کە لە میانەی توێژینەوەی زانستی پێی دەگـەین بەوە جیادەبێتەوە کە دەکرێت لـە ڕاسـتییەکەی بکۆڵدرێتـەوە بەشـێوەیەکی ئـەزموونی، توێژینــەوە دەکرێـت و دەتوانرێـت دووبـارە چـاو بـە زانیارییـە ناڕاســـتەکانیدا پێـــدا بخشـــێنرێتەوە، واتـــە هـــەڵگری خەســـڵەتی خۆڕاستکردنەوەیە.

هەرچی سەبارەت بە ئامانجەکانی توێژینەوەی زانستییە بەمشێوەیەیە:

١. ئاشـکراکردنی هەقیقەتگـەلێك کـە لــە پێشـودا هـیچ توێـژەرێك باسـی نەکردووە، یاخود بریتییە لە دانانی یاسا و تیۆری تازە.
٢. زیندووکردنــەوەی بابــەتێکی کـۆن و دووبـارە توێژینــەوەکردنی، کـە بـە هۆیـەوە زانیـاری و هەقیقـەتی تـازەی لێ دابتاشـرێت کـە لـە پێشـودا زانـراو نەبووە.
٣. دۆزینەوەی ڕێگایەکی تازە بۆ چارەسەرکردنی هەر توێژینەوەیەك.
٤. زیندووکردنەوەی بابەتێکی کۆن، بەڵام بەشێوەیەك چارەسـەر بکرێـت کـە خزمەتی پرسێکی نیشتیمانی، یاخو مرۆیی تازە بکات[٢٤٤].

**٢. جۆرەکانی توێژینەوە**

[٢٤٤]- روزنتال، مناهج العلماء المسلمين في المجال العلمي، همان سەرچاوە، لا ١٧٤_١٧٥.

پۆلێنەکان سەبارەت بە توێژینەوە گەلێك زۆرن، هەندێکیان توێژینەوەی زانستی، یاخود پراکتیکین، یان توێژینەوەی تیۆری، یاخود بنەڕەتین (Basic Research) پشت بە بوونی گرفتێکی واقیعی دەبەستن کە پێویستە چارەسەرێکی بۆ بدۆزرێتەوە. هەرچی دووەمە، توێژینەوەی تیۆری پەتین. تیایدا توێژەر ئازادی ڕەهای دەبێت لە هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەکەی، بێئەوەی پێویست بێت گرفتێك هەبێت کە هەوڵی چارەسەرکردنی بدات لە ڕێگای ئەو دەرەنجامانەی کە توێژەر پێی دەگات.

لە ڕاستیدا دژوارە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەو دوو جۆرە توێژینەوەیە، لەسەر بنەمای ئەو ئامانجانەی کە هەوڵی بۆ دەدەن، هەردووکیان دەیانەوێت بگەن بە بنەچەی کێشەکە، بەڵام هەریەکەیان بە شێوە تایبەتەکەی خۆی. توێژینەوەی پراکتیکی ڕاستەوخۆ ئامانجەکە دەپێکێت و سوودەکەی خێرایە، هەرچی توێژینەوەی تیۆرییە، یاخود توێژینەوەی پەتی، هەمان ئامانجی هەیە، بەڵام دوای ماوە و کاتێکی بڕەك درێژتر، لەپێشوتردا تێکەڵبوونی نێوانی ئەو دوو جۆرە توێژینەوەمان دەستنیشان کرد، توێژەرەی پراکتیکی پشت بە توێژینەوەی تیۆری دەبەستێت، هەندێکجار توێژەری تیۆریش ئەنجامەکانی توێژینەوەی پراکتیکی بەکاردەهێنێت.

هەمان دابەشکردن پشتی پێدەبەسترێت لە لایەن ئیحسان محەممەد ئەلحەسەن لە کتێبی (بنەما زانستییەکانی میتۆدەکانی توێژینەوە)، بەشێوەیەك پێیوایە توێژینەوەکان بەشێوەیەکی زانستی دابەشدابن بەسەر دوو بەشی سەرەکی ئەوانیش: توێژینەوەی تیۆری و توێژینەوەی پراکتیکی، یاخود زانستین، یەکەمیان بایەخ بە پشکنینی ڕاستی، یاخود ناڕاستی

گریمانــە و تیـۆر و یاسـا زانسـتییەكان دەدا، واتــە دڵنیـابوون لـە ڕاسـتی و دروستییەكەی، یاخود دۆزینەوە و ئاشكراكردنی گریمانــە و تیـۆر و یاسـاگەلی زانستی، كە دەبێتــە زیادەیـەك بـۆ سـەر ستراكچـەری زانسـت و توێژینـەوە و كەلــەپوور و دەرەنجامــەكانی بابــەتیبون و شــیكاركردن، ســەبارەت بــە توێژینەوە و تێگەیشتن لە لایەنێك لە لایەنەكانی كۆمەڵگا[٢٤٥].

هەرچـــی توێژینـــەوە پراكتییەكانـــە، توێژینـــەوەی ئاڕاســـتەكراون بـــۆ چارەسەكردنی كێشەیەك كـە كۆمـەڵگا لـە دەسـتی دەناڵێنێت، زۆرجـار ئـەو توێژینەوانــە چــەندین شـێوازی مەیـدانی لــە توێژینــەوەكردن و شـیكردنەوە بـەكاردەهێنن، وەك تێبینیكـردن و چـاوپێكەوتن و دیـاریكردنی توێژینـەوە و .....هتد[٢٤٦].

**هەروەها توێژینەوەكان دابەشدەبن بۆ:**

١. توێژینەوە بەمانای گەڕان بـەدوای ڕاسـتیەكان، ئەمـەش ئـەو توێژینەوانـە دەگرێتــەوە كــە هــەوڵی گــەڕان بــەدوای چــەند هەقیقەتێكـدا دەگــەڕێن كــە لەپێشوتردا دیاریكراون، بێئەوەی هەوڵی گشتاندن، یـاخود تێپەڕانـدن بـدەن بۆ چارەسەكردنی گرفتەكان.

٢. توێژینەوەی ڕاڤـەكاری ڕەخنـەیی، ئەمـەش ئـەو توێژینەوەیـە كـە هـەوڵی گەیشتن بە چارەسەكردنی چەند گرفتێك دەدات كە لـە پێشـودا دیـاریكراون، هەروەها پشت بە بەڵگاندنی لۆژیكی دەبەستێت، هەر سوودی دەبێـت ئەگـەر

---

٢٤٥- احسان الحسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥.

٢٤٦- احسان الحسن، هەمان سەرچاوە، لا ٣٥.

کارەکە پەیوەستیش بێت بە چەند بیرۆبۆچونێك کە پەیوەست بێت بە چەند هەقیقەتێك، ئەمەش لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاودەبێتەوە.

٣. توێژینەوەی تەواو: ئەو توێژینەوەیە کە لەسەر کۆکردنەوەی هەقیقەت و دانانی نەخشەسازیەکان راوەستاوە ، هەروەها لەسەر شیکردنەوەو پۆلێنکردنی تەواوی ئەو بەڵگانەی پێی گەیشتووە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان.

هەروەك هەندێکجار توێژینەوەکان لەسەر بنەمای ئامانجەکانیان پۆلێن دەکرێن، بەمشێوەیە:

١. توێژینەوە بە ئامانجی دانانی تیۆر و یاسا.

٢. توێژینەوە لە پێناو دەستەبەرکردنی ئامانجی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی.

٣. توێژینەوە بە پاڵنەری کەسی.

٤. توێژینەوە لە پێناو تێرکردنی ڕەمەکی مەعریفە و مەیلی تایبەت بە توێژەر.

هەرچی سەبارەت بە توێژینەوەی زانکۆییە ئەوا زۆرجار دابەش دەبێتە سەر:

**١) توێژینەوە، یاخود یادداشت لەپێناو وەرگرتنی مۆڵەت**

ئەمە بریتییە لە توێژینەوەیەك کە هەندێك زانکۆ دایانناوە و لە لایەن خوێندکارانی دوا قۆناغ ئەنجام دەدرێت، گوزارشتیشە لە توێژینەوەیەك کە لە ٥٠ بۆ ١٠٠ لاپەڕەیە، بە توێژینەوەیەکی دەروازەیی، یاخود ئەزموونی دادەنرێت بۆ خوێندکاران، لەمیانەوە ئاگاداری ڕێگا و میتۆدی توێژینەوە و شێوازی زانستی دەبێت لە نووسین، ئامانج لەم توێژینەوەیەش داهێنانی

شتێکی تازە نییە، بەڵکو ڕۆڵەکەی کورتدەبێتەوە بەسەر ئەوەی کە خوێندکار ڕابهێنێت لەسەر توێژینەوە و قوڵبوونەوە لە بارەی بابەتێکی دیاریکراو، گەڕان بەدوای سەرچاوە و شێوازی نووسینی زانستی، بۆ نموونە دانانی پلانی توێژینەوە. ئەمە لە پاڵ ڕێکخستنی هزر و زنجیرەبەندی و پەنابردن بۆ سەرچاوە و چۆنییەتی وەرگرتن و بەکارهێنانی....هتد.

**٢) نامە (دیبلۆمی توێژینەوەی باڵا)**

ئەمەش هەنگاوی دووەمە لە توێژینەوەی زانکۆیی و نامەش دەستەواژەیەکی ئەکادیمیە بەو توێژینەوانە دەگوترێت کە پێشکەش دەکرێت بۆ وەرگرتنی پلەیەکی زانستی، ئەوانیش ماستەر (دیبلۆمی توێژینەوەی باڵا)، کە قەبارەی گەورەترە لە یادداشت، ئامانجی داهێنانی شتێکی تازەیە، یاخود ڕێکخستنێکی تازەیە بۆ بابەتێك کە لە پێشوتردا باسیکراوە، ژمارەی لاپەڕەکەکانیشی لە نێوان (١٠٠بۆ٢٠٠) لاپەڕەیە.[٢٤٧].

**٣) تێز**

ئەمەش وەك نامە دەستەواژەیەکی ئەکادیمیە، پێشکەش دەکرێت بۆ وەرگرتنی پلەی دکتۆرا، ئامانجیشی داهێنانی شتێکی تازەیە، یاخود دووبارە

[٢٤٧]- لە هەندێك سیستەمی زانکۆیی (لەنێویشیاندا سیستەمی تازەی دکتۆرا لە ڕۆژئاوا) دیبلۆمی باڵا (ماستەر) سڕاوەتەوە و بە توێژینەوەیەکی ئامادەسازی قەرەبۆکراوەتەوە کە خوێندکار ئامادەی دەکات لە ماوەی ساڵی دووەم، لەم توێژینەوەدا دەبێت هەموو مەرجەکانی توێژینەوەی زانستی بونی هەبێت، چونکە خوێندکار ئامادەی دەکات بۆ ناونوسین لە دکتۆرا، توێژینەوەی ئامادەسازی دەبێت لە نێو دوو پێگە دەبێت، واتە وردتر و زانستیتر بێت لە توێژینەوەی قۆناغی چوارەم و خوارتر لە ماستەر، ئەو زیاتر لەوانە وردتر و زانستیترە، بەڵام لە ماوەیەکی کەمتر ئامادە دەکرێت).

دارشتنەوە بابەتێکی پێشوە، بەڵام پشت بە هێزی تازە دەبەستێت لە توێژینەوە، ژمارەی لاپەڕەکانیشی زیاترە لە ٢٠٠ لاپەڕەیە.

تێزیش وەك نامە تاوتوێدەکرێت لە بەردەم لێژنەیەك مامۆستای پسپۆڕ لە بابەتی توێژینەوەکە و خەڵکانێك ئامادە دەبن کە بایەخ بەم بابەتانە دەدەن.

### ٣. مەرجەکانی توێژینەوەی زانستی

هەموو کەسێك ناتوانێت ببێتە توێژەرێکی زانستی، هەموو توێژینەوەیەکیش زانستی نییە. پێویستە بۆ پرۆسەی توێژینەوە چەند خەسڵەتێك لە توێژەر هەبێت کە وای لێبکات خەسڵەتی توێژەری زانستی هەڵبگرێت، هەروەها دەبێت بارودۆخێکی بابەتیش هەبێت تاوەکو بکرێت پرۆسە توێژینەوە بە شێوەیەکی ڕاست ئەنجام بدرێت.

**یەکەم: پێویستە مەرجی بابەتی هەبێت بۆ توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی زانستی**

گرنگترن پێداویستی کە دەبێت لە پرۆسەی توێژینەوەی زانستی هەبێت بە تایبەتی لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە ئازادی ئەکادیمی، ئەمەش بەرزترین پلەی ئازادی زانستییە، چونکە نائامادەیی ئازادی بیرکردنەوە و گوزارشتکردن ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر ئازادی ئەکادیمی دەبێت، بەمپێیەش لەسەر ئازادی توێژینەوەی زانستی، بەدڵنیاییەوە لە کۆمەڵگایەکدا کۆت هەبێت لەسەر ئازادی ڕادەربرین و هزرن ئەوا لەو کۆمەڵگایەدا گرنگترین مەرجی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی تێدا نییە.

سەیر نییە دەبینین کە کۆمەڵگا دیموکراسییەکان جیادەکرێنەوە بە بڵاوبونەوە و بەرفراوانبوونی پرۆسەی توێژینەوەی زانستی، بودجەیەکی گەورەی بۆ دابیندەکرێت لە لایەن زانکۆ و سەنتەرەکانی توێژینەوە لە پێناو ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لە سەرجەم بوارەکان و رۆیشتن لەگەڵ شتی تازە لە جیهانی مەعریفە، هەرچی سیستەمی نادیموکراسییە ئەوا ترسی هەیە لە توێژینەوەی زانستی بە تایبەتی لە بواری کۆمەلایەتی هەروەها لە زانا و رۆشنبیرەکان دەترسێت، چونکە دەزانێت ئەوانە بەدوای هەقیقەتدا دەگەرێن، هەقیقەتیش سیستەمە دیکتاتۆرەکان رووتدەکاتەوە لە رەوایەتی و دەیانخاتە بەردەم واقیع.

ئازادی توێژینەوەی کۆمەلایەتی زانستی دەستەبەر نابێت تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە ئازادی بەشێوەیەکی گشتی بوونی هەبێت، بۆ ئەوەی ئازادی توێژینەوە بۆ زانا و رۆشنبیرەکان بوونی هەبێت پێویستە ئەم مەرجانە هەبێت: سەربەخۆیی ناوەخۆیی (ئەگەر رێژەییش بێت) بۆ زانکۆ و سەنتەرەکانی توێژینەوە لە لایەن ناوەندەکانی دەسەلات، فەراهەمکردنی توانای دارایی بۆ ئەو دامەزراوانە، هەروەها پاراستنی توێژەران، ئینجا چ لەسەر ئاستی مەترسی بێت لەسەر کارەکانیان بێت، یاخود چ لەسەر ئاستی ژیان و سەقامگیرییان بێت.

**دووەم: ئەو مەرجانەی کە دەبێت لە توێژەردا بوونیان هەبێت:**

هەندێك بە هەڵە بیردەکەنەوە ئەوکاتەی پێیانوایە ئاشنابوونی توێژەری کۆمەلایەتی بە میتۆدە زانستییەکان و فەراهەمبوونی بارودۆخی بابەتی توێژینەوە، توێژینەوەی زانستی بەرهەم دەهێنێت. ئەوەی لە هەردووکیان

گرنگترە خود توێژەرە، میتۆدی زانستی تەنیا هەنگاوە کردەییەکانی میتۆدی زانستی نییە، بەڵکو یەکەم شت خودی توێژەرە، میتۆد لە عەقڵی توێژەر دەست پێدەکات و دواتر بۆ دەرەوەی ئەو دەگوازرێتەوە، ئەگەر توێژەر عەقلێکی زانستی کراوە و بابەتی نەبێت، ئەگەر لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە ئامادە نەبێت بۆ قبوڵکردنی هەقیقەت، هەرگیز نابێت بە توێژەرێکی زانستی و توێژینەوەی زانستیشی پی بەرهەم ناهێنرێت.

لەم سۆنگەیەوە زانایان بایەخیاندا بەو مەرجانە کە پێویستە لە کەسی توێژەر هەبێت بە هەمان ڕێژەی بایەخدانیان بە هەنگاوە کردەییە بابەتییەکانی میتۆدی زانستی، پەیوەندی توێژەر بە میتۆدی زانستی وەك پەیوەندی (تۆو)ە بە زەوی، چۆن تۆو ناتوانێت بەرهەم دروستبکات ئەگەر لەسەر زەوییەکی بە پیت نەبێت، میتۆدی زانستیش ناتوانێت توێژینەوەیەکی زانستی بەرهەمبهێنێت ئەگەر بە عەقڵی توێژەرێکی کراوەی باوەڕدار بە زانست و بابەتیبونی زانستی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بۆیە گرنگە قوتابی زانۆك ڕاهێنانی پێبکرێت و فێری بکەیت چۆن میتۆدی زانستی بەکاربهێنێت، هەر لەسەرەتای ساڵەکانی یەکەمی خوێندنییەوە، لەمبارەیەوە کانت دەڵێت نابێت قوتابی فێری هزر بکەیت، بەڵکو دەبێت فێربکەین بیربکاتەوە[٢٤٨].

توێژەرەکان[٢٤٩] کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە هەموو توێژینەوەیەکی زانستی پێویستە ١٠ خاڵی تێدا هەبێت ئەوانیش:

---

[٢٤٨]- لە نێویشیاندا ردیەر لە کتێبی (کیف تکتب رسالة)
World Reeder, How to writ a Thesis (Illoonois 1925), pp 14_18.

[٢٤٩]- بروانة: فوزي غرايبة و اخرون، اساليب البحث العلمي في العلوم الاجتماعية، الجامعية الادرنية، عمان، ١٩٧٧، لا ١٠_١١.

١. نابێت توێژەر پێیوابێت ئەو شتێك دەزانێت ئەوانی دیکە نایزانن، بەمپێیەش تەنیا باسی بۆچوونی کەسی خۆی بکات بێئەوەی پشتراستی بکاتەوە بە چەند بۆچونێك کە بەهای خۆی لە چەندین سەرچاوەی جیاواز وەردەگرێت، ئەمەش مەرجێکی پێویستە بۆ توێژەرە قوتابییەکان، یاخود ئەوانەی هێشتا تازەن و لە سەرەتای ڕێگادان.

٢. نابێت توێژەر هیچ بۆچوونێك وەك بەڵگەنەویست وەربگرێ بێ گفتوگۆ، تەنانەت ئەگەر خاوەنەکەشی زانا بێت، یاخود نووسەرێکی بەناوبانگ بێت بەتایبەتی لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان کە تیایدا بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە لە بارەی یەك پرس، لەسەر توێژەر پێویستە باسی سەرجەم بۆچوونە جیاوازەکان بکات لە بارەی بابەتەکە.

٣. نابێت توێژەر بۆچوونێك وەك هەقیقەتێکی کۆتایی سەیر بکات، ئەگەرچی لە لایەن زۆرینە، یاخود لێژنەیەك، یاخود گروپێکیشەوە دەرچوبێت.

٤. نابێت توێژەر پێوانەکردن، یاخود هاوشێوەکردن بە هەقیقەتێکدا بێت کە ناکرێت گفتوگۆی لە بارەیەوە بکرێت.

٥. هەروەها نابێت بێدەنگبوون لە بارەی چەند پرسێك، یاخود زانیارییەك بە کارێکی کۆتایی هاتوو، یاخود بە هەقیقەتێکی دابنێت، ڕەنگە بێدەنگبوون هەڵوێستێکی لایەنگیرانەی مەبەستدار بێت.

٦. دەبێت توێژەر پابەند بێت بە بابەتیبوون، نابێت هیچ بەڵگەیەك، یاخود ئارگیۆمێنتێك، یاخود تیۆرێك بسڕێتەوە بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ بۆچوون، یاخود مەزهەبی ئەو ناگونجێت.

٧. دەبێت توێژەر وردبێت لە کاتی پشت بەستنی بە سەرچاوە، دەبێت دڵنیابێت لە هەر زانیارییەك کە سەرچاوەکەی جێگای گومان بێت، وەك نەبوونی ناوی نووسەر، یاخود بەرواری چاپ......هتد.

٨. دەبێت توێژەر ورد بێت لە بەکارهێنانی چەمك و زاراوەکان و مانای هەموویان دیاری بکات لە سەرەتای توێژینەوەیەکەیدا.

٩. دەبێت توێژەر لە گواستنەوەی بۆچوون و وەرگرتنەکان دەستی پاك بێت و هەموو بۆچوونەکان بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، سەرچاوەی هەموو وەرگرتنێکیش بنووسێت.

١٠.دەبێت توێژەر پشت بە خۆی ببەستێت لە دیارکردنی بابەتی توێژینەوە و بەدەستهێنانی زانیارییەکان[٢٥٠].

## باسی دووەم:
## پلانی توێژینەوەی زانستی و دیاریکردنی هەنگاوەکانی

نەخشەسازی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، یاخود پلاندانان بۆ قۆناغەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بەشێکی جەوهەرییە لە پرۆسەی توێژینەوەدا، مەبەستی ئێمە لە پلاندانانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی تەنیا دابەشکردنی بابەت نییە بۆ توخمە سەرەکییەکانی: پێشەکی و ناوەڕۆکی بابەت کە ئەویش بۆ دەروازە و بەش و باس..هتد دابەشدەبێت، ئەم دابەشکردنە دوای

٢٥٠- حسن الساعاتي، سەرچاوەی پێشوو، لا ٩ و دواتر.

هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە و دیارکردنی بابەت ئەنجام دەدرێت، کە بەشێکی بچووکە لە پرۆسەیەکی مەزن کە پێی دەوترێت توێژینەوەی زانستی.

مەبەستمان لە نەخشەسازی و پلاندانان: توێژینەوەیە، یاخود قۆناغەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتییە، ئەو پرۆسە بەرفراوانەی کە توێژەر پەنای بۆ دەبات دوای ئەوەی بڕیاری دەستپێکردنی پرۆسەی توێژینەوە دەدات (واتە پێش ئەوەی ئیشکالییەتی توێژینەوە دیاری بکات)، کە هاوکاتە لەگەڵ پرۆسەی توێژینەوە بە هەموو هەنگاوەکانی تاوەکو نووسینی راپۆرتی توێژینەوە.

بەم مانایە پرۆسەی توێژینەوە، پرۆسەیەکی بەرفراوانە سەبارەت بە هەموو توێژەرەکان، بەشێوەیەکی مەزنیش لە لایەن پسپۆڕانی بواری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی ڕێکەوتنی لەسەرکراوە، بۆیە پلاندانان بەشێکی سەرەکییە لە پرۆسەی توێژینەوەی زانستی، کە هەنگاوێکی ئیجرائی و زیهنییە و هەردەبێت ئەنجام بدرێت تاوەکو توێژینەوە ئەنجام بدرێت و بوونی هەبێت.

نەخشەسازیکردنی توێژینەوەکان مانای ئەو پرۆسە عەقڵیەیە کە توێژەر دەستی پێدەکات لەسەر بنەمای ڕێکخستنی لۆژیکی بۆ هەنگاوەکانی توێژینەوەی پراکتیکی لەپێناو گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکە.

وشەی نەخشەسازی لە بنەمادا لە بواری ئەندازە وەرگیراوە، چونکە ئەندازیار پێش ئەوەی دەست بکات بە دروستکردنی پرۆژە (ئینجا چ باڵاخانە، یاخود پرد، یاخود فرۆکەخانە بێت)، ئەوا لە سەرەتادا نەخشەکە دادەنێت، هەموو پێداویستیی و مەرجە پێویستەکان دادەنرێت بۆ دروستکردنی باڵاخانە، شتە

سەرەکییەکان دیاری دەکات لەگەڵ درێژی و دەروازە و شوێنی چوونە دەرەوە، هەروەها ماددە پێویستەکانی دروستکردنی بینا دیاری دەکات، دوای ئەوەش دەست دەکات بە پرۆسەی دروستکردنی باڵاخانەکە.

هەروەك چۆن ئەندازیار لە کاتی دانانی نەخشەدا پێویستی بە شارەزایی تەواو لە بواری تەلارسازی هەیە، توێژەری کۆمەڵایەتیش لە کاتی دانانی پلاندا، پێویستی بە شارەزایی تەواو هەیە لەو بوارەی کە توێژینەوەی تیادا دەکات، ئەمەش مانای ئەوەیە کە توێژینەوە دەکات لە بواری پسپۆڕی خۆیدا.

هەروەها هەندێکی دیکە پلان بەو نەخشەیە دەچوێنن کە سەرکردەیەك دایدەنێت لە کاتی جەنگدا، سەرکردەی وریا پێش ئەوەی دەست بکات بە جەنگ ئەو بارودۆخە بابەتییە دیاری دەکات کە جەنگەکە تێیدا ڕوو دەدات، هەروەها بڕیارەکانی دەدات لەسەر بنەمای هەر هەڵوێستێك لەو هەڵوێستانەی کە چاوەڕوان دەکرێت لە داهاتودا ڕوو بدات، بۆیە بڕیار لەسەر جۆری چەك، ژمارەی سەرباز و شێوازی گەیشتن بە سەربازەکان دەدات، بەمپێیەش نەخشەیەك بۆ جەنگ دادەنێت بەپشت بەستن بەو بڕیارانەی کە وەریدەگرێت لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە لەبەردەستیدا هەن. هەمان شتیش سەبارەت بە توێژینەوەی زانستی ڕاستە، لەسەر توێژەر پێویستە توێژینەوەی بابەتی توێژینەوە بکات لە سەرجەم لایەنەکان پێش ئەوەی دەست بەکارەکەی بکات.

بەمشێوەیە نەخشەسازیکردن بریتییە: لە پرۆسەی بڕیاردان پێش دەرکەوتنی ئەو بارودۆخەی کە ئەو بڕیارانەی تێدا جێبەجێ دەکرێت، یاخود پرۆسەی

پێشبینیکردنی چاوەڕوانکراوە و بەرەو کۆنترۆڵکردنی ئەو بارودۆخە دەڕوات، کە چاوەڕوان دەکرێت توێژینەوەی لە بارەیەوە بکرێت.

نەخشەسازریکردنی میتۆدی ڕاست بەپێی بۆچوونی ئاگۆڤ پێویستی بە چەند شتێك هەیە:

أ) نەخشەی توێژینەوە پێش ئەنجامدانی توێژینەوە.

ب)هەڵسەنگاندنی ئەو میتۆدە کە بەکاردەهێنرێت بۆ بڕیارەکانی پلانەکە، یاخود وابکرێت ئەو میتۆدەی هەڵبسەنگێنرێت.

دانانی نەخشەیەکی ستراتیژی کە یارمەتی توێژەر دەدات بۆ دیاریکردنی قۆناغە گەورەکانی توێژینەوەکەی، لە ڕووی جۆری زانیارییە داواکراوەکان، یاخود جۆری کەرەستە پێویستەکان بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانە، لەگەڵ جۆری شیکردنەوە چەندێتی، یاخود چۆنییەتی ئەنجامدانی، هەروەها نەخشەی تەکنیکی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڵوێستە پراکتیکییەکان لەسەروبەندی کۆکردنەوەی داتا و چۆنییەتی مامەڵەکردن لە هەموو حاڵەتێکدا.

ت)دەبێت نەخشەکە جیڕ و نەرم بێت بۆ ڕووبەروبونەوەی هەموو ئەو گۆڕانە لە ناکاوانەی کە ڕووبەڕووی توێژەر دەبێتەوە.

یەکێك هەنگاوە سەرەکییەکانی پلانی توێژینەوە، بریتییە لە دیاریکردنی قۆناغەکانی توێژینەوە یاخود زنجیرەبەندکردنی ئەو هەنگاوانەی کە توێژەر

لە کارەکەیدا پەیڕەوی دەکات، هەنگاوەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بەمشێوەیە[٢٥١]:

١. هەڵبژاردنی بابەت و گرفتی توێژینەوە، باشتروایە بەنووسین گرفتەکە دابڕیژێت.

٢. دیاریکردنی چەمك و زاراوە بەکارهاتووەکان لە توێژینەوە.

٣. دانانی گریمانە زانستییەکان.

٤. دیاریکردنی میتۆد، یاخود میتۆدە گونجاوەکانی توێژینەوە.

٥. دیاریکردنی ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری.

٦. دیاریکردنی بواری مرۆیی توێژینەوە.

٧. دیاریکردنی بواری شوێنی توێژینەوە.

٨. دیاریکردنی بواری کاتی توێژینەوە.

٩. کۆکردنەوەی زانیاری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ.

١٠. پۆلێنکردن و بەتاڵکردن و ڕیزبەندیکردنی داتا.

١١. شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی داتاکان.

١٢. نووسینی ڕاپۆرتی توێژینەوە.

ئێمە تیشك دەخەینە سەر گرنگترین هەنگاوەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و لە پیشوودا ئاماژەمان بە هەندێك کردووە، بەپێی پێویستیش باس لە هەنگاوەکانی دیکەی دیزاینی توێژینەوە دەکەین.

---

٢٥١- عبدالباسط محمد حسن، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٩.

## بەشی دووەم

# دیاریکردنی بابەت و گرفتی توێژینەوەکە

## باسی یەکەم

## لە بارەی پێناسەی گرفتی توێژینەوە

**١. دیاریکردنی بابەتی گشتی توێژینەوە (کایەی توێژینەوە)**

یەکەم هەنگاو کە ڕووبەڕووی توێژەر دەبێتەوە بریتییە لە دیاریکردنی بابەتی توێژینەوەکەی، ئەمەش هەنگاوی پێش دیاریکردنی گرفتی توێژینەوەکەیە، مەبەست لە بابەتی توێژینەوە بوارێکی مەعریفییە کە توێژەر هەڵی دەبژێرێت بەمەبەستی هەڵبژاردنی ئیشکالیەتێك تیایدا تاوەکو ببێتە ئەو بابەتەی کە توێژینەوەی لە بارەیەوە ئەنجام دەدات، چونکە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بوارێکی زۆر فراوانن و لقی پسپۆڕی زۆری تێدایە، ئەگەر خوێندکارێك لە کۆلێژی ماف بیەوێت توێژینەوەیەك ئەنجام بدات لە ماوەی خوێندنی زانکۆ (وەرگرتنی بڕوانامەی ماف، یاخود نامەی ماستەر، یاخود تێزی دکتۆرا)، سەرەتا پێویستە ئەو بوارە دیاری بکات کە توێژینەوەی لە بارەوە دەکات، ئایا بابەتێك لە بواری زانستە کارگێڕییەکان هەڵبژێرێت، یان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، یان لە زانستی سیاسەتدا؟

زۆر پێویستە توێژەر بواری توێژینەوەکەی خۆی لە بواری پسپۆری خۆی هەڵدەبژێرێت، خوێندکاری زانستی سیاسەت پێی باشە بابەتەکە لە زانستی سیاسەت هەڵبژێرێت و خوێندکارێك لە پسپۆڕی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەسەری پێویستە بابەتێك بۆ توێژینەوەکەی هەڵبژێرێت لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، خوێندکاری یاسای تایبەت لەسەری پێویستە بابەتی توێژینەوەکەی لە بواری یاسای تایبەت هەڵبژێرێت...هتد، چونکە توێژینەوەی خوێندکار لە بوارە تایبەتەکەی خۆی زۆر ماندوی ناکات و پرۆسەی توێژینەوەی بۆ ئاسان دەکات، بە هۆیەوە لە بوارەکەی خۆیەتی و پێی نامۆ نییە، بەڵکو ئاگادارییەتی و ئاگاداری سەرچاوە و زانیارییە سەرەکییەکانییەتی.

هەمان شتیش بۆ توێژەرەکانی دەرەوەی چوارچێوەی زانکۆ ڕاستە، لەسەر توێژەری مەڵایەتی پێویستە بابەتی توێژینەوەکەی لەو کایە مەعریفییە هەڵبژێرێ ە خۆی تیایدا پسپۆڕە، یاخود ئاگادارییەتی زیاتر لەوانی دیکە، هەند بار ئەو دامەزراوە، یاخود دەستانەی کە توێژەر کاری تێدا دەکات بابەتی توێژینەوەکە دیاری دەکەن، لەوەشدا پشت بە ئامانجێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو دەبەستن و هەوڵدەدەن خزمەتێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو پێشکەش بکەن، توێژینەوەی کۆمەڵایەتی وەك لە پێشوتر ئاماژەی بۆ کرا، لە بۆشاییدا ئەنجام نادرێت، هەروەك لە پێناو مەعریفەی ئەبستراکتیش ئەنجام نادرێت، بەڵکو لە خزمەتی ئامانجی کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە،

بۆیە توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان بابەتی توێژینەوەکانیان لەو کایەیە هەڵدەبژێرن کە جێگای بایەخی جەماوەر، یاخود تەمومژ و ناڕوونی لە دەوری

هەیە، یاخود گرفتێکی کۆمەڵایەتییە و پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە، توێژەری داهێنەری ڕاستەقینە بەراستی لە بابەتە مردووەکان دوور دەکەوێتەوە، ئەو بابەتانەی کە هیچ خزمەتێك بە زانست ناکەن و هیچ زیادەیەك ناخەنە سەر مەعریفەوە.

لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانکۆییدا باشتروایە مامۆستای سەرپەرشتیاری توێژینەوە سەر بەهەمان پسپۆڕی زانستی بێت کە بابەتەکەی تێدا هەڵبژێردراوە، نابێت خوێندکار پەنا بۆ سەرپەرشتیارێکی دیکە بەرێت بۆ ئەوەی سەرپەرشتی توێژینەوەکەی بکات تەنیا لەبەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی کەسی لەگەڵدا هەیە، یاخود لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵیدا هەست بە ئارامی دەکات، یاخود سەرسامە بە هزرەکانی، پرۆسەی توێژینەوە بە سوودتر و بەکەڵکترە ئەگەر بێت و مامۆستای سەرپەرشتیار پسپۆڕ بێت لە هەمان بواری توێژینەوەدا.

**ئەو بابەتانەی کە توێژەری کۆمەڵایەتی بایەخیان پێدەدات**

بێگومان هەموو دیاردەو ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی بەکەڵك ئەوە دێنێت ببێتە بابەتێك بۆ توێژینەوە، ئەگەر بەرەو ئاراستەی گرفتێکی کۆمەڵایەتی بڕوات، پێش دیاریکردنی چەمکی گرفتی کۆمەڵایەتی، ئاماژە بۆ گرنگترین بابەتی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دەکەین.

یەکەم: ئەو بابەتانەی لە دەوری گرفتی ژیانی کۆمەڵایەتیَ دەخولێنەوە، وەك سواڵکردن  هەژاری، تاوان، لادان و چەندان بابەتی دیکە کە ڕەنگدانەوەی لادانن لە ڕەفتاری تاك و کۆڕەفتاری کۆمەڵگا و بەها باوەکان.

دووەم: بابەتگەلێك کە پەیوەستن بە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، وەك توێژینەوەی مێژووی کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان، یاخود کەرتێك لە کەرتەکانی کۆمەڵگا.

سێیەم: بابەتگەلێك کە پەیوەندییان بە پێکهاتەی بونیادی کۆمەڵگاوە هەیە، وەك چینە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییە خزمایەتییەکان و سیستەمی خێزان و پەیوەندی لادێ بە شارەکان و ...هتد.

چوارەم: بابەتگەلێك لە بارەی سیستەمی دامەرزاوەکان، وەك سیستەمی سیاسی یاخود سیستەمی هەڵبژاردن، یاخود پارتەکان، یاخود توێژینەوەکردنی سەندیکاکان و کۆمەڵگاکان...هتد.

پێنجەم: توێژینەوەکان بایەخ بە بیروباوەڕە باوەکان دەدەن لە کۆمەڵگادا، وەك ئایین، ئایدۆلۆژیا باوەکان و نەریت و خووەکان.

شەشەم: هەندێك توێژینەوە هەن لە بارەی ململانێی کۆمەڵایەتی وەك جەنگی ناوەخۆ، فیتنە، ململانێی هۆز و خێڵەکان، ململانێیە چینایەتییەکان.

### ٢. گرفت چییە؟

دوای ئەوەی توێژەر ئەو بوارە دیاری دەکات کە توێژینەوەی تێدا دەکات، دەچێتە هەنگاوێکی دیکە، ئەویش بریتییە لە ئیشکالییەتی توێژینەوە (هەندێکجار سنووری بابەتی توێژینەوە و ئیشکالییەتی توێژینەوە تێکەڵ دەبێت) ڕەنگە هەندێك پرۆسەی هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە بە ئاسان سەیر بکەن، بەوەی کە پێیانوایە هەر گرفتێك یاخود پرسێك دەکرێت ببێتە گرفتی توێژینەوە و دەتوانین لە ماوەیەکی دیاریکراو توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدەین.

ئەم سادەکردنەوەیە بۆ کاروبارەکان ڕەنگە توێـژەر بخاتـە نێـو قـەیرانێك لـە کاتی پرۆسەی توێژنیەوەکەی، بۆیە دوواتر دووچاری ئاستەنگ دەبێـت دوور نیـە نەگاتـە ڕێگایـەکی داخـراو، لـە زۆربـەی حاڵەتەکانیشـدا توێـژەری تـازە دووچـاری ئاسـتەنگ دەبێتـەوە لـە بـارەی چـۆنییەتی دۆزینـەوەی خـاڵێکی دیاریکراو کە دەبێتە خاڵی دەستپێکی پرۆسەی توێژینەوەکەی.

توێژەر بە تایبەتی ئەوانەی تازەن لە کارەکەیاندا، ڕەنگە وێنایەکی گەشییان هەبێت لە بارەی پرۆسەی توێژینەوە، یان ڕەنگە ویست و پەرۆشییەکی زۆری هەبێت بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی تایبـەت بـەخۆی، یـان ڕەنگـە بیـەوێت توێژینـەوەی گرفتێکـی مـەزن و ناونیشـانی سـەرنجراکێش بکـات بـۆ پرسـە گەورەکان، بەهۆی ئەوەی کە پێیوایە دەتوانێـت بـاس لـە بابەتەکـە بکـات و پێکهاتەکانی ئاشکرا بکات و چارەسە بۆ گرفتەکانی بدۆزێتەوە، توێـژەر لـەم حاڵەتانەدا وەك منداڵێکە لـە پەلەپـەلکردن و پەرۆشـی و بـێ ئۆقرەییەکـەی، یان بەهۆی وێناکردنی بۆ توانای خۆی لە ئەنجامدانی هـەموو شـتێك و بڕینـی هەموو بەربەستەکان. ئەم کارەش وادەکـات توێـژەر ڕوانگـە و بیرکردنـەوەی قوڵی نەبێت لـە کـاتی هەڵبـژاردنی گـرفتی توێژینـەوە، چـونکە سـەرکەوتن و شکسـتی کارەکـەی دەوەسـتێتە سـەر مـەودای سـەرکەوتنی لـە پرۆسـەی هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوەکەیدا.

دەستەواژەی گرفت وەرگێڕانی دەستەواژەی (problem)ـی ئینگلیزییە کە مانـای گرفـت یـان کێشـەو ئاریشـەو کۆسـپ و تەگـەرە دێـت([252])، چـەندین

---

252 ئێمە لە توێژینەوەی کۆمەڵناسیدا گرفتی توێینەوە بەکار بێنین ڕاستترە، نەك کێشەی توێژینەوە ،چونکە هەر زانستێك دەبێ چەمکی تایبەت بە خۆی هەبێت ،بە لای منەوە کێشە واتە (قضية) ئەمەش زیاتر چەمکێکی

پێناسە بۆ ئەم دەستەواژەیە کراوە لە توێژینـەوە کۆمەڵایەتییەکانـدا، مانـای ئـەو بابەتەیـە کـە تەمومـژ و نـاڕوونی لـە دەورەی هەیـە و پێویسـتی بـە شـرۆڤەکردن هەیـە، یـاخود پرسـێکە جێگـای گفتوگـۆ و جیاوازییـە، ڕۆبێـرت میرتـۆن و ڕۆبێـرت نیسـبەت پێناسـەی دەکـەن و دەڵێـت (شـێوەیەکە لـە دژپێکی دەرکپێکراو لەسەر ئەوەی کە هەیە، یـاخود لـەوەی کـە بـە بـاوەڕی خەڵکی دەبێت هەبێت، واتە لە واقیع و بەها و عـورفی کۆمەڵایـەتی، ئەمـەش دژ پێکێکە، باوەڕێکی وەها لە ئارادایە کە دەکرێت چارەسەر بکرێت[٢٥٣].

هەرچـی سـبکتۆر کیتسۆسـە(spectorand Kitsuse)، گـرفتی بـەوە پێناسەکردووە کـە پێچـەوانەی دەرککردنـی تاکەکانـە بـۆی، گرفت(کۆمـەڵێك چـالاکییە کـە تـاك و گروپـەکان ئـەنجامی دەدەن بـۆ ئـەوەی گوزارشـت لـە هەندێك سیمای ئازارەکانیان بکەن لەوەی کە پەیوەسـتە بـە بارودۆخێـك کـە پێیانوایە گرفتێکی کۆمەڵایەتییە)[٢٥٤].

جـۆن دیـوی[٢٥٥] پێیوایـە سەرچـاوەی گرفـت لـە هەسـتکردنەوە دێـت بـە ئاستەنگێکی دیاریکراو، ئەو هەستەش پەیوەستە بە هەڵوێستێکی ناڕوون کە تەحەدای بیرکردنـەوەی توێـژەر دەکـات و پـاڵی پێـوەدەنێ بـۆ کـارکردن لـە پێناو ئاشکراکردنی ئەو ناڕونییە، بوونی گرفت ئـەو پاڵنەرەیـە کـە وا دەکـات توێژینـەوە بکـات و توێـژەر پـاڵ پێوەدەنێـت کـار بکـات بـۆ دۆزینـەوەی

---

یاسایی و شەرعی و دادگاییە نەك توێژینەوەی کۆمەڵایەتی ،جگە لەوەی لە ڕووی زمانیشەوە کێشە بچوکترە لە گرفت وەکو لە چەندین گۆرانی و هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیدا هاتووە (م.ش)

253- Robert King Merton and Robert A Nisbet Contemporary Social Problem, New York, 1976, p40.

254- M Specter and J. I. Kitsuse Constructing Social Problems

255- John Dewy How we think 1933.

چارەسەرێك بۆ ئەو پرسە، لەمبارەیەوە جۆن دیوی دەڵێت (دەست دەکەین بە بیرکردنەوە بە دەرککردنی ئاستەنگێك، یان گرفتێك دەبێتە پاڵنەر و هاندەر، ئەمەش وا دەکات چارەسەرێکی پێشنیارکراو لە زیهنی کەسەکەدا دروست بێت، تەنیا لێرەدا عەقڵ دێتە سەرشانۆ بۆ ئەوەی بیرۆکەکە بپشکنێت، یاخود ئاوەژووی بکاتەوە، ئەگەر بیرۆکەکەی لە ریشە هەڵکێشا ئەوا زیهن دەگەرێتەوە بۆ قۆناغی پێشوویی و پرۆسەکە دووبارە دەبێتەوە، ئەو شتە گشتییەی کە پێویستە دەرکی پێ بکەین هێنانەئارای بیرۆکەیە، کە ئەمە: کارێك نییە بە ویستێکی مەبەستدارانە ئەنجام بدرێت، بەڵکو لە راستیدا شتێکە دەکەوێت، سەر شانمان زیاتر لەوەی کە ئەنجامی بدەین) (٢٥٦).

زۆرینەی پسپۆران پێیانوایە پرۆسەی دیاریکردنی گرفت دژاوری کەمتر نییە لە دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆی، بەڵکو ئاشکراکردنی گرفت دژوارەترە لە دۆزینەوەی چارەسەر بەپێی بۆچوونی داروین، دۆزینەوەی گرفت لە رووی هەڵبژاردنی، دیاریکردنی مەودا و گرنگترین پێکهاتەکانی بە یەکێك لە گرنگترین تەکنیکەکانی میتۆدی زانستی دادەنێت، ئەم کارەش زۆر یارمەتی توێژەر دەدات لە هەنگاوەکانی دیکەی، وەك دانانی گریمانە و دیاریکردنی میتۆد، کۆکردنەوەی داتا، هەموو ئەوانە دوای دیاریکردنی گرفتەکە ئەنجام دەدرێن.

داروین دەڵێت (تۆ پێت سەیر دەبێت چەندت ماوە خەرجکردووە لە دۆزینەوەی ئەوگرفتانەی کە پێویستە توێژینەوە، یان راڤەیان بکەیت، من کە یادەوەریم بۆ دواوە دەگەرێنمەوە دوای ئەوەی توێژینەوەکانم بە

256- John Dewy How we Think 1933.

سەرکەوتوویی ئەنجامدا دەبینیم کە دیاریکردنی گرفتەکان زۆر دژوارتـر بـووە لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان)[٢٥٧].

هەمان وێناش بۆ گرنگی دیاریکردنی ئیشکالییەت لـە پرۆسـەی توێژینـەوەی زانستی لای جۆن دیوی دەبینینەوە، کـە پێیوایـە دارشـتنی گرفـت وادەکـات هەموو رێکارەکـانی دیکـە زۆر ئاسـانتر بێـت، چـونکە دوای دانـانی گرفتێکـی روون ئینجا گریمانە و ئەزموونکردنی دێت[٢٥٨]. لەسەر توێژەر پێویستە پەلـە نەکات لە هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە و دارشتنی، بەڵکو لەسەری پێویسـتە توێژینەوەیەکی سەرەتایی ئـەنجام بـدات لـە بـارەی بابـەتی توێژینەوەکـەی، لەنێویشیاندا خوێندنەوەی توێژینەوە پێشوو لە بارەی هەمان گرفـت، یـاخود ئەگەر لێی نزیك بێت و پەیوەندی بە بابەتی توێژینەوەکـەی هـەبێت، چـونکە دیـاریکردنی گـرفتی توێژینـــەوە بـــێ ئاگـاداربوونێکی گشـتگیر لـە بابـەتی توێژینەوەکـە توێـژەر ناچـار دەکـات دوای ماوەیـەك گرفتـی توێژینەوەکـەی بگۆرێت، یاخود ناچار دەبێت زیاتر لە جارێك بیگۆرێت.

گرفـت رەفتـارێکی دووبـارەبووەی مرۆڤـە و بەرهـەمی هەسـتکردنییەتی بـە نارەزایی لە تاکەکانی کۆمەڵگا بەهۆی پێچەوانەیی لەگەڵ شێوازی کولتـووری رەفتـاری بـاو لـە کۆمـەلگادا، یـان هـەر دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی دەبێتـە گرفتێکی کۆمەڵایەتی ئەوکاتەی هەستکردن بە نـارەزایی لـە بارەیـەوە لـەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا بڵاودەبێتەوە.

---

[٢٥٧]- بڕوانە: احمد زايد (نحو سوسيولوجيا نقدية لدراسة المشكلات الاجتماعية)، بيروت، مجلة المستقبل العربي، عدد ١٤٦، ابريل ١٩٩١، لا ١٥٦.

[٢٥٨]- وەرطيراوة لة عبدالباسط محمد حسن، سەرضاوەى ثيشوو، لا ١٥٦.

گرفتی کۆمەڵایەتی جۆرێکە لە کەموکوڕی و گرژی لە کۆمەڵگا، کاریگەری لەسەر هاوسەنگی دەبێت و دەبێتە بەربەست لە بەردەم دەستەبەرکردنی ئامانجەکان، ئەو گرفتە کۆمەڵایەتییە، یان نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی، یاخود خراپی ڕێکخستن، یاخود ڕەنگدانەوەی کەموکورییەکە لە ئەدای ئەرکگەری، بەڵام بۆ ئەوەی دیاردەی کۆمەڵایەتی ببێتە گرفتێکی کۆمەڵایەتی دەبێت دەرککردنی تاکەکانی کۆمەڵگا یان بەشێك لێی هەبێت بەوەی کە ئەمە گرفتەکەیە، واتە بوونی کەموکورییەك یاخود نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی، گرفتی کۆمەڵایەتی هیچ مانایەکی نابێت ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگا، یاخود کەرتێك لێیان هەست بە بوونی نەکات، کەواتە گرفت ناناسرێت تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە تاکەکان هەستی پێدەکەن، لەگەڵ ئەو چالاکییانەی کە لەهەمبەری ئەنجامی دەدەن، بەڵام چەند کەسێك هەن پێچەوانەی ئەو بۆچوونەن، بەوەی کە دەڵێن بوونی گرفت لە پێش دەرککردنی تاکەکانە، ئەم گرفتە بوونی هەیە تەنانەت پێش دەرککردنی ئەو کەسانەش[٢٥٩].

هەموو ئەو ئاراستە تیۆرییانەی کە بایەخ بە گرفتە کۆمەڵایەتییەکان دەدەن، کۆکن لەسەر ئەوەی کە گرفت بە سێ قۆناغ تێدەپەڕێت، ئەوانەش:

١. سەرهەڵدانی پێناسەکردنی گرفت.

٢. سەرهەڵدانی هەندێك شێوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا، هەروەها سەرهەڵدانی بۆچوونی ئەلتەرناتیف و جیاواز لەبارەیەوە.

---

٢٥٩- بگەڕێوە بۆ: کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٤.

٣. قۆناغی ونبون، یاخود دامەزراندنی سیستماتیکی گرفت، مەبەست لێی داننانە بە بوونی گرفت و ژیان لەگەڵی و جێگیرکردنی سیستەمی جیاواز لە کۆمەڵگا بۆ چارەسەرکردنی، یاخود کەمکردنەوەی کاریگەری و قورساییەکەی.

لە نموونەی ئەو گرفتانەی کە ڕێگای خۆیان دۆزییەوە بۆ ئەوەی بە سیستماتیکی بن، لادانی نەوجەوانان ، تاوان، نەخۆشی عەقڵی، ئەو قۆناغانەش دەوەستنە سەر گریمانەکردنی ئەوەی کۆمەڵگا دەتوانێت دەرك بە گرفتەکانی بکات، مامەڵە، یاخود کۆنترۆڵیان بکات.

تایبەتمەندییەکانی گرفتی کۆمەڵایەتی تەنیا لە خەسڵەتە بابەتییەکانیدا سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لەو شێوازەی کە لە لایەنی خەڵکان و بەرپرسانەوە دەخرێتەروو، بەمەش خەسڵەتەکانی گرفتی کۆمەڵایەتی لە دروستبونیدا دەچێتە ژێر کاریگەری چەند پێودانگێك:

١. ئاستی ئەو درامایەی کە دەخرێتە سەر گرفتەکە، هەر درامایە زیندوو یەتی دەداتە گرفتەکە هەروەها هەندێك جار قەبارەیەکی لە خۆی گەورەتریشی پێ دەبەخشێت.

٢. نوێکردنەوەی نمایشکردنەوەی گرفتەکە، دۆزینەوەی شێوازی تازە هەرجارێك کە گرفتەکە دەخرێتە ڕوو وادەکات دوور بێت لە درێژەدادڕی، وەهاش بۆ خەڵك دەردەخات کە گرفتەکە تازەیە.

٣. دووبارە قسەکردنەوە لەبارەی گرفتەکان، هەموو جارێکیش پێویستە قسەکردن لە بارەیەوە ببەسترێتەوە بە ڕەمزێکی دیاریکراو، یاخود بە وتە، یاخود بارودۆخێکی تایبەت.

٤. هەستیاری ئەو بابەتەی کە گرفتەکە پەیوەندی پێیەوە هەیە.
٥. فرەیی و جۆراوجۆری شێوازە بەکارهاتووەکانی گوزارشتکردن لە گرفتەکە، ڕەنگە گرفتێك لە توێژینەوەیەك بخرێتە ڕوو، یاخود لە وتارێکی سیاسی، یاخود لە فیلمێکی سینەمایی، یاخود تەلەڤزیۆنی، یاخود لە میانەی چەند چیرۆکێك یاخود شعرێکەوە...هتد(٢٦٠).

## باسی دووەم
## هەڵبژاردنی گرفت و ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەرییان لە هەڵبژاردنیدا هەیە

پرۆسەی هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە بۆ توێژەر خۆی دەگەڕێتەوە، چونکە هەر ئەوە توێژینەوە دەکات و باشتر دەربارەی بابەتەکە دەزانێت لە ڕووی کات و توانای مامەڵەکردنی لەگەڵ زانیاری و کێشەکانی پرۆسەی توێژینەوە، بۆیە لەسەری پێویستە بەشێوەیەك گرفتی توێژینەوەکەی هەڵبژێرێت کە لەگەڵ مەیل و ئاراستەی بگونجێت، چونکە توێژەر لە بواری مەعریفە و ئارەزوو خۆی توێژینەوە دەکات و ئاگاداری شتە بچوکەکانییەتی، بەمشێوەیە مامەڵەکردن لەگەڵ توێژینەوەکەی باشتر دەبێت، زیاتر دەتوانێت باسی ئیشکالییەتی توێژینەوەی بکات و بەمپێیەش دەتوانێت چارەسەر و پێشنیار بدۆزێتەوە بۆ ئیشکالییەتی توێژینەوەکەی.

---
٢٦٠ ـ عبدالباسط محمد حسن، ام کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٨.

توێژەر بەرپرسیاری یەکەمە لەتوێژینەوەکەی ،بۆیە هەر خۆیشی دەبێ ئەو ئیشکالییەتە هەڵبژێرێت کە کاری لەسەر دەکات، لەم حاڵەتەدا دەتوانێت چەند ئیشکالییەتێك دابنرێت لەوانەی پێیوایە گونجاون بۆ توێژینەوە لەسەر کردن و بیخاتە بەردەم مامۆستا، یاخود لایەنی سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەی، یاخود بۆ پسپۆڕەکانی بابەتەکە، بۆ ئەوەی لەسەر یەکێکیان رێکەون، بەڵام هەندێك گرفتێك هەیە لە لایەن دەستەی گشتیەوە یان دەستەی تایبەتیەوە دیاری دەکرێن ، دوواتر چەند توێژەرێك ڕادەسپێرن بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لەبارەیانەوەلەسەریان.

خاڵی دەسپێك لە پڕۆسەی هەڵبژاردنی گرفت ئەوەیە کە ئەو گرفتە دەبێت بایەخی بۆ کۆمەڵگا یاخود بەشێکی هەبێت، تاوەکو سوود لەو کۆشش و کاتە وەربگرێت کە لە پڕۆسەی توێژینەوە خەرجکراوە، لەمبارەیەوە کانت لە کتێبی (خەونەکانی بۆچوونی تارماییەکان) دەڵێت ئەگەر عەقلمان ئازاد کرد بۆ هەموو ئارەزوویەك، ڕێگاماندا ئارەزووی توێژینەوەی ناومان ئازاد بێت، تا ئەو ئاستەی هیچ سنوورێکی نەمێنێت، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تێگەیشتن لە عەقڵ پێچەوانەی توێژینەوەی زانستی نییە، بەڵام ئەوە حیکمەت جیادەکاتەوە کە لە نێو ئەو گرفتانەی کە لەبەردەممانداییە ئەو گرفتە هەڵبژێرین کە بۆ مرۆڤایەتی گرنگە چارەسەرکردنی[٢٦١].

هەڵبژاردنی گرفتەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی پەیوەستن بە بارودۆخی کولتووری و سیاسی روون ، یان شاراوە، هەموو قۆناغێکی سیاسی و

---

[٢٦١]- کارل بوبر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٦.

ئابووری گرفتی تایبەتی خۆی هەیە، زۆرجاریش لە ڕووکەشدا ئەو گرفتانەی کە بەهۆی توێژینەوەی زانستی ئەکادیمی بەدەردەکەون ڕەنگدانەوەی هەقیقەتی گرفتی کۆمەڵایەتی نین کە لە نێو کۆمەڵگادا هەیە. بارودۆخی سیاسی و کولتووری ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دەرخستنی هەندێك گرفت و ونکردنی هەندێکی دیکەیان. سیستەمی سیاسی ئەو گرفتانە دەشارێتەوە کە لەگەڵ بەرژەوەندی و ئاراستەی خۆی ناگونجێت، ڕێگای بە توێژینەوەکردن و ئاشکراکردنی هۆکارەکانی و پێشنیارکردنی بۆ چارەسەرکردنیان نادات، ئەمەش لە هۆکارە سەرەکییە هەقیقیەکانی پەیوەستە بە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەتی لە جیهانی سێیەم، چونکە زانستی بێزارکارن و بەدوای هەقیقەتدا دەگەڕێن، ساختەیی واقیعی کۆمەڵایەتی دیار و نادیار ئاشکرا دەکەن.

گرفتی کۆمەڵایەتیش بە ئارەزووی خۆی دەرناکەوێت یان ونبێت و توێژەرە کۆمەڵایەتییەکانیش بەردەوام ناتوانن توێژینەوە لە بارەی ئەو کاروبارانە بکەن کە دەیانەوێت، بەڵکو کۆنتێکستی سیاسی و ئابووری ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە پرۆسەی سەرهەڵدانی گرفتی کۆمەڵایەتی و تیشکخستنەسەری، یاخود فەرامۆشکردنی، یاخود مامەڵەکردن لەگەڵی وەك ئەوەی نەبوبێت، ئەو دەردەکەوێت و ون دەبێت بەو پلەیەی کە کۆنتێکستی سیاسی و کولتوری باو ڕێگای پێدەدات، بۆ نموونە لەشفرۆشی و لادانی سێکسی لەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییانەن کە لە هەموو جیهاندا هەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخی ئایینی و سیاسی هەندێك گروپ ڕێگا نادات بە

شێوەیەکی زانستی توێژینەوە بکرێت ، ئەمە بۆ دیاردەی گەندەڵی سیاسی، یاخود توندڕەوی ئایینیش دروستە.

ئەو گرفتە کۆمەڵایەتییەی کە زۆر باس دەکرێت مەرج نییە گرنگترینیان یان مەترسیدارترینیان بێت، بەڵکو ئەو گرفتەیە کە سیستەمی باو ڕێگای توێژینەوەکردنی دەدات، کە شوێن و پێگەیەکی هەیە لەنێو گوتاری سیاسی و ئایدیۆلۆژی فەرمی و میللی باودا، بەشێوەیەکی گشتی سیستەم و خەڵك نایانەوێت گوێبیستی شتگەلێك بن کە ئارەزوویان لێ نییە.

هەروەها ئەو گرفتانەی کە زۆر بە دەگمەن بەدەردەکەون مەرج نییە گرنگی کەمتر بێت، بەڵکو کەم بەدەردەکەوێت، چونکە ناوچەیەکی تاپۆ کراوە و نابێت دەستی بۆ ببەین، دەستلێدانی ودەستکاریکردنی موقەدەسە، یاخود بەرژەوەندییەکانە، یاخود ڕەمزی باڵایە، ئەو کارەش هەندێك جار پەیوەستە بە بوێری توێژەر و مەودای بوونی دیموکراسی و ئازادی توێژینەوەی زانستی.

**ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەرییان هەیە لە هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە**

بەشێوەیەکی گشتی چەند فاکتەرێکی ئابووری و سیاسی و کولتووری کاریگەرییان هەیە لە هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوە، دەبێت توێژەر ئەو فاکتەرانە لەبەرچاو بگرێت، ئەوکاتەی بڕیار دەدات گرفتی توێژینەوەکەی هەڵبژێرێت، ئەو کارەش کۆشش و چەندین ئاستەنگی لە کۆڵدەکاتەوە کە دەکرێت ڕووبەڕووی ببێتەوە لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەی.

بۆ ئەوەی توێژەر دڵنیابێتەوە لە هەڵبژاردنی گرفتی توێژینەوەکەی، دەکرێت ئەو پرسیارانە لە بارەی گرفتی توێژینەوەکەیەوە بوروژێنێت:

**١. ئایا گرفتی توێژینەوەکەی شیاوی چارەسەرکردنە؟**

چونکە چەند گرفتێک هەیە ناتوانرێت چارەسەر بکرێت، وەک پرسە فەلسەفەیی و بەهاییەکان، کەواتە لەسەر توێژەر پێویستە لە سەرەتادا ئاگاداری گرفتی توێژینەوە و هەموو ڕەهەندەکانی بێت.

**٢. ئایا سەرچاوەی تەواو لە بارەی گرفتی توێژینەوەکەوە هەیە؟**

توێژەر بە تایبەتی ئەگەر خوێنکار بێت، دەرک بە هەموو شتەکان ناکات، بەڵکو چەندین فاکت و زانیاری دەوێت کە لای پسپۆڕ و توێژەرەکانی پێش ئەو هەیە لە بارەی ئەو بابەتە، بۆیە پێوستە دڵنابێتەوە لەسەر بوونی سەرچاوەی پێویست بۆ توێژینەوەکەی، ئەگینا لە توێژینەوەکەی بەرەو پێشەوە ناچێت و دەگاتە ڕێگایەکی داخراو، بە تایبەتی لە توێژینەوە تیۆرییەکاندا.

**٣. ئایا گرفتی توێژینەوەکە شایانی توێژینەوەکردنە؟**

تەنیا بوونی گرفتێک بەس نییە بۆ ئەوەی وەک بابەتێک بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی هەڵبژێرین، بەڵکو دەبێت ئەو گرفتە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، یان ئەکادیمی گرنگ بێت، توێژینەوەی زانستی ڕاستەقینە ئامانجێکی هەیە کە بریتییە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکی کۆمەڵگا، کەواتە لەسەر توێژەر پێوستە کە دڵنابێت گرفتەکە گرنگ و سەرنجراکێشە، ئەمە وای

لێدەکات بۆ توێژینەوەکەی گرفتێکی کۆمەڵایەتی هەڵبژێرێت کە جێگای بایەخی جەماوەر بێت، بۆ نموونە پرسی نیشتیمانی یاخود پرسگەلی جیهانی و ڕای گشتی جیهانی بە هێندیان دەزانێت. هەروەها لەسەر توێژەر پێوستە دڵنیا بێت لەوەی کە بابەت و گرفتی توێژینەوەکەی، نەبێتە هۆی (کوشتنی) توێژینەوەکەی، واتە هێشتا پێویستیان بە توێژینەوە هەبێت.

**٤. ئایادەکرێت بیێ شەرمەزاری ئەو گرفتە چارەسەر بکرێت؟**

چونکە هەندێك بابەت و پرس هەن کە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی وادەکات نەتوانێت بەشێوەیەکی زانستی بابەتی توێژینەوە بکرێت، هەندێك کۆمەڵگا چەند پرسێکی کۆمەڵایەتی بە تاپۆ دادەنێت و باسکردنی هەستارییەك لای جەماوەر دروستدەکات، یاخود پەیوەندی بە ئاکارەوە هەیە و نابێت لێی نزیك ببیتەوە، وەك پرسی لادانی سێکسی، یاخود لەشفرۆشی، یاخود هەندێك لایەنی ئاییني....

هەروەك چەند پرسێکی سیاسی هەن، بارودۆخی سیاسی ئەو وڵاتەی کە توێژەری لیێ دەژیت ڕێگا نادات بە ئازادانە توێژینەوەی بکات، بۆ نموونە: لە سیستەمی دیکتاتۆری و ڕەگەزپەرستەکان ناکرێت توێژەر بە ئازادی باسی پرسی دیموکراسی و مافی مرۆڤ بکات، یاخود توێژەر هەندێك پرس بوروژێنێت وەك پلورالیزمی حیزبی لە دەوڵەتێکدا سیستەمی تاك حیزبی هەبێت و لە بنەچەدا فرە حیزبی ڕەتبکاتەوە، یاخود توێژینەوە لە بارەی کاروبارێك بکات کە پەیوەستە بە کەسە فەرمانڕەوا، یاخود خاوەن دەسەڵاتەکانەوە.

### ٥. ئایا گرفتی توێژینەوەکە جێگای بایەخی توێژەرە؟

زۆر گرنگە توێژەر هەست بە گرنگی بابەت و گرفتی توێژینەوەکەی بکات، بیرکردنەوەی داگیر بکات و بۆ کارکردن پاڵی پێوەبنێت، نەك لەو کارانە بێت کە پێی ناخۆشە کاری تێدا بکات و بە دووری بزانێت لە بایەخدان و ئارەزووەکانی خۆی، هەرچەندە گرفتی توێژینەوە جێگای بایەخدانی توێژەرەکە بوو هێندە پرۆسەی توێژینەوەکە بۆ ئەو ئاسانتر دەبێت.

### ٦. ئایا توێژەر دەتوانێت توێژینەوەکە ئەنجام بدات؟

هەندێك هۆکاری پراکتیکی هەن دەبنە بەربەست بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکە لە کاتی خۆی، لەوانەش فاکتەری کات و تێچووی ماددی، زۆربەی جار توێژەر لێی داوا دەکرێت توێژینەوەکەی لە کاتی خۆی ئەنجام بدات، ئەگەر توێژینەوەکە فراوان و گرفتەکە قورس بێت، ناتوانێت لە کاتی دیاریکراو ئەنجامی بدات بە تایبەتی لە توێژینەوە مەیدانییەکاندا.

بۆیە پێوستە توێژەر بابەتێك هەڵبـژێرێ کە بکرێت لە کاتی خۆی تەواوی بکات، ئەمە بۆ تێچووی ماددیش ڕاستە، توێژەری سەربەخۆ، واتە ئەو کەسەی بۆ دەستەیەکی گشتی، یاخود تایبەتی کار ناکات، هەروەها خوێندکاریش، تواناکانی سنووردارن، بۆیە پێویستە گرفتێك بۆ توێژینەوە هەڵنەبژێرێت کە نەتوانێت ڕومالّی بکات، بۆ نموونە پێویستی بە هێنانی سەرچاوە هەبێت لە وڵاتی دیکە، یان چاوپێکەوتن ئەنجام بدات یان پرسیارنامەی وا دروست بکات لە رووی ئابووریەوە گران راوەستێت لەسەری.

## داڕشتنی گرفتی توێژینەوە

دوای ئەوەی توێژەر گرفتی توێژینەوەکەی دیاری دەکات و هەموو فاکتەرە کەسی و زانستی و کۆمەڵایەتییەکانی لەبەرچاو دەگرێت، گرفتی توێژینەوەکەی بە شێوەیەکی وردو روون دادەرێژێت ، کە یارمەتی دەدات بۆ توێژینەوەکردنی و شیکردنەوەی توخمە سەرەکی و ئەو چەمك و زاراوا زانستییانەی کە لەنێو ئیشکالیەتەکەدا هەن. زۆرجار گرفت لەسەر شێوەی پرسیار، یاخود چەند پرسیارێك دادەرێژرێت و توێژینەوەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو یان زیاتر دەکات، وەڵامی ئەو پرسیارەش مەبەستی توێژینەوەکەیە.

واباشترە دوای داڕشتنی گرفتەکە بخرێتە بەردەم مامۆستا، یاخود دەستەی سەرپەرشتیار بەسەر توێژینەوەکە، ، پێش ئەوەی توێژەر دەست بەکاری خۆی بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی کە سەرپەرشتیاری توێژینەوەکە ببینێت، تێبینی و سەرنجەکانی خۆی لەسەری دەربڕێت، بەشێوەیەك رون دابڕێژێت و سەرجەم لایەنەکانی گرفتەکە لە خۆبگرێت.

داڕشتنی راست بۆ گرفت دەبێت ئەو مەرجانەی خوارەوە تێدا هەبێت:

١. دەبێت بابەتە سەرەکییەکە هەڵبژێرێت.

٢. دەبێت خاڵە سەرەکییەکانی گرفتی توێژینەوە هەڵبـژێرێت لەگەڵ ئامارەدان بە خاڵە لاوەکییەکانیش.

٣. دەبێت ئەو فاکتەرانە روونبکاتەوە کە پاڵی پێوەناوە بۆ هەڵبـژاردنی ئـەو گرفتە، هەروەها ئامانجی توێژەریش لەم توێژینەوەیە دەستنیشان بکات.

٤. دەبێت توێژەر ئەوە دەربخات کە ئایا ئەو گرفتـە تازەیـە و کەسـی تـر لـە پێش ئەو باسی نەکردووە، ئەگەر ئەو یەکەم کەس نییە کە باسی دەکات ئەوا ئەو شتە تازەیە چییە کە دەیەوێت بیخاتە سەری؟ هـەروەها توێژینـەوەکانی تری پێشوو لەبارەی ئەو بابەتە چییە؟

٥. باسـکردنی ئـەو ئاسـتەنگانەی کـە توێـژەر پێشـبینی دەکـات دووچـاری بێتەوە لەکاتی توێژینەوەکەیدا، ئەگەر ترسی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی هـەبێت ئـەوا پێویسـتە ئامـاژەیـان بـۆ بکـات، ئەگـەر لـە کـەمی سەرچـاوە و زانیـاری دەترسێت ئەوا دەبێت ئەمەش روونبکاتەوە.

# بەشی سێیەم

# دیاریکردنی چەمکەکان و دانانی گریمانەی زانستی

دوای ئـەوەی توێـژەر گـرفتی توێژینــەوە و توخمــە سـەرەکییەکانی دیـاری دەکات، دەست دەکات بە دۆزینەوەی چارەسەر، ئەمەش بە پشت بەستن بە گریمانە و خەملاندن، کە پێی وایە بەهۆیانەوە دەگاتە چارەسـەری داواکـراو، بەڵام پێش دانانی گریمانە و ئەزموونکردنیان، لەسـەر توێـژەر پێویسـتە ئـەو چەمك و زاراوانە دیاری بکات کە بەکاریاندەهێنێت لە توێژینەوەکەی، ئەمەش هەنگاوێکی ئیجرائییانەی زۆر گرنگە.

## باسی یەکەم

## دیاریکردنی چەمکەکان

ئەگـەر ڕەمـز و زاراوەکـان لـە بـواری زانسـتە سروشـتییەکان بـە جـێگیری و دیارە·اوی و ڕوونی جیادەبنـەوە، ئـەم کـارە پێچـەوانەیە لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکاندا. زانستە کۆمەڵایەتییەکان تژییە بەو چەمك و زاراوانەی کـە جیـاوازن و پێناسـە و وێنـای زۆریـان پێدەبەخشـرێت بـە جیـاوازی پێگـەی ئایدیۆلۆژی و ڕێبازە سیاسی و قوتابخانە هزرییەکان، ڕەنگە یەك چەمك زیاتر لە پێناسەیەکی هەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبونی بشێوی و شڵەژان لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا.

چەمك كە بنەمای زمانی مامەڵەكردنی مرۆیی و كەرەستەیەكی مرۆڤە بۆ گوزارشتكردن لە بیروبۆچوون و حاڵەت و بارودۆخی دیاریكراو، گرنگییەكی زۆری هەیە لە پرۆسەی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی، لە رێگای ئەو دیاریكردنەوە توێژەر مەبەستی لەم چەمكە دیاری دەكات، چونكە زۆرێك لە چەمكەكان دەكرێت زیاتر لە مانایەكیان هەبێت و راڤەكردنی جیاواز هەڵبگرن، بۆ نموونە چەمكی وەك ئازادی و دیموكراسی و مافەكانی مرۆڤ، مانای ئەو چەمكانە لە كۆمەڵگایەكی دیموكراسی جیاوازە وەك لە كۆمەڵگایەكدا كە یەك حیزبی تێدایە و سیستەمەكەی دیكتاتۆرییەتە، چەمكی لەشفرۆشی لە كۆمەڵگا ئیسلامییەكان هەمان تێگەیشتنی نییە وەك لە كۆمەڵگا نا ئیسلامییەكان لێی تێدەگەن....هتد.

لە كۆنەوە ئیبن خەلدون ئاماژەی بە جیاوازی مانای چەمك كردووە لە نێوان زانایانی یەك زانستیشدا، ئەو ئەمە بە شتێكی ئاساییی دادەنێت، مادام زانست پیشەسازییە و دروستكەریش تیایدا زۆرن، دەڵێت (ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە فێركردنی زانست پیشەسازیە تیایدا زاراوەكان جیاوازن، بۆیە هەر پێشەوایەك لە پێشەوا بەناوبانگەكان چەمكێكی تایبەت بەخۆی لە فێركردندا هەیە، هەروەك هەموو پیشەكانی تر، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كەچەمك زانست نیە، ئەگەر زانست بوایە ئەوا یەك دەبوو لای هەمووان، ئایا نابینی لە زانستی كەلامدا چۆن چەمكەكان جیاوازن لە فێركردندا لە نێوان زانایانی پێشین ئەوانی دوواتر، بە هەمان شێوە لە بنەماكانی (فیقە) و لە زمانی عەرەبیشدا هەر وایە، هەروەها هەمو زانستێك رووودەكاتە (پێویستی بە) خوێندنەوە و بەدواداچوون هەیە، دەبینین چەمكەكان لە فێركردندا جیاوازن،

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمانە پێشەن لە فێرکردن و زانستدا یەك شتن لە ناوەرۆکدا)[٢٦٢].

فەرهەنگی ویستەر چەمك پێناسە دەکات بەوەی کە (دەستەواژەیەکی گشتییە و گوزارشتە لە کۆمەڵێك شتی بەیەکەوە گونجاو، هەروەك گوزارشتە لە ئەبستراکتبوونی واقیع، ڕێگا دەدات لە میانەیەوە گوزارشت لە واقیع بکەین). لە فەرهەنگی فەلسەفی عەرەبی بەمشێوەیە پێناسە کراوە، چەمك یەکخستنی جۆراوجۆرییە لە یەك بیرۆکە، ئەم پێناسەیەش بۆ کانت گەڕاوەتەوە[٢٦٣].

هەرچی پێناسەی زاراوەیی چەمکەکەیە، بریتییە لە کۆمەڵێك گشتاندن کە پێی گەیشتن و لە چەند حاڵەت و هەڵوێستێکی تاکی هاوشێوە و جۆراوجۆر، بۆیە چەمکی پەیوەندی نێوان وشە، یاخود کۆمەڵێك وشەیە لەگەڵ بیرۆکە، یاخود وێنایەك، ئەو بەستانەوەش وامان لێدەکات جۆرێك لە مانا بە جیهانی دەوروبەرمان ببەخشین، هەرچەندە چەمك لای مرۆڤ زیادبوو، مەعریفەی لە بارەی جیهان زۆرتر دەبێت، لەگەڵ ئاماژەدان بە وەی کە جۆری چەمکەکان ڕەنگدانەوەی جۆری مەعریفەیە، هەرچی بەکارهێنانی چەمکی سادەیە، ئەوا گوزارشتە لە کەمی مەعریفە و لاوازی ئاستی زانستی، لێرەوەیە چەمك بە کلیلی زانست و مەعریفەکان دادەنرێت.

٢٦٢ - ابن خلدون، مقدمة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٧٠_٧٧١.

٢٦٣ - الموسوعة الفلسفية العربية، رئيس التحرير، معن زيادة، معهد الانماء العربي، بيروت، ١٩٨٦، لا ٧٧٠.

کەواتە چەمك گوزارشتە لە شتێکی بە یەکەوە گونجاو، بێ ئەوەی مانای یەك شت بێت، چەمك گوزارشتە لە وەسفێکی ئەبستراکت بۆ واقیعە بەرهەستەکان، بەڵام قسە لەسەر یەك واقیع ناکات، بۆ نموونە ئەوکاتەی قسە لەسەر سیستەمێکی سیاسی دەکەین، مەبەستمان سیستەمێکی سیاسییە بێ دیاریکردن، ئینجا ئەمە سیستمی سەرۆکایەتی، یاخود نوێنەرایەتی، یاخود پاشایەتی، یاخو دیموکراسی، یاخود دیکتاتۆری دادپەروەر یاخود ستەمکاربێت؟ چەمکی سیستەمی سیاسی لەگەڵ ئەوەی کە ڕێکەوتنێك هەیە لەسەر مانا گشتییەکەی، کەچی هەموو کەسێك وێناکردنێکی لە زیهنی خۆی هەیە لە بارەی شێوەی ئەو سیستەمە سیاسییەیە، بۆیە ئەگەر توێژەر ئەو مانایە دیاری نەکات کە ئەو چەمکەی بۆ بەکاردەهێنێت، شڵەژانێك لای خوێنەر دروستدەکات و کاریگەری دەبێت لەسەر پرۆسەی توێژینەوە بە تەواوی، هەروەها ئەگەر توێژەر بیەوێت توێژینەوەی لە بارەی بابەتی (ڕۆشنبیران و وەرچەرخەرخانە کۆمەڵایەتییەکان لە جیهانی عەرەبی) بکات، لەسەری پێویستە مەبەستی لە ڕۆشنبیران دیاری بکات، ئایا ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە دەزانێت بنووسێت و بخوێنێتەوە؟ ئەو ڕاڤەکردنە بۆ چەمکی ڕۆشنبیر زۆر بەرفراوانە، چونکە ڕەنگە ٧٠٪ ی ژمارەی دانیشتوانی هەندێك کۆمەڵگا بگرێتەوە، یاخود ئایا ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە هەڵگری بڕوانامەیەکی زانکۆییە؟ یان ئایا ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە بەشداری دەکات لە بەرهەمهێنانی کولتووری کۆمەڵگا؟ دواتر دەبێت توێژەر مەبەستی خۆی لە پرۆسەی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی دیاری بکات، ئایا مەبەست گۆڕانی کۆمەڵایەتی

چاکسازییە لە نێو ڕێسا شەرعییە هەبووەکان؟ یان مەبەستی شۆڕشی توندوتیژە لە کۆمەڵگادا؟

هەمان شت ئەوکاتەش ڕاستە کە توێژەر دەیەوێت توێژینەوەی لە بارەی (لادانی نەوجەوانان و پەیوەندی بە پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیبوون) بکات، لەسەر توێژەر پێویستە مەبەستی خۆی لە لادان دیاری بکات؟ ئایا ئەو مومارەسە و کارانە چین کە دەچنە نێو چەمکی لادان؟ ئایا یاسا ڕەفتاری لادان سزا دەدات، یاخود ئەو ڕەفتارە سزا دەدات کە دژێکە لەگەڵ سیستەم و ئەخلاقی گشتی؟...هتد

هەروەها لەسەر توێژەر پێویستە مانای نەوجەوانان دیاری بکات؟ ئایا نەوجەوان ئەو کەسەیە کە تەمەنی کەمترە لە تەمەنی پێگەیشتویی؟ یان ئەو کەسەیە کە تەمەنی لە دوانزە ساڵ کەمترە...هتد؟ هەروەها پێویستە چەمکی بەکۆمەڵایەتیبونیش دیاری بکات.

لەم هەنگاوەدا توێژەر لە حاڵەتی ئەبستراکتی تیۆری گشتی دەچێتە نێو حاڵەتی ئیجرائی، دەکرێت ڕەهەندەکانی واقیع بپێوێت لە کاتی دیاریکردن و ڕاڤەکردنی ئەو چەمکانەی کە لە توێژینەوەکەیدا بەکاریان دەهێنێت، هەروەها لەسەری پێویستە کورتبڕ بێت بێ ئەوەی ماناکە بشێوێنێت، دەبێت مانا، یاخود ڕاڤەکردنەکە بە وردی و بەروونی گوزارشت بێت لە چەمکەکە. هەروەها لەسەر توێژەر پێویستە بەشێوەیەکی بونیادی پێناسەی ئەو چەمکە بکات، ئەمەش بە جیاوازی خەسڵەت بونیادیی و پێکهاتەییەکانی چەمك و ئەو توخمانەی کە لێی پێکدێت، یاخود بەشێوەیەکی ئەرکگەری پێناسەی بکات، بە دەرخستنی ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەی کە ئەم چەمکە دەینوێنێت.

لەسەر توێژەر پێویستە مانا جیاوازەکانی چەمکەکە دیاری بکات، ئەگەر زیاتر لە مانایەکی هەبوو، یان مانایەکە بە ڕۆیشتنی کات بگۆڕێت، ئەمەش خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی چەمکە کۆمەڵایەتییەکان کە ڕەنگدانەوەی ڕەفتار و دیاردەی کۆمەڵایەتیین، کە ئەوانیش لە ماوەیەکی بۆ ماوەیەکی دیکە دەگۆڕێن، چونکە ڕەفتاری مرۆیی بە سروشتی خۆی بەخێرایی دەگۆڕێت و پەرەدەستێنێت. هەروەها دەبێت چەمکی بەکارهاتوو پەیوەست بێت بەو پێناسانەی کە لەپێشودا و لە لایەن توێژەری دیکە بۆ ئەو چەمکە بەکارهاتووە، چەند تێبینییەك خراوەتە ڕوو کە یارمەتی توێژەر دەدات بۆ گەیشتن بە دیاریکردنێکی ورد بۆ ئەو چەمکانەی کە لە توێژینەوەکەیدا بەکاری دەهێنێت، گرنگترینیان:

١. گەڕانەوە بۆ پێناسەکانی پێشوو و ئێستای چەمکەکە.

٢. جیاکردنەوەی توخمە هاوبەشەکان و ڕێکەوتن لەسەرکراوەکان لە زۆرینەی پێناسەکان.

٣. دارشتنی پێناسەیەکی سەرەتایی کە ئەو مانایە لە خۆدەگرێت، خاڵێکی هاوبەشیشە لە نێو زۆرینەی پێناسەکانی پێشوودا.

٤. ملکەچکردنی پێناسە دانراوەکە بۆ ڕەخنەی توند بۆ دڵنیابوونەوە لە ڕاستی و وردییەکەی.

٥. ئەنجامدانی هەموارکردنی کۆتایی بۆ پێناسە تازەکە بە پشت بە ستن بەو ڕەخنانەی کە ئاڕاستەی کراوە.

ستیوارت دۆد بە پێشڕەوە سەرەتاکان دادەنرێت لەوانەی کە دەستەواژەی پێناسە ئیجرائییەکانی بەکارهێناوە، پێناسەی ئیجرائی پێناسەکردووە

بەوەی کە گوزارشتکردنە لە دیاردەیەك بە ڕوونی یان لە کارڕاییەك ، دەکرێت لە ڕاستییەکەی بکۆڵرێتەوە ، بەهۆی سەختی ڕێکەوتن لەسەر چەمك، یاخود پێناسەیەکی یەکگرتوو لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ،لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا پێناسە ئیجرائییەکان بەکاردەهێنرێت.

## باسی دووەم:
## دانانی گریمانەی زانستی

### أ. پێناسەکردنی گریمانە زانستییەکان

گریمانە بە یەکەم هەنگاو دادەنرێت لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو گرفتەی توێژەر بە نیازە توێژینەوەی لەسەر بکات . گریمانەکان چارەسەری پێشنیارکراون بۆ گرفتەکە، توێژەر لەسەر شێوەی گشتاندن، یاخود پێشنیار دایاندەنێت و لە میانەیەوە دەیەوێت حاڵەت و ڕووداوەکان ڕاڤە بکات کە لە ڕێگای هەقیقەتەکانەوە دڵنیایی لێنەکراوەتەوە. زۆرجار توێژەر کاری خۆی بە خەملاندن و خەیاڵکردن دەستپێدەکات، لێرەدا مەبەستمان لە خەملاندنی سادە و خەیاڵی نییە، بەڵکو پرۆسەی بیرکرنەوەی چڕە لە بارەی گرفتی توێژینەوەکەوە، کە پشت بە واقیع دەبەستێت و بەدوای هەقیقەتەکاندا دەگەڕێت.

بۆ نموونە ئەگەر گلۆپی کارەبایی لە ماڵەوە کوژایەوە، کەسەکە دەست دەکات بە خەملاندنی هۆکاری ئەو کوژانەوەیە، بەمەش گریمانە دادەنێت،

گریمانـەی ئـەوە دەکـات کـە گلۆپەکـە سـوتابێت، یـاخود تـەزووی کارەبـا پچڕابێت، یـاخود کەموکورییـەك هـەبێت لـە گەیانـدنی کارەبـا ...هتـد، ئـەو دەخەملێنێت بێئەوەی بڕیارێك بدات لە بارەی بابەتەکە، بۆیە بەدوای هۆکارە سـەرەکییەکەی کەموکورییەکـەدا دەگـەڕێت، بەمـەش دەسـتدەکات بـە ئەزموونکردنی گریمانەیەك لە گریمانەکانی تاوەکو بە هەقیقەت دەگات.

بە هەمان شێوە لـە بـارەی توێـژەرێکی کۆمەڵایەتیشـەوە کاتێـك ڕووبـەڕووی گرفتێـك دەبێتـەوە، وەك بـەرزی ڕێـژەی ئامادەنـەبووان لـە دامەزراوەیـەکی گشـتیدا، توێـژەر دەسـت دەکـات بـە خەملانـدن و گریمانـەی سـەرەتایی دادەنێت، گریمانەی ئەوە دەکات کـە هۆکارەکـە کـەمی کرێـی کرێکارەکانـە، یاخود خراپی کارگێڕی و ستەمی بەرپرسانە، یاخود فەرامۆشی دامەزراوەیـە، یاخود هاندانی کرێکارانـە بـۆ ئامادەنـەبوون لـە لایەنێکەوە...هتـد، بـەڵام لـە سەرەتادا ناتوانێت باس لە هۆکارە ڕاستەقینەکە بکـات، لەسـەری پێویسـتە هەموو گریمانەکان تاقی بکاتەوە تاوەکو دەگاتـە ئـەنجامێکی دڵنیـا بـەخش، ڕەنگە هۆکارەکە لە نائامادەبوونی یەکێك لەو گریمانانە، یان هەندێکیان یـان هەموویان بێت.

وشەی گریمانە وەرگێڕانی وشەی (Hypothesis)ـی ئینگلیزییە، کە مانای (شتێکی کەمترە لە تێز)، یاخود گریمانەیەکە و هێشتا دڵنیا نین لێی، بریتیـە لـە بۆچـوونێکی پـێش تیـۆر، توێـژەر کـار بـۆ دڵنیـایی بونـەوە لـە ڕاسـتی گریمانەکـە دەکـات ، یـاخود ڕەتکردنـەوەی، ئەگـەر ڕاسـتی ئـەو گریمانەیـە

دەرچوو دوای ئەوەی توێژەر زانیاری و داتا کۆدەکاتەوە لە مەیدان و شیاندەکاتەوە، گریمانەکە دەبێتە تیۆر، بەڵام ئەگەر توێژینەوە و داتای کۆکراوە ناڕاستی گریمانەکەیان سەلماند، ئەوا ئەو گریمانەیە دەکەوێت و گریمانەی دیکە تەبەنی دەکرێت.

کەواتە گریمانە خەملاندنە، یاخود کۆمەڵێك بیرۆکەیە توێژەر بەشێوەیەك کاتی دایدەنێت و پەیوەستە بە بابەتی توێژینەوەکەی، یەکێك لە لایەنەکانی بابەتەکە دەبەستێتەوە بە هۆکارێك یان سەرچاوەکەی، واتە بیرۆکەیەکی سەرەتاییە و دوو گۆڕاو بە یەکەوە دەبەستێتەوە و یەکێکیان سەربەخۆ و ئەویتریان پاشکۆیە. کێرلنگەر پێناسەی دەکات و دەڵێت (گوزارشتێکی خەملاندنییە لە بارەی پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو یان زیاتر، هەرچی لە بارەی ئەرکی گریمانەیە لە میتۆدی زانستی، میداوەر پۆلێنی دەکات و دەڵێت (هەموو دەستکەوتێکی مەعریفەی زانستییە، (لەسەر هەموو ئاستەکان)، بە ریسکی تێڕامانی دەستپێدەکات، لە ڕێگای پێشبینیکردنی ئەوەی کە ڕەنگە ڕاست بێت، ئەو پێشبینکردنەشە، ئەگەری ڕاستییەکە زۆر بچووکە، هەندێکجاریش گەورەیە. ئەو پێشبینیکردنە داهێنانێکی توێژەرە بۆ جیهانێکی گریمانەیی، یاخود بەشێکی بچووکە لەم جیهانە، دواتر ئەو خەملاندنە دەچێتە ژێر ڕەخنە، تاوەکو ئەوەمان بۆ ئاشکرا بێت کە ئەو جیهانەی خەیاڵمان کردووە هاوشێوەیە لەگەڵ جیهانی ڕاستەقینە یان نا، دەڵێین بیرکردنەوەی زانستەی بەردەوام (لەسەر هەموو ئاستەکان) گوزارشتە لە پرۆسەیەکی کارلێکی لە نێوان دوو جۆر لە هزر، ئەمە گفتوگۆیە لە نێوان

دوو دەنگ: یەکێکیان خەیاڵکراوە و ئەویتریان ڕەخنەییە، گفتوگۆیە لە نێوان هەقیقەت و گریمانە، پێشنیار و ڕەتکردنەوە، خەملاندن و ڕەخنە، لە نێوان ئەوەی کە دەکرێت ڕاست بێت یان ئەوەی کە بە کردەیی ڕاستە.

ئەو پێناسەیە بۆ گریمانە لە لایەن توێژەر بەوەی کە هەقیقەتێکە، بەڵام هێشتا لێی دڵنیا نییە، لە لایەن ولیام و سمیسەوە باسکراوە، بەشێوەیەك پێناسەی دەکەن و پێیانوایە، ئەوەی توێژەر بە ڕاستەقینەی دادەنێت، بەڵام بەڵگەی تەواو نییە لە پێناو دڵنیابوون لێی، بۆیە پەنا بۆ توێژینەوە دەبات بۆ دڵنیابون لە ڕاستییەکەی[٢٦٤].

لە هەمان ئاڕاستە ناجل [٢٦٥] پێیوایە ناکرێت هیچ هەنگاوێك لە توێژینەوە دەست پێبکەین بێئەوەی دەست بکەین بە ڕاڤەکردن یاخود چارەسەرێکی پێشبینیکراو بۆ بابەتی توێژینەوە. ڕەنگە ئەو ڕاڤەکردنە دابنرێت بە پشت بەستن بە شارەزایی پێشوو، یاخود ئەو ماددەیەی کە لە بابەتی توێژینەوە دەنووسرێت، لە کاتی دروستبوونی ئەو ڕاڤەکردنە ناوی گریمانەی لێ دەنێین[٢٦٦].

---

٢٦٤- لویس کوهن، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٨.

سەرچاوە ڕەسەنەکەش ئەمەیە:

Medawar P. B the hope of Progress (Methuen London, 1972).

265- William Reid and indrey D. Smith Research in social work (New York, coloumbia university press 1951 p 48).

٢٦٦- احمد زكي و السيد ياسين، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣١.

باشتروایە توێژەر چەند گریمانەیەك دابنێت و دەست بکات بە ئـەزموونکردنی هەموو گریمانەکان بە جیاجیا، تاوەکو لەسـەر یـەك گریمانـە دەوەسـتێت بـۆ ڕاڤـەکردنی دیـاردە، یـاخود کێشـە، ئەمـەش دەبێتـە ئـەنجامی کۆتـایی، مەترسیدارترین شت کە ڕووبەڕووی توێژەر دەبێتەوە ئەوەیە، کە دەسـت بـە گریمانەیەکـەوە بگرێـت، ئـەزموون و شـیکردنەوەی زانیارییـەکان ناراسـتییان سەلماند بێت. لەسەر توێژەر پێویستە دەسـتنەگرێت بـە گریمانـەی (مـردوو) کە خـۆی لـە بـەردەم هەقیقـەت ڕاناگرێـت، تـەنیا لەبـەر ئـەوەی کـە توێـژەر باوەڕی بە ڕاستی ئەمە هەیە، یاخود خزمـەتی ئـارەزووێکی توێـژەر دەکـات. لەوەی پێشوو دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کـە گریمانـە دوو ئـەرکی سـەرەکی هەیە ئەوانیش:

١. پێشنیارکردنی ڕاڤەکردن بۆ هەقیقەتگەلێکی دیاریکراو.
٢. توێـژەر ئاڕاسـتە دەکـات بـەرەو جەوهـەری گرفتەکـە بێئـەوەی ونبێـت و خەریکی چەند شتێك بێت کە پەیوەندی نییە بە بابەتی توێژینەوەکـەی، بـەو مانایەی کە کۆششی توێژەر ڕێکدەخات و ئاڕاستەی دەکات.

### ب. سەرچاوەکانی گریمانە زانستییەکان

دانانی گریمانە زانسـتییەکان کـارێکی ئاسـان نییـە، ئـەم کـارە پێویسـتی بـە کارامەیی هەیە و دەبێـت توێـژەر ئاگـاردار بێـت، توانـای دیاریکردنیـانی ئـەو سەرچـاوانەی هــەبێت کــە یارمــەتی دەدات لــە دانــانی گریمانــەکانی، لــەو سەرچاوانەش:

١. مەعریفەیەكی فراوان: لە ئەنجامی خوێندنەوە و ئاگاداربوونی توێژەر لەو بوارەی توێژینەوەی دەكات، هەرچەندە توێژەر زیاتر ئاگاداری مەیدانی توێژینەوەكەی بێت هێندە توانای زیاتر دەبێت لە دروستكرنی گریمانە ڕاستەكانی.

٢. ئەو توێژینەوانەی پێشووتر كە پەیوەستن بە هەمان بابەت، ئەمەش سەرچاوەیەكی گرنگە بۆ گریمانەكان، توێژەرەكانی پێشوو گریمانەیان داناوە بۆ توێژینەوەكانیان و هەندێكیان دوپاتكردۆتەوە و هی دیكەیان ریشەكێش كردووە، هەروەك ئەنجامەكانی توێژینەوەی پێشوو دەكرێت گریمانەگەلێك بن بۆ توێژینەوە تازەكان، یاخود ئاسۆی تازە دەكاتەوە لە بەردەم گریمانەی تازە.

٣. كولتووری كۆمەڵگا، وەك بەها و ئاڕاستە و نەریت و بۆچوونەكان، هەموو ئەوانە چەندین بوار دروستدەكەن بۆ دانانی گریمانە و هەوڵدان بۆ سەلماندنی ڕاستییەكەی.

٤. شارەزایی كەسایەتی توێژەر و بەرفراوانی خەیاڵی، گریمانەكان بە پرۆسەی خەملاندن دەسپێدەكەن، هەرچەندە زیرەكی توێژەر زیادی كرد و زیهنێكی بە پیتی هەبێت، ئەوا خەملاندنەكەی ڕاستتر دەردەچێت، بە گریمانەی گرنگ دەگات. هەروەك شارەزایی كەسایەتی توێژەر یارمەتیدەرە لە خۆدوورگرتن لە كەوتنە ناوپێچوپەنای بێ هیواكەر، شارەزایی كەسایەتی مەعریفەیەكی دڵنیایە بۆ خاوەنەكەی، وای لێدەكات لە هەموو هەنگاوەكانی دڵنیا بێت لە پرۆسەی توێژینەوە. هەروەك كۆبونەوەی شارەزایی كەسی

لەگەڵ فراوانی خەیاڵی وا لە توێژەر دەکات زیاتر بتوانێت خۆی لە هزرەکانی پێشوو و تیۆرە هەبووەکان ڕزگار بکات.

ت. مەرجەکانی گریمانە زانستییەکان

چەندین مەرج هەن دەبێت بونیان هەبێت لە کاتی دانای گریمانەکان، تاوەکو گریمانەکان بە مانای وشە زانستی بن، ئەم مەرجانەش ئەوانەن:

١. ڕوونی ئەو زاراوە و توخمانەی کە گریمانەی لێ دروست دەبێت، بەشێوەیەك تەنیا مانای مەبەستداری هەبێت ئەمەش پێویستی بە پێناسەیەکی ئیجرائی هەیە ئەگەر بکرێت.
٢. دەبێت بە کورتی گریمانەکان دابڕێژرێت، دەبێت لەسەر شێوەی پرسگەلێکی ڕوون دابڕێژرێت کە بکرێت لە ڕاستییەکەی دڵنیابینەوە، ئەمەش ئەوە بەسەر توێژەر دەسەپێنێت ئەو پێوەر و ئامرازانە دیاری بکات کە بە کاری دەهێنێت بۆ دڵنیابوونەوە لە ڕاستی گریمانەکان.
٣. دەبێت گریمانەکان لەسەر شێوەی بەڵگاندن دابڕێژرێت، یان لەسەر شێوەیەك بێت توێژینەوە دەری بخات، یاخود چەند پرسیارێك بێت داتا کۆکراوەکان دووپاتی بکەنەوە یان بە پۆزەتیڤ یان بە نێگەتیڤ.
٤. دەبێت گریمانەکان شیاوی ئەزموونکردن بن، گریمانە فەلسەفی و ئەخلاقییەکان و حوکمە بەهاییەکان دژوارە ئەگەر مەحاڵ نەبێت ئەزموون بکرێت بە هۆی نەتوانینی ملکەچکردنی بۆ ئەزموون، بۆیە لە کاتی داڕشتنی

گریمانەکان دەبێت ئەو ئامراز و کەرەستانە لەبەرچاو بگیرێت کە دەکرێت بەهۆیانەوە ئەو گریمانانە بپێورێت.

٥. دەبێت گریمانە بەتاڵ بێت لە دژیێکی، چونکە بوونی هزری دژیێك لە گریمانەکان وادەکات توێژینەوەکە ئاڵۆز بێت، هزرە دژەکان یەکتر دەرووخێنن.

٦. دەبێت گریمانە مەعقوڵ بێت، بەو مانایەی کە ئەو پەیوەندییەی لە نێوان دوو دیاردە دروستی دەکات (گۆڕاو و چەسپاو)، دەبێت ڕوودانی مومکین بێت بۆ نموونە ناکرێت توێژەر گریمانە بکات کە بەرزبونەوەی ڕێژەی لە دایکبوونی نێر پەیوەست بێت بە ڕۆشنبیری ئافرەت.

٧. بەستنەوەی گریمانە دانراوەکان وئەو گریمانەی یان ئەو تیۆرییانەی کە پێشووتردا پێی گەیشتووین، مەعقوڵ نییە توێژەر گریمانەگەلێك دابڕێژێت بێ ئەوەی بۆ گریمانە و تیۆرەکانی پێشوتر بگەڕێتەوە، چونکە مەعریفەی زانستی لە ئەنجامی کەڵەکەبوون و گەیاندنی مەعریفی دروست دەبێت.

٨. دانانی کۆمەڵێك گریمانەی ئەگەری لە جیاتی یەك گریمانە، بەو مەرجەی کە گریمانەکە بکرێت بپشکنرێت و شیبکرێتەوە و ئەنجامی لێ بەدەستبهێنرێت.

# بەشی چوارەم
# نموونە، یان نموونە هەڵبژاردن
## باسی یەکەم
## پێناسەکردنی نموونە و مەرجە زانستییەکانی

ئامانجی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی بریتییە لە ئاشنابوون بە کۆمەڵگا و گرفتەکانی، هەروەها دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو گرفتانە، مەعریفەی تیۆری لە بارەی واقیع و هەقیقەتی کۆمەڵگا ئاشکرا دەکات، کە نەزانراوە، بەڵام توێژەری کۆمەڵایەتی مەیدانی لە کاتی باسکردنی بابەت و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانێت پەیوەندی بکات بە تەواوی تاك و یەکەکانی کۆمەڵگا، ئەمەش بەهۆی زۆری ژمارەی یەکەکانی کۆمەڵگای لێتوێژراو و زۆری تێچوو و دژواری پەیوەندی کردن، کە پاڵ بە توێژەرەکان دەنێت بۆ نموونە هەڵبژاردن، واتە هەڵبژاردنی نموونە لەو کۆمەڵگایەی کە توێژینەوە دەکرێت، لەم نموونەیە ڕەچاوی ئەوە دەکرێت کە نوێنەرێکی دروستی کۆمەڵگای لێتوێژراو بێت، کە پرۆسەی توێژینەوەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، دواتر ئەنجامەکانی توێژینەوکەی بەسەر تەواوی یەکەکەکانی کۆمەڵگا، یاخود بەسەر حاڵەتی هاوشێوە دەگشتێنێت.

بۆ نموونە ئەگەر توێژەر بیەوێت توێژینەوەی لە بارەی گرفتی بڵاوبونەوەی ماددەی هۆشبەر بکات لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، ناتوانێت پەیوەندی بکات بە سەرجەم حاڵەتەکانی بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان، بەهۆی بێدەنگبونی ئالودەبوونی ماددەهۆشبەرەکان لە لایەك، زۆری ژمارەیان لە لایەکی دیکەوە، بۆیە پەنا دەبات بۆ نموونەیەك لە کۆمەڵگا کە

نوێنەرایەتیکردنی ڕاستی ئەو توێژەرە بکات، بۆیە دەستدەکات بە گەڕان بە دوای هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ماددەی هۆشبەر لای تاکەکانی ئەو گروپە. دوای گەیشتن بە ئەنجام دەتوانێت بەسەر حاڵەتە هاوشێوەکانی بگشتێنێت.
پەنابردنی توێژەر بۆ نموونە وەرگرتن، واتە وەرگرتنی نموونەیەکە کە نوێنەرایەتی کۆمەڵگای لێتوێژراو بکات، لەگەڵ لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەو ڕێکایە، وەك دەستگرتن بە تێچوو و بەفیڕۆنەدانی کات، هاوشانە لەگەڵ بوونی هەڵ کە دەبێت لەبەرچاو بگیرێت یاخود وریابین لە کەوتنە ناو ئەو هەڵانە، وەك لایەنگیری و هەڵەی ڕێکەوت، ڕەنگە هەندێکجار مەبەستدار نەبێت، بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ ڕێکەوت یاخود نەزانی توێژەرە یاخود ئەو کەسەی زانیاری کۆدەکاتەوە، سەبارەت بە مەرجەکانی هەڵبژاردنی نموونە، ئەمەش پێی دەوترێت لادانەکانی نموونە.
لە نموونە کلاسیکییە بە ناوبانگەکان لە بارەی هەڵەی هەڵبژاردنی نموونە ئەوەبوو ڕوویدا لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردی سەرۆکایەتی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٣٦، گۆڤاری لیترای دایگست، ڕاپرسییەکی ئەنجامدا لە بارەی ئەوەی کە کێ لە هەڵبژارنەدەکان سەردەکەوێت، نموونەی ئەو ڕاپرسییەش لە دوو ملیۆن کەس پێکدەهات، ئەنجامی ئەو ڕاپرسییەش سەرکەوتنی کۆمارییەکان بوو، کە ئەوکات پاڵێوراوەکە (ڕالف لاندۆن) بوو، کەچی ئەوەی ڕوویداو بردنەوەی دیموکراسییەکان بو بە پاڵێوراوی (فرانکلین ڕۆزڤێڵت)، هەڵەکە لە هەڵبژاردنی نموونەکە بوو، چونکە سەرپەرشتیاران زۆرینەی ئەندامانی نموونەکیان لە کۆمارییەکان هەڵبژاردبوو، بەمپێیەش بەشێوەیەکی ڕاست نوێنەرایەتی دانیشتوانی نەکرد، ئەو هەڵەیە بۆ سەرپەرشتیارانی ڕاپرسیی لە

گۆڤارەکە دەگەڕێتەوە، بەهۆی ئارەزوویان بووە بۆ بەهەڵدابردنی ڕای گشتی، بەوەی کە زۆرینە کۆمارییەکانیان هەڵبژاردووە[٢٦٧].

پرۆسەی دڵنیابوونەوە لە نوێنەرایەتی نموونە بۆ کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ڕاست بریتییە لە هەنگاوێکی سەرەکی بۆ مسۆگەربوونی وردی و بابەتیبونی توێژینەوەکە، تاوەکو ئەوە ڕوو بدات لەسەر توێژەر پێویستە بە وردی ئەو کۆمەڵگایە دیاری بکات کە توێژینەوەی دەکات، هەروەها لیستێك دەستەواژەی هەبێت ئەگەر بکرێت، پاشان نموونە بەشێوەیەکی هەرەمەکی هەڵبژێرێت و بێ لایەنی تێدابێت.

## باسی یەکەم: قەبارەی نموونە

قەبارەی نموونەی هەڵبژێردراو لەسەر چەند فاکتەرێك دەوەستێت، گرنگترینیان:

### ١. پلەی بەیەکەوە گونجانی کۆمەڵگای توێژینەوە

هەرچەندە کۆمەڵگای توێژینەوە توخمەکانی گونجانیان تێدابێت، ئەوا دەکرێت قەبارەکەی نموونەکە بچووکتر بێت، چونکە گونجانی کۆمەڵگا وادەکات خەسڵەتەکانی نێو هەر گروپێك هەمان خەسڵەتی نێو گروپەکانی دیکە بێت (بەنزیککراوەیی)، بەڵام ئەگەر کۆمەڵگاکە بەیەکەوە گونجاو نەبوو، ئینجا چ لە ڕووی ڕەگەز، یاخود بنەچە، یاخود حاڵەتی کۆمەڵایەتی، یاخود

---

٢٦٧- روجر و دومینیك، سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٧.

مەیلی سیاسی...هتد بێت، بەدڵنیایەوە ئەمە پێویستی بە بەرفراوانکردنی نموونە هەیە بەشێوەیەك نوێنەرایەتی هەموو توێژەکان بکات.

**٢. فاکتەرە ماددییەکان**

لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی پەنابردن بۆ شێوازی نموونە لە جیاتی شێوازی وەرگرتنی گشتگیری هەمووکۆمەڵگا، بریتییە لە تێچووی ماددی زۆری ئەو شێوازە، بۆیە پەنا بۆ شێوازی نموونە دەبردێت، چونکە تێچوونی کەمە، هەرچەندە توانای دارایی توێژەر، یاخود لایەنی سەرپەرشتیاری پرۆسەی توێژینەوە کەمبوو، زیاتر پەنا بۆ نموونەی قەبارە بچووك دەبردرێت، تاوەکو بکرێت پەیوەندی بەسەرجەم رەگەزەکان بکرێت بێ ماندووبون و تێچونێکی زۆرەوە.

**٣. فاکتەری کات**

نموونەی قەبارە گەورە پێویستی بە کاتی زۆر هەیە، تاوەکو رۆماڵ بکرێت پەیوەندی بەسەرجەم رەگەزەکانی بکرێت، زۆرجاریش توێژینەوە کاتێکی دیاریکراوی هەیە، لێرەوە دەبێت توێژەر فاکتەری کات لەبەرچاو بگرێت ئەوکاتەی نموونە هەڵدەبژێرێت.

**٤. قەبارەی نموونە دەکەوێتە ژێر کاریگەری میتۆدی پەیرەوکراو**

قەبارەی نموونە کاریگەر دەبێت بە میتۆدی پەیرەوکراوە، ئامرازی کۆ کردنەوەی زانیاری، جۆری گرفتەکەی بابەتی توێژینەوە، لەگەڵ ئەو توێژەرەی کە زانیاری کۆ دەکاتەوە لە رێگای چاوپێکەوتن، بەڵام توێژەر

هەوڵدەدات نموونەیەکی ژمارە کەم هەڵبژێرێت ئەوکاتەی زانیارەکانی خۆی لە ڕێگای پرسیارنامە کۆدەکاتەوە.

بەشێوەکی گشتی، هەرچەندە قەبارەی نموونەی وەرگیراو مەزنتر بێت لە توێژینەوە هێندە باشترە. پەند وەرگرتنیش لە کۆتایی تەنیا لە گەورەیی قەبارەکە نییە، بەڵکو لە مەودای نوێنەرایەتییکردنی نموونەیە بۆ کۆمەڵگای لێتوێژراو بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

**باسی دووەم: چۆنییەتی هەژمارکردنی قەبارەی نموونە**

دیاریکردنی قەبارەی نموونە بەشێوەیەکی زانستی پشت بە زانینی ئەو گۆڕاوانەی خوارەوە دەبەستێت:

١. زانینی بەهای نزیککراوەیی لادانی پێوەری کۆمەڵگای توێژینەوە، ئەمەش بە خەملاندن دەکرێت لە لایەن توێژەر لەسەر بنەمای هەقیقەتی بەیەکەوە گونجاو یاخود بەیەکەوە نەگونجانی دانیشتوان، هەرچەندە کۆمەڵگای توێژینەوەکە گونجاو بوو، لادانی پێوەری کەمتر دەبێت[٢٦٨].

٢. دیاریکردنی پلەی دەلالی نێوەندی ژمارەیی کۆمەڵگای توێژینەوە کە دەکەوێتە نێوان (-٢، ١) پلە بۆ ٤ پلە، توێژەر پلەکانی دەلالەت دیاری دەکات، ئەمەی دوایی پشت دەبەستێت بە ئاستی ئەو متمانەیەی کە توێژەر

[٢٦٨]- احمد زكي بدوي، معجم المصطلحات العلوم الاجتماعية، بيروت، ١٩٧٨، لا ٤٠٧.

هەیەتی، ئاستی متمانەی (٩٥٪)ـی دەلالەتەکەی (١,٩٦)ـە، ئاستی متمانەی (٩٩٪)ـی پلەی دەلالەتی (٥٨)ە[٢٦٩].

٣. دیاریکردنی ئەو ئاستی متمانەیەی کە توێژەرە بە هۆیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ئەمەش دەشێ (٩٥٪) و (٩٩٪)بێت.

دوای ناسینی ئەو گۆڕاوانە پەنا دەبەن بۆ ئەو هاوکێشەیەی خوارەوە بۆ دیاریکردنی قەبارەی نموونە.

ق.ن= (لا.پ)٢/س

**ق.ن =واتە قەبارەی نمونەکە کە دەمانەوێت لە کۆمەڵگای توێژینەوەکەدا هەڵیان بژێرین.**

**لا.پ=واتە لادانی پێوانەیی**

**س=واتە ئاستی متمانە یان پلەی دەلالەی ناوەندی ژمارەیی کۆمەڵگای توێژینەوەکە دابەشی پلەی دەلالەی ئاستەکانی متمانە٩٥٪ ، ٩٩٪.**

**بۆ نمونە گریمان لادانی پێوانەیی کۆمەڵگای توێژینەوەکە یەکسانە بە پازدە(١٥) .**

**پلەی دەلالەت +٢**

**لەسەر ئاستی متمانەی ٩٥٪وەرمان گرت کە پلەی دەلالەتەکەی دەکاتە (١.٩٦). ئایا قەبارەی نمونەی توێژینەوەکەمان دەبێ چەند بێت؟؟**

**لەسەرەتادا هاوکێشەکە دەنوسینەوە: ق.ن= (لا.پ)٢/س .**

[٢٦٩]- احسان محمد الحسن، الاسس العلمية لمناهج البحث الاجتماعي، لا ٥٦.

س= ٢/١.٩٦=(١)٢.

کەواتــە(ق.ن)= (١٥)٢/ (١)٢=٢٢٥کــەس ئەمــەش قــەبارەی نمونــەی توێژینەوەکەیە .

نمونەیەکی تر:

گریمان لادانی پێوانەیی کۆمەڵگای توێژینەوەکەمان= ١٢ ،پلەی دەلالەی =+٢، بە ئاستی متمانەی (٩٥٪) کە ((١.٩٦)ە، ئایا قەبارەی نمونەی توێژینەوەکە دەبێ چەند بێت؟؟

لەسەرەتادا هاوکێشەکە دەنوسینەوە: ق.ن= (لا.پ)٢/س .

س= ٢/١.٩٦=(١)٢.

کەواتــە(ق.ن)= (١٢)٢/ (١)٢=١٤٤کــەس ئەمــەش قــەبارەی نمونــەی توێژینەوەکەیە.

نمونەیەکی تر:

گریمان لادانی پێوانەیی کۆمەڵگای توێژینەوەکەمان= ٢٠ ،پلەی دەلالەی =+٣، بە ئاستی متمانەی (٩٥٪) کە ((١.٩٦)ە، ئایا قەبارەی نمونەی توێژینەوەکە دەبێ چەند بێت؟؟

لەسەرەتادا هاوکێشەکە دەنوسینەوە: ق.ن= (لا.پ)٢/س .

س= ٣/١.٩٦=(١.٥)٢.

کەواتـە(ق.ن)= (٢٠)٢/ (١.٥)٢=٤٠٠/٢.٢٥= ١٨٢ کـەس ئەمـەش قـەبارەی نمونەی توێژینەوەکەیە.

بەڵام ئەگەر گریمان لادانی پێوانەیی کۆمەڵگای توێژینەوەکەمان= ٢٠ ،پلـەی دەلالەی =+٣، بە ئاستی متمانەی (٩٩٪) کە ((٢.٥٨)ە، ئایا لـەم حاڵەتـدا قەبارەی نمونەی توێژینەوەکە دەبێ چەند بێت؟؟

لەسەرەتادا هاوکێشەکە دەنوسینەوە: ق.ن= (لا.پ)٢/س .

س= ٢.٥٨/٣ =(١.١)٢.

کەواتـە(ق.ن)= (٢٠)٢/ (١.١)٢=٤٠٠/١.٢= ٣٣٣ کـەس ئەمـەش قـەبارەی نمونەی توێژینەوەکەیە.

## باسی دووەم
## شێوازەکانی هەڵبژاردنی نموونەکان

### جۆرەکانی نموونە[270]

هەروەك لە پێشوتردا باسمان کرد ناکرێت توێژەر پەیوەندی بکات بە تەواوی ئەندامەکانی کۆمەڵگای لێتوێژراو، بۆیە لەسەری پێویستی نموونەیەك هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی توێژینەوەی ئەزموونی لەسەر بکات و گریمانەکانی بەسەریان تاقی بکاتەوە، دوو شێواز هەیە بۆ هەڵبژاردنی نموونەی توێژینەوە، نموونەی ئەگەری، نموونە نا ئەگەری.

١. نموونەی ئەگەری

ئەو نموونانەن کە هەل بە هەر ئەندامێکی کۆمەڵگای توێژینەوە دەدەن، بۆ ئەوەی ببن بە یەکێك لە تاکەکانی نموونە، تاکەکانی ئەو نموونەش بەشێوەی هەڕەمەکی هەڵدەبژێردێن، ئەو شێوازەش چەند جۆرێکە:

أ. نموونەی هەڕەمەکی سادە

---

[270]- چەندین رێگا هەیە بۆ هەڵبژاردنی نموونە و ئەو شێوازانەی لێرەدا باسکراون تەنیا چەند نموونەیەکن .

ئەو نموونەیە لە کاتی هەڵبژاردنی تاکەکانیدا هیچ شێوازێك لە شێوازەکان پەیڕەو ناکرێت، بەڵکو بەشێوەیەکی هەڕەمەکییە، بەخشینی هەلی یەکسان بەسەرجەم ئەندام و یەکەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە مسۆگەر دەکات، ئەمەش بەگوێرەی ڕێسا زانراو و تایبەتەکان ئەنجام دەدرێت، وەك خشتەی هەڕەمەکی و تیروپشك.

بۆ نموونە توێژەر دەتوانێت ناوی سەرجەم ئەندامەکانی کۆمەڵگای توێژینەوەکەی بخاتە ناوکیسێك، پاشان ژمارەی پێویستی لێ دەربهێنێت، بەڵام شێوازی نموونەیی، بە تایبەتی ئەگەر یەکەکانی کۆمەڵگاکە گەورە بێت، بریتییە لە خشتەی هەڕەمەکی و ژمارەی هەرەمەکی، ئەمەش بریتییە لە خشتەیەك کە لە پێشودا ئامادەکراوە و ژمارەکانی نووسراوە بێ هیچ ڕێکخستن و مەبەستدارییەك و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی (بڕوانە کۆتایی ئەم کتێبە).

لەم شێوازە توێژەر خشتەیەکی ئامادەکردووە بۆ یەکەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە و بەشێوەیەکی زنجیرەکراو ژمارەی بۆدانراوە، دواتر خاڵێك لە خشتە هەرەمەکییەکە هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی ببێتە ژمارەی یەکەم، ناوی بەرامبەر ژمارەکە وەردەگرێت لە خشتەی یەکەکانی کۆمەڵگا، پرۆسەکە دووبارە دەکاتەوە و پاشان ژمارەیەکی دیکە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لە خشتە هەرەمەکییەکە هەڵدەبژێرێت، ناوی بەرامبەر ژمارەکە لە خشتەی

ناوەکـانی دەردەهێنێـت، بەمشـێوەیە تـاوەکو تـەواوی ژمـارەی قـەبارەی نموونەکە هەڵدەبژێریت.

ب. نموونەی ڕێکخراو

سەر بەهەمان شێوازی نموونە هەڕەمەکییەکانە، بەڵام لەوەی یەکەم جیاوازە بەهۆی ئاسانی هەڵبژاردنی ئەندامەکانی، لـەم جـۆرەدا توێـژەر بەشـێوەیەکی هەڕەمـەکی ڕەگـەزی یەکـەم لـە ڕەگـەزەکانی نموونەکـە هەڵدەبـژێرێت وەك لەپێشوتر ڕوونکرایەوە. پاشان تـەواوی ڕەگـەز، یـان یەکـەکان بەشـێوەیەکی ڕێکخراو هەڵدەبژێرێت، بەشێوەیەك دەبێت جیـاوازی نێـوان هـەموو یەکـەکان یەکسان بێت لە ڕووی ژمارەوە.

بۆ نموونە توێژەرێك دەیـەوێت نموونەیـەك هەڵبـژرێت کـە قەبارەکـەی ١٠٪ ی کۆی گشتی کۆمەڵگای توێژینەوە بێت، بۆ نموونـە بـە ڕێـژەی ١/١٠، تـاوەکو توێژینـەوەی لـە بارەیـەوە بکـات، لـەم حاڵەتـەدا توێـژەر خـاڵی سـەرەتایی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لە خشتەی هەڕەمەکی هەڵدەبـژێرێت، بـا گریمانـەی ئەوە بکەین کە ژمارە (٧)ـە، لەم حاڵەتەدا نموونەکە لە چەند ناوێك، یـاخود یەکەیەك پێکدێت کـە هەریەکـەیان ژمارەیـەکیان دەبێـت، ٧، ١٧، ٢٧، ٣٧، بەمشـێوەیە و بەشـێوەیەکی گشـتی دەکرێـت ئـەو هاوکێشـەیەی خـوارەوە بەکاربهێنێن، بۆ دیاریکردنی ماوەکە:

م.هـ= ق ن/ ق ك : هێماکان بەم شێوەیەیە :م هـ =واتە مەودای هەڵبژاردن

ق ن= واتە قەبارەی نمونەی توێژینەوەکە

ق ك=واتە قەبارەی کۆمەڵگای توێژینەوەکە

بۆ نمونە ئەگەر قەبارەی نمونەی توێژینەوەکە(٥٠٠)کەس بێت قەبارەی کۆمەڵگای توێژینەوەکە (٢٠٠٠٠)کەس بێت مەودای هەڵبژاردن بەم شێوەیە دەبێت .

م هـ= ٢٠٠٠٠/٥٠٠= ٤٠/١

واتە هەر کەسێك لە نمونەی توێژینەوەکەدا نوێنەرایەتی (٤٠)کەس دەکات لە کۆمەڵگای توێژینەوەکە ،گریمان توێژەرەکە لە لیستی ناوەکاندا کەسی ژمارە (٦)ی هەڵبژارد وەکو یەکەم هەڵبژاردنی رەمەکی ،دوواتر بە پشت بەستان بە مەودای هەڵبژاردن کە چل کەسە ،ئەندامانی تری نمونەکە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت :

(٦، ٤٦، ٨٦، ١٢٦، ١٦٦، ٢٠٦، ٢٤٦، ٢٨٦، ٣٢٦و.....هتد تا پێنجسەد کەس بەم ریزبەندیە هەڵدەبژێرێت .

لەو حاڵەتەی توێژەر نەیتوانی چاوی بەو کەسە بکەوێت کە بۆتە ئەندامێك لەم نموونەیە، دەتوانێت ژمارەی دوای ئەو هەڵبژێرێت.

**٢. نموونەی چینایەتی هەڕەمەکی**

ئەوکاتە پەنا بۆ ئەو جۆرە دەبردرێت کە کۆمەڵگای توێژینەوە بە یەکەوە گونجاو نەبێت، ئینجا چ لە ڕووی تەمەن، یاخود جۆر، یان ئایین، یان پیشە بێت، بۆ ئەوەی نموونە بەشێوەیەکی ڕاست نوێنەرایەتی کۆمەڵگا بکات دەبێت تەواوی ئەو پۆلانە لەخۆ بگرێت.

بۆ ئەوەی گەرانتی ئەوە بکەین کە نموونەی هەڵبژێردراو نوێنەرایەتی تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگا بکات بە شێوەیەکی ورد، دەبێت ئەو هەنگاوانە بگرینەبەر:

أ. ناسینی کۆمەڵگا ڕەسەنەکە بەشێوەیەکی ورد، دەبێت شیانکەینەوە بۆ ئەوەی هەموو چینێك یان توێژێك لە توێژەکانی بناسین.
ب. دیاریکردنی ژمارەی یەکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگا وەك گشتێك، ئەمەش پێویستی بەوە هەیە لیستی ناوی تەواوی تاکەکان، یاخود یەکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای ڕەسەنمان هەبێت، هەروەها دەبێت ژمارەی یەکەکانی هەر چینێك لە چینەکان بزانین.
ت. دیاریکردنی قەبارەی ئەو نموونەیەی کە توێژینەوەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ یەکە داواکراوەکانی نێو هەر چینێك.
پ. هەڵبژاردنی یەکەکان لە لیستەکاندا بەشێوەیەکی هەڕەمەکی، یاخود بە شێوەیەکی ڕێکخراو.

**٤. نموونەی هێشوویی، یاخود نموونە گردبونەوە**

ئەوکاتە پەنای بۆ دەبردرێت ئەگەر قەبارەی کۆمەڵگا ڕەسەنەکە مەزن بوو، چونکە ئەگەر قەبارەکە گەورە بوو هەڵبژاردنی نموونە بەشێوەی پێشوو دژوار دەبێت. لەو حاڵەتەی کە کۆمەڵگای توێژینەوە لە ڕووبەرێکی جوگرافی جیاواز بوو، یاخود لیست نەبێت بۆ سەرجەم یەکەکانی کۆمەڵگا، شێوازی فرە هەنگاوی لە هەڵبژاردنی نموونە دەگرینەبەر.

ئەو ئامرازەش پێویستی بە بوونی نەخشـەیەکی وردە بـۆ ئـەو ناوچـانەی کـە کۆمەڵگای توێژینەوە تێـدا بـوونی هەیـە، بەشـێوەیەك ناوچـەکان بـۆ یەکـەی سەرەتایی دابـەش دەکرێـت، لـە نێویانـدا توێـژەر بەشـێوەیەکی هەڕەمـەکی نموونـە و یەکـەکانی ئـەو نموونەیـە بـۆ یەکـەی بچـوکتر دابـەش دەکـات و بەمشێوەیە.

بـۆ نموونـە کۆمـەڵگای بـۆ چـەند ناوچـەیەك دابـەش دەکـات، نموونـەش لـەو ناوچانە هەڵدەبژێردێت، دوای ئەوەش هەر ناوچەیەك لە ناوچەی پەیوەندیـدار بـۆ چـەند شـارێك دابـەش دەکرێـت، بەشـێوەیەکی هەڕەمـەکی نموونەیـەکی دیاریکراو لەو شارانە هەڵدەبژێردرێت، دواتر هەر شارێك لەو شارانە بۆ گەڕەك دابەش دەبێت و هەر گەڕەکێکیش بۆ کۆمەڵێك شەقام و هەر شەقامێکیش بۆ کۆمەڵێك خانوو دابەش دەبێت.

**باسی دووەم: نموونە نائەگەرییەکان**

لەم جۆرەدا هەلی یەکسان لەبەردەم تاکەکاندا بوونی نیە تا ببنـە ئەنـدام لـە نمونەی توێژینەوەکەدا ، ئەو جۆرەی نموونەکان ئاسانترە بۆ توێژەر، بـەڵام ڕادەی زانستیبونی کەمترە لە جـۆری یەکـەم، بەشـێوەیەك خـودێتی توێـژەر ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە هەڵبژاردنی تاکەکانی نموونە، گرنگترینیان:

**١. نموونەی مەبەستدار**

لەم جۆرەدا توێژەر مەبەستدارانە نموونەیەك هەڵدەبژێرێت لە ناو یەکەکانـدا، بۆ ئەوەی خەسڵەتەکانی ئەو نموونـە وای لـێ بکـات بـە راسـتی نوێنەرایـەتی کۆمەڵگای توێژینەوە بکات. ڕەنگە توێژەر ناوچەی دیاریکراو هەڵبژێرێت، لەو

باوەڕەی کە ئەو ناوچەیە چەند خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی ئاماری تێدایە بە ڕاستی نوێنەرایەتی کۆمەڵگا دەکات.

**٢. نموونەی تۆپەڵە بەفر یان کەڵەکەبوو**

توێژەر ژمارەیەکی کەمی تاکەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە هەڵدەبژێرێت، لەو بڕوایەی کە ئەو خەسڵەتانەی کە تێدایە یارمەتی دەدات بۆ تاقیکردنەوەی گریمانەکانی. دواتر هەر لە ڕێگای ئەمانەوە هی دیکەیش هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی بچنە ڕیزی تاکەکانی دیکە.....هتد.

**٣. نموونەی دەستەیی ڕێژەیی**

لە نموونەی چینایەتی دەچێت، بەڵام توێژەر تاکەکانی نموونە لە سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە هەڵدەبژێرێت، لەوەشدا ڕێژەیان لە نێو ئەو کۆمەڵگایەدا دیاری دەکات.

## باسی سێیەم
## لادانەکانی هەڵبژاردنی نموونە

پشت بە نموونە بەستن کارێکە مەترسی تێدایە، چونکە جۆری ئەو دەرەنجامەی کە پێی دەگەین لە توێژینەوەکە، پەیوەستە بە پێکهاتەی نموونەکە، ئەگەر ئەمەی دوایی نوێنەرایەتی ئەو کۆمەڵە خەڵکە نەکات کە دەمانەوێت توێژینەوەیان بکەین، ئەنجامەکان تەنانەت ئەگەر ڕێگایەکی وردیش بەکاربهێنرێت لەڕێگای ئاماری وردیش، جیاوازە لەو ئەنجامەی کە

بەدەستمان دەکەوێت، ئەگەر بێتوو هەموو دانیشتوانەکەی وەربگرین، بۆ نموونە ئەگەر نموونەکە لە باڵاخانەکان وەربگرین بۆ خەملاندنی ژمارەی دانیشتوانی شارێك لە شارەکان، دەکرێت ئەو نموونەی وەرمانگرتووە دانیشتوانەکەی لە سەرو ناوەند بێت ، بەدڵنیاییەوە ئەمە دەبێتە هۆی هەژمارکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لە شار، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە حوکمەکەمان بۆ بەش راستە نەك گشت.

هۆکارەکانی لادانی نموونە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی جیاواز، دەکرێت هەندێکیان لەوکاتە دروست بێت کە نموونەکە وەردەگرین وەك پشت بەستن بە رێسایەك کە تەنیا بەشێکی دانیشتوان روماڵ دەکات، یاخود تەواوی ئەو خەسڵەتانەی تێدا نییە کە لە بابەتی لێتوێژراودا هەیە، دەکرێت هەندێکیان هۆکارەکانی دووربێت لەپرۆسەی نموونە وەرگرتن، وەك رەتکردنەوەی ئەو کەسەی پرسیاری لێدەکرێت، یاخود ئامادەنەبوونی، یاخود بەخشینی زانیاری هەڵە بە مەبەستداری.

**باسی یەکەم: لادانەکان بۆ پرۆسەی نموونە هەڵبژاردن دەگەڕێنەوە**

توێژەر ئازادییەکی نیمچە رەهای هەیە لە هەڵبژاردنی ئەندامەکانی نموونەی توێژینەوەکەی، بەو مەرجەی بچێتە نێو نەخشەکە، ئینجا چ لە رووی پشك، یاخود جۆری دەستەواژەکان بێت، ناکرێت رێگایەکی ئاسانتر لەمە بدۆزرێتەوە، چونکە توێژەر کات بەفیڕۆ نادات لە توێژینەوەکردنی کەسێك بە دیاریکراوی، بەڵکو تەنیا لێکچواندن ئەنجام دەدات لە نێو کەسە

هەڵبژێردراوەکان، بەڵام ڕەنگە ئەو ڕێگایە ئەنجامی مەترسیداری هەبێت، چونکە توێژەر دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین هۆکار:

١. فاکتەری هاوسێبون: ڕەنگە هاوسێبون پاڵ بە توێژەر بنێت بۆ هەڵبژاردنی بابەت، یاخود ئەو کەسانەی لە ڕووی جوگرافییەوە لە شوێنی نیشتەجێبوندا نزیکن.

٢. فاکتەری هاوسۆزی: ئەو فاکتەرە پاڵ بە توێژەر دەنێت ئەو کەسانە هەڵبژێرێت بۆ وەڵامدانەوە کە سەر بە هەمان کولتوور، یان ئایین، یان چینی خۆی بێت.

٣. فاکتەری شکۆمەندی: ئەم پاڵ بە توێژەر دەنێت خۆی لەوە بە دووربخاتەوە کە چەند کەسێك هەڵبژێرێت بۆ وەڵامدانەوە کە لە ڕووی چینایەتییەوە سەر بە چینە کۆمەڵایەتییە بەرزەکانن.

٤. فاکتەری لایەنگیری: ئەمەش بەرهەمی ئەوەیە کە توێژەر ژمارەیەکی کەم لە خەڵك، یاخود یەکەی پێکهێنەری کۆمەڵگا ڕەسەنەکە هەڵدەبژێرێت و چاو پۆشی لە یەکەکانی دیکە دەکات.

**باسی دووەم: لادانە دەرەکیەکان لە پرۆسەی نموونە هەڵبژاردن**

توێژەر کۆمەڵێك هەڵە دەکات یان بە چەندین هەڵەدا دەکەوێت، کە لە ڕاستیدا ئەم هەڵانە بۆ خەسڵەتەکانی نموونەکە ، یان چۆنەیەتی هەڵبژاردنی نمونەکە ناگەڕێنەوە، بەڵکوچەندین سەرچاوەی جیاواز هۆکارن لە ڕوودانی ئەم هەڵانە:

**١. هەڵەکانی پەیوەست بە توێژەر**

أ. ئـەو هەڵانـەن کـە توێـژەر لـە کـاتی بەتاڵکردنـەوەی زانیارییـەکان تێـی دەکەوێت، یان ڕیزبەندیکردنیان، یاخود داکردنیان بۆ ناو کۆمپیوتـەر، یـاخود هەڵەیەکە بەهۆی خەملاندنی ئەگەرەکانی ڕەتکردنـەوە یـان نائامادەبوونـەوە تێی کەوتووە.

ب. نارۆشنی برگەیەك لە پرسیار، یاخود نارۆشنی تەواوی پرسیارەکە، ئەگـەر برگەیـەکی پرسـیارەکە، یـاخود تـەواوی پرسـیارەکە نارۆشـن بـوو، ئـەوا وەڵامدانەوەی تاکەکانی نموونەکە بۆ ئەو پرسیارە یەك جۆر نابێت، هـەروەها توێژەریش ناتوانێت کاریگەری ئـەو نارۆشـنییە بپێوێـت لەسـەر وەڵامەکانـدا. سـەرەڕای ئـەو کۆششـەی کـە توێـژەر خـەرجی دەکـات لـە داڕشـتنی پرسیارەکانی، ڕەنگە هـەر پرسـیارنامەیەك چـەند پرسـیارێکی لەمشـێوەیەی تێدا بێت، یاخود چەند برگەیەکی خراپی تێدا بێت.

بۆ نموونـە یـەکێك لـە توێژینـەوە تازەکـان پرسـیارێکی تێـدا بـوو لـە بـارەی ژمـارەی ئـەو کتێبانـەی کـە لـە ماڵـدا هەیـە، لـە پرسـیارەکەدا ئـەوە ڕوون نەکرابۆوە ئایا مەبەستی لەو کتێبانە لە ڕووی بابەت، یـاخود جـۆرە، ئـەوەی کـە ڕوویـداوە ئـەوەبوو کـە هەنـدێك لـە ئەندامـەکانی نموونەکـە بـە کتێبـی قوتابخانە تێگەیشتبون، ڕەنگە بە کتێبی قۆناغی سـەرەتایی تێگەیشـتبوون، بـەڵام بەشـێکی مـەزن لـە ئەنـدامانی نموونەکـە بـە کتێبـی قوتابخانـە تـێ نەگەیشتبوون، بە تایبەتی ئەو خێزانانەی کـە منداڵـەکانیان کتێبـی دیکـەیان هەیە لە ماڵ، بۆیە ژمارەی ئەو کتێبانەی نوسـیبوو کـە هـی قوتابخانـە نـین،

بەمەش وەڵامی زۆرینەی تاکەکانی نموونەکە ئەوەبوو کە ئەوان هیچ کتێبیکیان لە ماڵ هەڵنەگرتووە، یاخود تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەمیان هەیە لە ماڵەوە.

**٢. ئەو هەڵانەی پەیوەستن بە نموونەی لێتوێژراو**

**أ. نائامادەبوون**

ئەوکاتەی توێژەر دەچێتە ماڵی ئەندامی نموونەکەی، ڕەنگە کەسەکە لە ماڵ نەبێت لەبەر چەند هۆکارێك و بۆ ماوەیەکی جیاوازیش، ڕەنگە نائامادەبونەکە کاتی یان هەمیشەیی بێت، ئەگەر ڕاستەوخۆ توێژەر بۆ لای کەسێکی دیکە چوو بەوپێیەی کە کەسەکەی دیکەیش لە تیروپشکی نموونەکەی دەرچووە و ئێمە نموونەکەمان تەنیا ئەو کەسانەی تێدایە کە کەم دەردەچن، بە شێوەیەکی وردتر ئەو کەسانە دەبن کە زۆر لە دەرەوەن شانسی کەمتریان دەبێت بۆ ئەوەی ببنە بەشێك لە نموونەی کۆتایی. زۆربەی جار ئەو جۆرە لادانە دوچاری نموونەی هەڕەمەکی دەبێت.

بۆ خۆدوورگرتن لەو لادانە، چەند شتێك هەیە دەبێت ئێمە بەهێندی وەربگرین، بۆ نموونە پڕکردنەوە و وەڵامدانەوەکان لە میانەی ڕۆژەکانی پشوو بێت، بۆ نموونە لە مانگەکانی حەوت و هەشت ، بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانە کە دەردەچن جیاوازن لەوانەی دەرناچن لە ماڵەوە، هەروەها نابێت توێژەر دەستبەرداری ئەو کەسە بێت کە زۆرجار لە ماڵەوە نیین، دەبێت چەند جارێکی دیکەش بچێتەوە بۆ ماڵیان، بە شێوەیەی گشتی نابێت توێژەر دەستبەرداری ناونیشانێك بێت تەنیا دوای سەردانکردن نەبێت بۆ زیاتر لە چوار جار بێئەوەی کەسەکە ببنێ.

لە پاڵ ئەو نائامادەبوونەی کە وا لە توێژەر دەکات لە ڕووی پرەنسیپەوە ئەندامێکی دیکە نموونەکە هەڵبژێرێت، نائامادەبونێکی درێژیش هەیە کە دەکەوێتە ماوەی دوای توێژینەوە (مردن، گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون)، دۆزینەوەی ئەو کەسانە کارێکی دژوارە، ئاسانە ناونیشانە تازەکە بدۆزییەوە، بەڵام ئەو ناوچە تازەیە لە دەرەوەی ناوچەی چوارچێوەی توێژینەوەکەیە.

لە بەرامبەر هەموو شێوەکانی نائامادەبوون ئینجا چ کاتی یان هەمیشەیی بێت، ئەگەرێك هەیە کە دەکرێت بەسەر هەموو حاڵەتەکان پراکتیزە بکرێت، ئەویش گۆڕینی کەسەکەیە بە کەسێکی دیکە کە ئەویش بە تیروپشك دەچوبێت و سەر بەهەمان توێژ (تەمەن، ڕەگەز، پیشە...)ی ئەو کەسە بێت کە نەمانتوانی پێی بگەین، گریمانەی ئەوە دەکرێت پێش ئەوەی کەسەکە ببینین خەسڵەتەکانی ئەو کەسە مەبەستدارە بزانین، هەروەها گریمانەی ئەوە دەکرێت کە ئەو خەسڵەتانە لە ڕیزی ئەو ڕێسایانەیە کە بۆ وەرگرتنی نموونەکە گرتومانەتە بەر[٢٧١].

**ب. ڕەتکردنەوە**

لە ڕووی پرەنسیپەوە کەس ناچار ناکرێت وەڵام بداتەوە، یاخود وەڵامی پرسیارنامە بداتەوە تەنیا بە ئاوارتەکردنی هەندێك حاڵەتی دەگمەن نەبێت وەك ئاماری دانیشتوان، ئەمەش وامان لێدەکات بە کردەیی دڵنیان بین لەوەی کە ژمارەیەکی ئەو کەسانە ڕەتی دەکەنەوە وەڵامی هەموو توێژینەوەکان بدەنەوە، پرۆسەکانی ڕەتکردنەوەش زۆرجار تایبەتە، ڕەنگە هەندێك جاریش کەسەکە لە ناوەڕاستی پرسیارنامەکە ڕەتدەکاتەوە بەردەوام

[٢٧١]- احمد ضباب، الاسلوب العلمي في البحث، المطابع دار البلاد، جدة ١٩٨١، لا ٤٧.

بێت لە وەڵامدانەوە، ئەو لادانەی کە ڕەنگە ئەو ڕەتکردنەوەیە دروستی بکات، لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەردەکەوێت: ئایا نەدەکرا ئەو کەسانەی ڕەتیان کردۆتەوە وەڵام بدەنەوە، وەڵامی خۆیان جیاواز بوایە لەو کەسانەی کە وەڵامیانداوە؟

دەکرێت ئاماژە بکەین بۆ هەندێك شێوەی پرۆسەی ڕەتکردنەوە:

١. کرێکارە سەربەخۆ و بازرگانە پیشەوەرەکان زیاتر لە توێژە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە ڕەتدەکەنەوە وەڵامبدەنەوە، زۆرجار ئەوان سەرقاڵن، بەشێوەیەك زۆربەی کات ئامادە نین بۆ وەڵامدانەوە.

٢. بەساڵاچوان زۆربەی جار دوو دڵن ڕێگابدەن کەسێکی بێگانە بێتە ناو ماڵەوەیان.

٣. هەندێك ئافرەتی هاوسەردار: ئەوە ڕەتدەکەنەوە ڕێگا بە توێژە بدەن و وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە لە نائامادەیی هاوسەرەکەیاندا، هەندێکیان ئەوە ڕەتدەکەنەوە وەڵام بدەنەوە بە پاساوی ئامادەنەبونی هاوسەرەکانیان: ئینجا یان ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە بێ ڕەزامەندی هاوسەرەکانیان، یان دەڵێن کە هاوسەرەکانیان باشتر دەتوانێت وەڵامی ئەو شتانە بداتەوە.

٤. هەندێك ڕۆشنبیر هەن وەرگرتنی بۆچون ڕەتدەکەنەوە.

٥. هەندێك نێوەندی بەسیاسیکراو لە بنەمادا توێژینەوەکردن ڕەتدەکەنەوە بە هۆکاری سیاسی.

٦. ترس لای ئەو کەسانەی کە ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییان نزمە نەوەك نەتوانن وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە.

٧. ترسان لەوەی نەوەك توێژەر سەر بە دامەزراوەیەك بێت جیاواز لە دامەزراوەکەی خۆی، یاخود تەنیا پاساوێك بێت بۆ هاتنە ناو ماڵ.

بۆ پێوانی لادانی نموونە بەهۆی ڕەتکردنەوە دەکرێت ئەو کەسەی کە ڕەتدەکاتەوە بیگۆڕین بە کەسێکی دیکە کە هەمان خەسڵەتی هەبێت، بەهۆی ئەوەی کە ڕەتکردنەوەی بەهۆی بارودۆخێکی دیاریکراو، یاخود پەیوەست بێت هەستدانەوەی خەڵك لە بەرامبەر توێژەر، بۆیە وا پێویست دەکات توێژەرێکی دیکە بنێردرێت بە سیمایەکی دیکە و دوای چەند ڕۆژێکی دیکە[٢٧٢].

### ت. بەخشینی زانیاری هەڵە بە مەبەست

هەندێك ئەندام لە نموونە بە مەبەست زانیاری نا دروست دەبەخشن، ئەمەش بە ڕێژەی جیاواز ڕوو دەدات بەگوێرەی ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری و سروشتی توێژینەوەکە، ڕەنگە توێژەر لە کاتی چاوپێکەوتندا بتوانێت بە هەندێك داتایدا بچێتەوە و بەیەکەوە بەراوردیان بکات بۆ ئەوەی زانیاری ڕاست بەدەست بهێنێت.

ڕەنگە ئەندامی نموونەکە داتای هەڵە ببەخشێت، بە تایبەتی لە حاڵەتی بابەتێکی هەستیاردا وەك بابەتی ئەخلاقی و سیاسی و ئایینی، لەو حاڵەتانەدا وەڵامەکان گوزارشت نین لە هەقیقەتی هەڵوێستەکە، بەمپێیەش ڕەنگدانەوەی واقیع نین.

---

٢٧٢- رودولف غوفليون و من معه، البحث الاجتماعي المعاصر، ترجمة علي سالم، منشورات مركز العربي للعلوم الانسانية، الطبع الاولى، ١٩٨٦، لا ٤٠.

پوختەی بابەتەکە، ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەین کـە نموونـەکان وەك شـێوازی میتۆدۆلـۆجی لـە پرۆسـەی توێژینـەوە هـەنگاوێکی پێشـکەوتووە و یارمـەتی توێژەر دەدات بۆ سادەکردنەوەی توێژینەوەکردنی کۆمەڵگا و ئاشـنابوون بـە پرس و کێشەکانی لە میانەی نوێنەرەکانی بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام بۆ ئەوەی نموونـە هەڵبـژاردن زانسـتی بێـت، دەبێـت چـەند ڕێسـایەکی بابـەتی پـەیڕەو بکرێت وەك نموونەی هەڕەمەکی، پێویستە لە پنتەکانی لادان دوور بێت، پەنا ببات بۆ شێوازی پشکنین و دڵنیابوونەوە. بێگومان ئـەو توێـژەرەی کـە پـەنا بۆ نموونە هەڵبژاردن دەبـات دەبێـت ئاگادارییـەکی باشـی هـەبێت لـە بـارەی ئامار، یاخود پەناببات بـۆ ئامارزانێـك، تـاوەکو نموونـەی توێژینەوەکـەی بـە بابەتییانـە هەڵبـژێرێت، لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی کۆمپیوتـەر پرۆسـەی نموونـە هەڵبــژاردن ئاســانتر بــووە، بەشــێوەیەك دەکرێــت پرۆســەی هەڵبــژاردنی نموونەیەك لە کۆمەڵگا بدرێتە کۆمپیوتەر، کە ڕەنگە ژمـارەی ئەنـدامانی ئـەو نموونەیە یەك ملیۆن بێت و لە ماوەیەکی زۆر کورتیشدا ئەنجامی دەدات.

# بەشی پێنجەم

## ئامرازەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی مەیدانی

لە توێژینەوە مەیدانییەکاندا بەتایبەتی ڕووپێویی، توێژەر ڕاستەخۆ پەنا بۆ مەیدان دەبات بۆ وەرگرتنی زانیاری پێویست لە بارەی توێژینەوەکەی، زۆربەی جاریش توێژەرەکان پشت بە ئامرازێک یان زیاتر لە ئامرازێک دەبەستن بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکانیان، بۆ نموونە: تێبینیکردن، چاوپێکەوتن، پرسیارنامە، دیاریکردنی گونجاوترین ئامراز بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەگەڕێتەوە بۆ میتۆدی پەیڕەوکراو و قەبارەی نموونە و جۆری گرفتی بابەتی لێتوێژراو. لەم بەشەدا بە وردەکارییەوە باس لە هەرئامرازێك لەو ئامرازانە دەکەین.

### باسی یەکەم
### تێبینیکردن

١. پێناسەکردنی تێبینیکردن

ڕەنگە ئەوە بە مێشکی هەندێك دا بێت کە تێبینی ڕووداوێکی ئاسایی و ڕاگوزەرە، هەموو مرۆڤێك تێبینی ئەو شتانەی دەوروبەری دەکات، بەمپێیەش تێبینیکردن هیچ پەیوەندییەکی نییە بە توێژینەوەی زانستی، ئەمەش ڕاست نییە، چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان تێبینی ئاسایی زانراو کە مانای چاودێریکردنی هەڕەمەکی ئەو دیاردانەیە کە مرۆڤ دەیبینێت لە کاتەکانی بە

ئاگایی، لەگەڵ تێبینیکردنی زانستی کە چڕتر و ڕێکخراوترە و ئاراستەی دیاردەکات، بە مەبەستی توێژینەوەکردن، ئەمەی دوایش تێبینی زانستییە، کە پێویستی بە نەخشەیەك و هۆشیارییەك و ڕاهێنان هەیە.

لێرەوە تێبینکردن پێناسە دەکرێت بەوەی کە: بینینی وردی دیاردەیەکە، بە پشت بەستن بەو ئامرازانەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە کە لەگەڵ سروشتی دیاردە دەنگونجێت.

تێبینی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانستی مەیدانییە تاوەکو کۆتایی، توێژینەوەی زانستی وەك پێشتر گوتمان لەسەر تێبینیکردنی واقیعی شت و دیاردەکان دەوەستێت، بیکۆن ئاماژەی بۆ تێبینیکردن کردووە و دەڵێت: تێبینیکردن و ئەزموون لە پێناو کۆ کرکردنەوەی ماددە و سۆراخکاری و پێوانە لە پێناو ئەوەی بە ئەنجام بگەین، ئەوانە ئامێری هزری ڕاستن.

## مەرجەکانی تێبینیکردنی زانستی

بۆ ئەوەی تێبینیکردن زانستی بێت، بۆ ئەوەی وەك ئامرازێکی کۆکردنەوەی زانیاری و چاودێریکردنی دیاردە لێتوێژراوەکان بەکەڵك بێت، دەبێت جیابیکەینەوە لەگەڵ تێبینیکردنی هەڕەمەکی سادە، بۆیە دەبێت چەند مەرجێکی تێدا هەبێت:

١. کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستن، تێبینیکردنی زانستی پشت بە بوونی پرسیارێك یان کێشەیەك دەبەستێت کە مێشکی توێژەری سەرقاڵ کردووە، لەگەڵ گریمانەیەك کە توێژەر بۆ تێبینیکردنی بەکاری دەهێنێت، هەر بەهۆی ئەمەوەیە پێی دەڵێین مەبەستدار، یان ئاڕاستەکراو، بۆیە توێژەر لەسەری

پێویستە هەنگاوەکانی تێبینیەکانی خۆی ڕێك بخات و ڕەوتەکەی کۆنترۆڵ بکات.

٢. دەبێت تێبینیکردن بابەتی بێت، توێژەر یان تێبینیکار توێژینەوە و تێبینی دەکات بۆ ئەوەی بە هەقیقەت بگات، لەسەری پێویستە بەدوای هرزەکانی پێشوو، یاخود گریمانە بەراییەکان نەکەوێت، لە حاڵەتی هاویەك نەبوونی لەگەڵ هەقیقەتی تێبینیکراو، یاخود تێبینی خۆی چڕبکاتەوە لەسەر ئەو شتەی کە لەگەڵی دەگونجێت یان فەرامۆشکردنی ئەو شتانەی کە پێچەوانەیەتی، بەڵکو لەسەری پێویستە گریمانەکانی بەگوێرەی تێبینینە زانستییەکانی هەموار بکات، ئەمەش پێویستی بەوە هەیە کە توێژەر نەرمییەکی عەقلی و بابەتییبونی هەبێت.

٣. دەبێت تێبینییەکانی ورد بێت لە ڕووی چەندێتی و چۆنیەتییەوە، لەسەر توێژەر پێویستە پەنا بۆ پێوانەکردن بەرێت ئەگەر بۆی کرا، هەروەها لەسەری پێویستە سووربێت لەسەر لۆژیکیبوونی تێبینیەکانی و گونجانی لەگەڵ تێبینییەکانی دیکەدا.

٤. دەبێت تێبینیکار توانا و ئامادەیی تێبینیکردنی هەبێت و بتوانێت ئەنجامی بدات، ئەمەش پێویستی بە تەندروستی هەست و دووربون لە دڵەڕاوکێ و گرژی هەیە لە کاتی ئەنجامدانی، دەبێت توانای چاودێریکردن و جەختکردنەوەی هەبێت لەسەر ئەو شتانەی کە تێبینیان دەکات.

٥. دەبێت بە خێراییترین کات تێبینییەکانی تۆمار بکات، چونکە پشت بەستن بە یادەوەری شتێکی مسۆگەر نییە.

٦. پلاندانان بۆ تێبینیەکان لە پێشوودا، ڕاهێنانی تێبینیکار لەسەری، دڵنیابوونەوە لەوەی کە مەعریفەی پێویستی هەبێت بۆ تێبینیکردن.

٧. دەبێت تێبینیکار پشت بە هەموو ئامراز، یان کەرەستەکانی نموونە هەڵبژاردن ببەستێت بۆ وردی تێبینیکردن و کۆنترۆڵکردنیان، وەك ڕیکۆردەر، یاخود کامیرا، یاخود تاقیکردنەوە دەروونییەکان....هتد.

## ٢. جۆرەکانی تێبینیکردن

بەشێوەیەکی گشتی تێبینیکردن دوو بەشە، ئەوانیش:

### أ. تێبینی هەرەمەکی، یاخود سادە

هەندێك ئەم جۆرەبە تێبینیکردنی کاڵ ،یان پێنەگەییو ناو دەبەن ،بریتیە لەو جۆرەی تێبینیکردن کە هەر مرۆڤێك ڕۆژانە لە بارودۆخی ژیانی ئاساییدا ئەنجامی دەدات، تێبینی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و ڕەفتاری تاکەکان دەکات بێئەوەی پابەند بێت بە نەخشەیەك، یاخود هەوڵی دەستەبەرکردنی ئامانجێك بدات، یاخود ئەو دیاردە ڕاڤە بکات کە دەیبینێت. لە پێشوودا ئەوەمان ڕوونکردەوە کە ئەم جۆرە بە تێبینیکردن بە مەبەستی توێژینەوەی زانستی هەژمار ناکرێت، بەڵام دەتوانین بڵێین کە دەکرێت تێبینی ئاسایی هۆکارێك بێت بۆ سەرنجراکێشانی توێژەر بۆ هەر دەیاردەیەك، بەمەش بڕیار دەدات هەڵی بژێرێت بۆ ئەوەی توێژینەوەی بکات، لەوکاتەدا تێبینیە هەرەمەکییەکەی بۆ تێبینیکردنی زانستی دەگۆڕێت.

### ب. تێبینیکردنی زانستی، یاخود ڕێکخراو

ئەمەش تێبینیکردنی بەرنامە بۆداڕێژراوە کە توێژەر لە پێشوتردا پلان و ڕێسا و دیسپلینی بۆ دادەنێت، لە میانەیەوە دەیەوێت بچێتە نێو قوڵایی

دیاردەکە و یاساکانی ئاشکرا بکات، بەدوای پەیوەندییە شاراوەکانی نێو توخمەکەکانی و دیاردەکانی دیکەدا بگەڕێت.

تێبینیکردنی زانستی پێویستی بە توانایەکی عەقڵی و هەستەکی بەهێز هەیە کە وای لێدەکات بە وردی هەقیقەتی دیاردەکە ئاشکرا بکات و ڕاڤەی بکات. هەروەها پێویستی بە بوونی توخمی بابەتیبوون هەیە لای تێبینیکار، هەروەها دەبێت ئازاد بێت لە نەریت و خوو و هزرە پێشینەکانی، هەروەها هەلگری ڕۆحی ڕەخنە و شیکردنەوە و دەستنیشانکردنی ورد بێت بۆ ئەوەی پەلە پەل بکات لە گەیشتن بە ئەنجامەکان.

**١) تێبینیکردن بێ بەشداریکردن**

بریتییە لە تێبینیکردنی دیاردەیەك لە لایەن توێژەر بێئەوەی بەشداری لە کارەکان بکات، وەك ئەوەی توێژەر ئامادەی گفتوگۆی لێژنەکانی پەرلەمان بێت و تێبینینەکانی بنوسێت بێئەوەی بەشداری لە کاری ئەو لێژنانە بکات. یاخود توێژەینەوەی دیاردەی سوالکردن بکات لە میانەی چاودێریکردنی سوالکەرەکە و تێبینکردنی ئامرازەکانی لە کاتی سوالکردندا، لە پاڵ شێوازی ژیان و پەیوەندی بە خەڵك، هەموو ئەو تێبینیانەشی تۆمار دەکات.

**٢) تێبینیکردن بە بەشداریکردن**

بەپێچەوانەی یەکەم، ئەو کاتە ڕوو دەدات کە توێژەر بەشداری دەکات لە دیاردەی تێبینیکراو، لە هەردوو نموونەی پێشوودا توێژەر دەبێت بەشداری کار و گفتوگۆکانی لێژنەی پەرلەمانی بکات کە جێگای توێژینەوە و تێبینیکردنییەتی، ئەمەش پێویستی بەوە هەیە کە توێژەر ئەندامێك بێت تیایدا، لە نموونەی دووەمیشدا توێژەر بەشداری دەکات لە ژیانی

سـوالْکەرەکان، لـە گەرەکـەکانیان دەژیـت و جلـی ئـەوان دەپۆشـێت، سوالْدەکات و خۆی دەخاتە شوێنی ئەوان تاوەکو شتە شاراوەکانیان بزانێت. توێـژەرە کۆمەلاّیەتییـەکان شـێوازی تێبینیکـردن بـە بەشـداریکردنیان بەکارهێناوە لەو توێژینەوانەی کە لەسـەر گروپـە بەراییـەکان ئەنجامیانداوە، بەشێوەیەك بەشدارییان کردووە لە ژیانی هەندێك هۆز بۆ ئـەوەی بتـوانن بـە وردی لە ژیانی ئەو گروپانە تێ بگەن.

### ٣. ڕەخنەگرتن لە شێوازی تێبینیکردن

چەندین ڕەخنە ئاڕاستەی تێبینیکردن کراوە وەك ئامرازێـك لـە ئامرازەکـانی کۆکردنەوەی زانیاری، بەهۆی ئەو هەلاّنەی کە ئەو شێوازە دەکەوێتـە نـاوی، گرنگتریا ئەو ڕەخنانەش:

١. سەختی تێبینیکردنی هەموو ئەندامەکانی کۆمـەلْگای توێژینەوەکـە لەیـەك کاتدا.

٢. سەختی پابەند بوون بە دیسپلینەکانی بابەتیبون لە کاتی تێبینیکردندا.

٣. لەو حالّەتەی بەشێوەیەکی بەردەوام تێبینـی کۆنەکاتـەوە، دەبێتـە هـۆی نائامادەیی گونجانی لۆژیکی و لـە دەسـتیدانی هـەلی تێبینیکردنـی هەنـدێك دیاردەی گرنگ.

٤. لە شێوازی تێبینیکردن بـە بەشـداریکردن، ڕەنگـە پەیوەنـدی هاوڕێیـەتی یاخود هاوسۆزی یاخود شـتی دیکـە دروسـت بێـت، بەمـەش تێبینیکـار دوور دەخاتەوە لە ڕاڤەکردنی زانستی بۆ دیاردەکە.

٥. لەو حاڵەتەی کە توێژەری تێبینیکار توانستە پێویستەکانی ئەنجامدانی تێبینیکردنی نەبوو بۆ نموونە مەزاجی تەواو نەبێت، یاخود بە پەلە بێت و تێبینکردنی نابێتە هۆی بەدەستهێنانی ئەنجامی داواکراو.

٦. تێبینیکردن وەك ئامرازێکی توێژینەوەکردنی سەرجەم دیاردە و کێشە کۆمەڵایەتییەکان بەکەڵك نایەت.

٧. گرنگی تێبینیکردن و بەهاکەی پوچەڵ دەبێتەوە ئەگەر ڕۆشنبیری کەسی تێبینیکار جیاواز بێت لە ڕۆشنبیری ئەو کەسانەی کە تێبینیان دەکات، یاخود ئەگەر بەشێوەیەکی باش لێیان تێنەگات.

٨. ئەگەر تێبینکار لە هەمان کاتی تێبینیکردنی، تێبینییەکانی تۆمار نەکات، ڕەنگە پەنا بۆ یادەوەری خۆی بەرێت، بۆیە ڕەنگە دووچاری لە یادچوون یان پەرتبوون لە ڕاڤەکاری بێت.

٩. جیاوازی هەیە لە نێوان ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دەرەکی و ڕەفتاری ناوەکی مرۆڤ.

## باسی دووەم:

## چاوپێکەوتن

### ١) پێناسەکردنی چاوپێکەوتن

بەشێوەیەکی گشتی چاوپێکەوتن، بریتییە لە سەردانیکردنی توێژەر بۆ لێتوێژراوان لە لە ماڵی خۆیاندا، یان لە شوێنی کارکردنیان، لە پێناو وەرگرتنی زانیاری کە بە بۆچوونی توێژەر لای لێتوێژراوەکان بوونی هەیە.

بەکارهێنانی شێوازی چاوپێکەوتن وەك ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە میتۆدی توێژینەوەی باردا باوە، هەروەها هەندێکجاریش لە توێژینەوە

ڕووپێوییەکان بە کاردەهێنرێت، شێوازی چاوپێکەوتن ئامرازێکی گرنگە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ئەگەر توێژەر بەباشی مامەڵەی لەگەڵ لێتوێژراودا کرد، چونکە خەڵکانێکی زۆر بەشێوەیەکی زارەکی حەز دەکەن زانیاری ببەخشن نەك بە نووسین، بەمەش چاوپێکەوتن گرنگییەکی زۆر دەبێت بە تایبەتی لای نەخوێندەوار یان منداڵان.

ئەگەر توێژەر ڕۆحێکی قۆشمەی هەبێت و قسەزان بێت و لە پرسیارکردندا زیرەك بێت، ئەوا دەتوانێت زانیاری چاکی بەدەست بکەویت، بە تایبەتی ئەگەر بتوانێت کارلێکێکی ورد لە کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ لێتوێژراو دروست بکات، توێژەر دەتوانێت لێتوێژراو هان بات و یارمەتی بدات بۆ قوڵبوونەوە لە بیرکردنەوە لە کێشەکە، بەوەی کە توانجی دژ، یاخود جوڵەی هاندەرانە ئەنجام بدات، یاخود بایەخ بە بابەتەکە بدات لە ڕێگای گوزارشتی ڕووخسار و جەستە و چەندان جوڵەی دیکە، ئەگەر توێژەر ڕەفتاری باش بوو دەتوانێت زانیاری نهێنیش لە لێتوێژراو بەدەست بهێنێن کە ڕەنگە لە ڕێگای تێبینکردن و پرسیارنامە بە دەستی نەکەوێت.

وەك باوە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانە ئەنجام دەدرێت، کە پەیوەندی ڕاستوخۆیان بە توێژینەوە هەیە. بۆ نموونە لە کاتی توێژینەوەکردنی پارتێکی سیاسی دەکرێت چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆك و جێگیری پارتەکەدا بکرێت، یاخود کۆمەڵێك لە ئەندامە دیارەکان، ئەوکاتەی توێژەرێك دەیەوێت توێژینەوەیەك لە بارەی کۆچکردنی عەقڵە عەرەبییەکان بکات بۆ دەرەوە و دەکرێت چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسە کۆچکردووانە بکات لە دەرەوە، هەروەها لەگەڵ کۆمەڵێك پسپۆڕیش لەم بوارەدا، بەمشێوەیە توێژەر پەنا بۆ

چاوپێکەوتن دەبات بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك یان زیاتر لەو ئامانجانەی خوارەوە:

١. چاودێکردنی خاڵێکی دیاریکراو لە بابەتێك بە مەبەستی دڵنیابوون لە ڕاستی هەندەکی ئەنجامە بەدەستهاتووەکان لە شوێنێکی دیکەدا.

٢. دڵنیابوونەوە لە بوارێك کە توێژینەوەیەك لە پێشووتردا دەری خستووە، بەڵام دەمانەوێت بزانین ئایا هیچ فاکتەرێك پەرەی سەندووە.

٣. قوڵبوونەوە لە کایەیەك کە بابەتە سەرەکییەکانی دەناسین، بەڵام بەشێوەیەکی تەواوی هیچ سیمایەکی ڕوون نییە.

٤. ئاشکراکردنی بوارێك کە نایناسین

**پرەنسییە سەرەکییەکانی چاوپێکەوتن**

یەکەم: کۆنترۆڵکردنی چاوپێکەوتن، ئەمەش بە پەیڕەوکردنی ئەو هەنگاوانەی خوارەوە دەبێت:

١. دیاریکردنی نموونە، واتە ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجام دەدرێت.

٢. دیاریکردن و ئامادەکردنی ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەی لێتوێژراو دەکرێت.

٣. دیاریکردنی وادەی چاوپێکەوتن پێش ئەنجامدانی، لە کاتی وادە دانانـدا ئەوە ڕەچاو دەکرێت کە کاتەکە لەگەڵ لێتوێژراو بگونجێت، بۆ ئەوەی بەناچاری بەسەریدا نەسەپێنرێت.

٤. ڕوونکردنەوەی مەبەست لە چاوپێکەوتندا، ئەمەش پێش دەستپێکردنی دەبێت، دەبێت توێژەر خۆی بناسێنێت، باشتروایە ناسنامەی کەسی لەلا

بێت، یاخود دەبێت مەبەستی لە ئەنجامدانی توێژینەوەکەی ڕوون بکاتەوە، ئەگەر لە پێشوودا توێژەر و لێتوێژراو یەکتریان نەناسی بێت.

**دووەم: پەیوەندی توێژەر و لێتوێژراو، ئەمەش ئەوانە لەخۆ دەگرێت:**

١. دەبێت توێژەر بە باشی جلوبەرگ هەڵبژێرێت، هەروەها شێوازی هەڵسوکەوتی لەگەڵ سایکۆلۆژیا و ئارەزووەکانی لێتوێژراودا گونجێت.

٢. نابێت توێژەر لە قسەکردندا وشەسازی بکات، دەبێت شێوازێکی ئاسایی بەکار بهێنێت، بەڵام بە زمانێکی تەندروست و ڕاست بۆ ئەوەی لێتوێژراو لێی تێبگات.

٣. دەبێت خۆی لەو بابەتانە بە دوور بگرێت کە لێتوێژراو شەرمەزار دەکات و هیچ پەیوەندییەکی بە مەبەستی چاوپێکەوتن نییە.

٤. دەبێت خۆی لە ماندووکردنی لێتوێژراو بە دوور بگرێت، ئەوکاتەش بوەستێت کە هەست بە کارنەدانەوەی نێوان خۆی و لێتوێژراو دەکەن.

٥. دەبێت توێژەر متمانە لای لێتوێژراتو دروست بکات، تاوەکو لێتوێژراو دڵنیا بێت هەموو ئەو زانیارییانە بە نهێنی دەمێننەوە و جگە لە مەبەستی توێژینەوەی زانستی بۆ هیچی دیکە بەکارناهێنرێن.

**سێیەم: ئاڕاستەکردنی پرسیار و بەڕێوەبردنی گفتوگۆ، ئەمەش ئەو خاڵانە لەخۆ دەگرێت:**

١. دەبێت توێژەر ڕەزامەندی خۆی نیشابدات بۆ ئەو قسانەی کە لێتوێژراو دەیکات، نابێت بچێتە ناو دەماقاڵەکردن و گومان بکات لە زانیارییەکانی لێتوێژراو.

٢. دەبێت توێژەر وا بکات لێتوێژراو هەست بەوە بکات کە ئازادە لە وەڵامدانەوەی پرسیار یاخود وەڵامنەدانەوە.

٣. دەبێت توێژەر خۆی بەدووربگرێت لە ئامۆژگاریکردن، یاخود خۆ دەرخستن وەك دەسەڵاتدار.

٤. خۆی لە پرسیاری ڕاستەوخۆی ڕاپۆتئامێز بە دوور بخات، پرسیارکردنی لەسەر شێوەی ڕوونکردنەوە بێت.

٥. دەبێت توێژەر خۆی لەو پرسیارانە بە دوور بخاتەوە کە لایەنگیری پێوە دیارە، نابێت توێژەر لایەنگیر خۆی بۆ لایەنێك نیشانبدات.

### ٢) جۆرەکانی چاوپێکەوتن(٢٧٣)

### یەکەم: چاوپێکەوتنی تاکی و چاوپێکەوتنی بە کۆمەڵ

جۆری یەکەم لەگەڵ یەك کەس ئەنجامدەدرێت، ئەمەش هەل بە لێتوێژراو دەدات بۆچوونی خۆی بدات بە ڕاستگۆیی لە بارەی دیاردەکە و هەست بە شەرمەزاری ناکات بەهۆی نەبوونی کەسی دیکە لەگەڵیدا.

هەرچی چاوپێکەوتنی بەکۆمەڵە، لەگەڵ کۆمەڵێك کەس ئەنجام دەدرێت لە بارەی هەمان بابەت، لە جیاوازییەکانی ئەمەی دوایی (لە حاڵەتی بوونی گونجان لە نێو تاکەکاندا)، گفتوگۆ دەوڵەمەند دەکات و لێتوێژراوان پاڵ دەنێت بۆ بە بیرهاتنەوە، بەمەش یارمەتی هەموو کەسێکی دیکە دەدات بۆ ڕوونکردنەوەی خاڵێك لە خاڵەکان، بەڵام لە کەموکوڕییەکانی چاوپێکەوتنی بە کۆمەڵ ئەوەیە دودڵ دەبن لە گوتنی نهێنی لە ئامادەیی کەسێکی دیکەدا.

---

٢٧٣- بۆ زانیار زیاتر پێشوو: ڕودولف غیغلیون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٧.

**دووەم: چاوپێکەوتنی فەرمی**

لەم جۆرەدا لە پێشتر ئەو بابەت و پرسیارانە دادەرێژێت کە گفتوگۆیان لە بارەوە دەکرێت و هەمان پرسیار و بەهەمان شێوە ئاراستەی لێتوێژراوەکان دەکرێت.

**سێیەم: چاوپێکەوتنی نافەرمی**

کراوە و ئارامە و پشت بە پرسیارگەلێکی دیاریکراو نابەستێت، بەڵکو قسەکردن تێیدا بە شێوەی هاوڕێیانە دەبێت، پرسیارەکان هەموار دەکرێت بەوشێوەیەی کە لەگەڵ کەسی لێتوێژراو بگونجێت. زۆرجار لەسەر خودی توێژەر و ناتیقی و خێرایی لە دەرککردن بە بابەتەکان و توانای لە بەڕێوەبردنی چاوپێکەوتن و هەڵسوکەوتکردن دەوەستێت بە شێوەیەك یارمەتی دەدات بۆ ئاشکراکردنی زانیارییە پێویستەکان.

هەروەها دەکرێت جۆرەکانی چاوپێکەوتن بۆ ئەوانە دابەش بکەین:

**١. چاوپێکەوتنی ئازاد**

داوا لە وەڵامدەرەوە دەکرێت بە شێوەیەکی گشتی و بە وشە و شێوازی تایبەتی خۆی وەڵامی پرسیارێکی گشتی (بابەتی توێژینەوە) بداتەوە کە بە ناڕوونی جیادەکرێتەوە.

**٢. چاوپێکەوتنی نیمچە ئاڕاستەکراو**

تیایدا توێژەر پێشتر شتێك لە بارەی بابەتەکە دەزانێت و دەیەوێت ڕوونکردنەوە لە لێتوێژراو وەربگرێت. داوای لە وەڵامدەرەوە دەکات بەشێوەیەکی گشتی و بە وشە و شێوازی خۆی وەڵامی بابەتەکە بداتەوە،

توێـژەر پرسـیاری ڕوونکـەرەوە دەکـات لـە لێتوێـژراو تـاوەکو وەڵامـدەرەوە بتوانێت وەڵام چێبگات لە بارەی بابەتەکە.

جیاوازی نێوان هەردوو جۆری پێشوی چـاوپێکەوتن، ئەوەیـە کـە توێـژەر لـە حاڵەتی یەکەمدا هیچ چوارچێوەیەکی پێشنەیی نییە، یاخود بە ویستی خـۆی لە یادی بکات، هەرچی لە حاڵەتی دووەمە، توێژەر ئەو جۆرە چوارچـێوەیەی هەیە، بەڵام مافی بـەکارهێنانی هـۆیـە ئەگـەر وەڵامـدەرەوە بەشـێکی لـە یـاد کرد.

واتە چاوپێکەوتنی نیمچە ئاراستەکراو تایبەتـە بـە قوڵکردنـەوەی مەیـدانێکی دیاریکراو، یاخود بۆ توێژینەوەکردنی پەرەسەندنی مەیدانێك کـە لـە پێشـوتر ناسراو بووە.

**٣. چاوپێکەوتنی ئاراستەکراو**

کۆمـەڵێك پرسـیاری کراوەیـە، بـە گـوێرەی نەخشـەیەکی داڕێـژراو دەخرێتـە بەردەم وەڵامدەرەوەکان.

سـەرەڕای گرنگـی شـێوازی چـاوپێکەوتن وەك ئامرازێـك بـۆ کۆکردنـەوەی زانیارییەکان، کەچی چەندین کەموکوڕی هەیە، لە نێویاندا پێویستی بە کـات و کۆششێکی زۆر هەیە، هەروەك تێچووی زۆرە ئەگەر ژمارەی لێتوێـژراوەکان زۆر بن. هەروەها سەرکەوتنیشی پشت بـە ئـارەزووی وەڵامـدەرەکان لـەکاتی قسـەکردن دەبەسـتێت، لـە پـاڵ توانایـان لـە گوزارشـتکردن لـەوەی کـە دەیانـەوێت بیڵـێن، هەنـدێکجار هاوسـۆزی، یـان بێـزاری لـە نێـوان توێـژەر و لێتوێـژراو ڕوو دەدات کـە کاریگـەری لەسـەر ڕێـڕەوی چـاوپێکەوتن و بـەها زانستییەکەی دەبێت

# باسی سێیەم
# پرسیارنامە

ئامرازێکە لە ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە لێتوێژراوەکانی پەیوەست بە دیاردەکە یان گرفتی توێژینەوەکە. پرسیارنامە بە یەکێك لە کەرەستەکان دادەنرێت لە نێوان توێژەر و لێتوێژراودا، زۆرجار توێژەر پەنا بۆ شێوازی پرسیارنامە دەبات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ئەوکاتەی کارەکە پەیوەستە بە کۆکردنەوەی زانیاریگەلێك کە پەیوەندیان بە هەست و پاڵنەر و بیروباوەڕی تاکەکان هەیە لە بارەی بابەتەکە. هەروەها لە تەواوی ئەو حاڵەتانەی کە ناکرێت بە ئاسانی زانیاریان لەبارەیەوە کۆبکەینەوە لە ڕێگای تێبینیکردن، هەروەها هەندێك جار لە چاوپێکەوتنیش بەکاردەهێنرێت، ئەمە لەو رووپێوانە بڵاوە کە توێژەر ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوی لێتوێژراو نابێتەوە.

چەندین پێناسە بۆ پرسیارنامە پێشکەشکراوە لەوانە (کۆمەڵێك پرسیاری ڕێکخراوە لە بارەی بابەتێکی دیاریکراو و لە پرسیارنامەیەکدا دەادەنرێت و بۆ کەسە پەیوەندیدارەکان دەنێردێت بە هۆی پۆست، یان بە دەست بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانمان لێیان بەدەست بکەوێت).

هەوەها پێناسە کراوە بەوەی کە (ئامرازی کۆکردنەوەی زانیارییە سەبارەت بە بابەتی توێژینەوە لە ڕێگای پرسیارنامە کە لە لایەن وەڵامدەرەوە پڕ دەکرێتەوە)[٢٧٤].

---

[٢٧٤]- فوزي غرايبة، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٣.

چەندین شێواز هەیە بۆ گەیاندنی پرسیارنامە بە لێتوێژراو:

### ١. پرسیارنامەی پۆستکراو

لە رێگای پۆستەوە ،فۆرمی پرسیارەکان دەگاتە کەسانی پەیوەندیدار یان ئەندامانی نمونەی توێژینەوەکە، ئەمەش ئاسانترین رێگایە و تێچوی کەمترە بە بەراورد بە ئەوانی دیکە. ئەگەر کەسە لێتوێژراوەکان ناونیشانیان ناسراو بێت، باشتروایە زەرفێکی بەتاڵیش لەگەڵ پرسیارنامەیەکدا هەبێت بۆ ئەوەی پرسیارنامەکە بگەرێننەوە، بەڵام لە کەموکورییەکانی ئەو شێوازە ئەوەیە کە گەیشتنی پرسیارنامە بە لێتوێژراوەکە مسۆگەر نییە، ئینجا چ بە هۆی گۆرانی ناونیشانیان یان هەڵەی پۆستە یان بەهۆی گەشتکردنیانەوە.....هتد. هەروەها ئەوە مسۆگەر نییە کە وەڵامدەرەوەکان پرسیارنامە ەکە بگەرێننەوە بەهۆی سەرقاڵیان و بایەخنەدانیان بە بابەتەکە. هەروەها نازانرێت کێ وەڵامی پرسیارەکانی پرسیارنامەکەی داوەتەوە، رەنگە پرسیارنامەکە بۆ کەسێك بنێردێت و کچەکەی یان براکەی یان یەکێك لە فەرمانبەرەکانی وەڵام بداتەوە.

### ٢. پێدانی پرسیارنامەکە بە دەست

لە خەسڵەتەکانی ئەم جۆرە ،وەرگرتنی فۆرمەکە زامنکراو ومسۆگەرەو هەروەها خێراتریشە، بەشێوەیەك توێژەر دەتوانێت پرسیارنامە لە یەك رۆژ یان چەند کاتژمێرێك بە وەڵامدەرەوەی بگەیەنێت، لە پاڵ ئەوەی کە وادەکات لێتوێژراو هەست بە گرنگی بابەتەکە بکات ئەوکاتەی خودی توێژەر دەبینێت یان ئەو کەسەی لە جیاتی ئەو هاتووە و پرسیارنامەکە بڵاودەکاتەوە و بابەتەکەی بۆ روووندەکاتەوە، داوای لێدەکات وەڵامبداتەوە،

داوای دیاریکردنی کاتی گەڕانەوەی پرسیارنامەکەی لێی دەکات، بەڵام کەموکوڕییەکانی ئەو جۆرە ئەوەیە کە تەنیا لە کاتێکدا سوودی هەیە کە ژمارەی ئەندامانی نموونەکە کەم بێت، لە یەك ناوچەی جوگرافیدا بژین، هەروەها ئەم شێوازە بە تێچوە و ماندوکەریشە.

**باسی دووەم: پرسیارەکانی پرسیارنامە**

ئاستی سەرکەوتنی پرسیارنامە بە ئاستی سەرکەوتنی توێژەرەوە بەستراوەتەوە لە دانانی پرسیاری گونجاو لە ڕووی مانا و شێوازەوە، هەرچەندە پرسیارەکانی پرسیارنامەکە ڕوون و ورد و ڕاستەخۆ سەر بە بابەتی توێژینەوە بێت و هیچ هەستیارییەك لای لێتوێژراو دروست نەکات، ئەوا هێندەی دیکە زانیارییە کۆکراوەکان گرنگی زیاتر دەبێت.

بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر سەرەکی پرسیار هەیە، ئەوانیش پرسیاری کراوە و پرسیاری داخراون.

یەکەم: لەسەر وەڵامدەرەوەکان پێویستە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە بە گوێرەی بۆچونی خۆی، لێرەدا ئازادی بە لێتوێژراو دەدرێت وەڵامەکانی دیاری بکات بەگوێرەی ویست و بیرکردنەوەی خۆی، ئەو پرسیارانە ڕێگا بە چەند وەڵامێك دەدات کە توێژەر لە بنەمادا بیری لێ نەکردۆتەوە لە کاتی دانای پرسیارنامە و نموونەش لە سەر پرسیاری کراوە:

- گرنگترین گرفتە کۆمەڵایەتیە باوەکانی کۆمەڵگا چین ؟
- گرنگترین ئەو بابەتانە چین کە دەبێ بیانخوێنیتەوە؟

لە کەموکوڕییەکانی ئەو جۆرە پرسیارە ئەوەیە کە لێتوێژراو لەو بابەتە دەردەچێت کە مەبەستی توێژەرە، دەچێتە نێو ڕوونکردنەوە و ڕاڤەکاری کە

پەیوەندی بە جەوهەری گرفتەکەوە نییە، هەروەها درێژی وەڵامدانەوەکانیش یەکێکی دیکەیە لە کەموکورییەکان، کە ئاستەنگ بۆ توێژەر دروست دەکات لە کاتی جیاکردنەوەی پرسیارنامەکان و بەتاڵکردنەوەی زانیارییەکان.

دووەم: زیاتر جەخت دەکرێتە سەر وەڵامدانەوە تیایدا ، بەشێوەیەك وەڵامەکان لە لایەن توێژەرەوە دیاریکراون ، بەهۆی دانانی چەند وەڵامێك و تەنیا پێویستە لێتوێژراو یەکێکیان هەڵبژێرێت.

پرسیاری داخراو بە باشتر دەزانرێت لە پرسیاری کراوە، چونکە گونجانێك لە وەڵامەکان دروست دەکات، هەروەها دەکرێت بە ئاسانی پرسیارەکان قۆڵتر بکرێت ئینجا چ بە دەست بێت یان بە هۆی کۆمپیوتەر بێت، لە کەموکورییەکانی ئەوەیە کە توێژەر شکست دەهێنێت لەوەی کە هەندێك وەڵامی گرنگی بە دەست بکەوێت، هەروەك وەڵامدەرەوە یان لێتوێژراو هەلی گوزارشتکردنیان نییە لە بۆچوون و بیروباوەڕەکانیان، هەندێکجار هەست ناکەن ئەو وەڵامانەی کە توێژەر دایناوە لەگەڵ هەڵوێستی ئەوان لە بارەی بابەتەکە دەگونجێت، بۆ خۆ دوورگرتن لەم حاڵەتی دوایی وشەی (هیتر) دوای وەڵامەکان دادەنرێت بۆ ئەوەی بوار لە بەردەم لێتوێژراوەکان بڕەخسێنێت ئەو وەڵامە بنووسێت کە خۆی بە گونجاوی دادەنێت.

**نمونەگەلێك لەسەر پرسیارە داخراوەکان:**

ئایا لەگەڵ پۆشینی بالاپۆشدای لە دامەزراوە پەروردەییەکان؟

بەڵێ (   )     نەخێر (   )

بۆچونت چییە لە بارەی بە تایبەتیکردنی کەرتی گشتی؟

لەگەڵیدام (   )     لەگەڵیدا نیم (   )     نازانم (   )

ئایا کۆکی لەگەڵ بوونی عەلمانییەت لە جیهانی عەرەبیدا؟

لەگەڵیدام (     )     لەگەڵیدا نیم (     )     نازانم (     )

لەم پرسیارانەدا وەڵامەکان بە دیاریکراوی دەخرێنە بەردەم لێتوێژراو و بواری ئازاد بۆ وەڵامدەرەوە بەجێنەهێشراوەوە.

ئینجا چ پرسیارەکان داخراو یان کراوە بن، لەسەر توێژەر پێویستە ئەو شتانە لە پرسیارەکانی خۆیدا ڕەچاو بکات:

١. ڕوونی پرسیار و دیاریکردنی ئەو شتانەی کە دەیەوێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ: بە هۆی بایەخدانی توێژەر بە کێشەکەی بۆیە دەستەواژە و پرسەکان بۆ خۆی ڕوونن، بەڵام بەمشێوەیە ڕوون نییە لای لێتوێژراو، لەسەر توێژەر پێویستە لێتوێژراو بە هەمان ئاستی تێگەیشتنی خۆی لە کێشەکەی دانەنێت، بەمپێیەش لەسەری پێویستە پرسیارەکان بەشێوەیەکی ڕوون و دیاریکراو دابڕێژێت و گومان و هەڵە تێگەیشتنی تێدا نەبێت، بۆ ئەمەش پێویستە خۆمان لە وشەی ناڕوون و ئاڵۆز و بە باق و بریق بە دووربخەینەوە.

٢. واباشە پرسیارەکان کورت بن: هەندێکجار پرسیاری درێژ بێزارکارە یان ئاڵۆزە، هەروەك ڕەنگە ببێتە هۆی لێتوێژراو لە وەڵامدانەوە، هەرچەند پرسیارەکە کورت بێت ئەوەندە لێتوێژراو زیاتر هاندەدەیت بۆ وەڵامدانەوە.

٣. خۆدوورخستنەوە لە وەڵامی دوولایەنە یان ئاوێتە: واتە ئەو پرسیارەی کە دوو پرسیار یان زیاتر دەکات، باشتروایە پرسیارەکان لە یەکتر جیابکرێنەوە.

٤. خۆ دوورخستنەوە لە پرسیاری لایەنداری: واتە چەندین وشە یان چەمکی تێدایە کە لایەنگیریان پێوەدیارە، بۆ نموونە ئایا کۆکی لەگەڵ ئەو بۆچوونە

باوەی کە دەڵێت......، وشەی باو لێرەدا لایەنگیریە، چونکە ئەوە بۆ وەڵامدەرەوە دەردەخات کە زۆرینە کۆکن لەسەر ئەو بۆچوونە.

٥. بەیادهاتنەوەی ئامانجەکانی توێژینەوەکەی، لەسەر توێژەر پێویستە لە کاتی دارشتنی پرسیارەکانی کێشەی توێژینەوەکەی لە یاد بێت، نابێت چەند پرسیارێك دابنێت کە پەیوەندییان بە کێشەی توێژینەوەکەی خۆی نەبێت.

٦. هاندانی لێتوێژراو بە ئاراستەکردنی پرسیارێك کە سەرنجی ڕابکێشێت، دەبێت ئاسان بێت و هانی بدات بۆ بایەخدان بە پرسیارەکان.

٧. دەبێت ژمارەی پرسیارەکانی پرسیارنامە مەعقوڵ بێت و لێتوێژراو ماندوو نەکات، باشتروایە لە سی پرسیار زیاتر نەبێت.

٨. باشتروایە پرسیارەکان پەیوەندییان بە یەکتر هەبێت بەشێوەیەکی سیستماتیکی و عەقلانییانە و ڕەنگدانەوەی یەکێتی بابەت بێت.

٩. دەبێت توێژەر خۆی لە وروژاندنی پرسیاری شەرمەزارکەر بە دوور بگرێت لە فۆرمەکەیدا بۆ لێتوێژراو، وەك ئەو پرسیارانەی کە باس ژیانی کەسی دەکات و نایەوێت ئاشکرای بکات، یاخود چەند پرسیارێك کە پەیوەستە بە بیروباوەڕی ئایینی ...هتد.

بەڵگەنەویستە هەموو ئەو پرسیارنامەی کە بەسەر ئەندامانی نموونەی توێژینەوە بڵاودەکرێتەوە هەمان پرسیاری تێدایە، ناکرێت توێژەر پرسیارەکان زیاد یان کەم بکات، هەر کە توێژەر دەچێتە مەیدان بۆ دابەشکردنی پرسیارنامە، ڕێگای ئەوەی لێدەگرێت دەستکاری یان گۆڕانکاری لە پرسیارەکاندا بکات، ئەوەی جۆری پرسیارەکان دیاری دەکات کێشەی

توێژینەوەیە نەك هەستدانەوەكانی (انطباع) لە كاتی چاوپێكەوتنی لەگەڵ لێتوێژراوەكان[٢٧٥].

**باسی سێیەم: ئەو كەموكوڕی و هەڵانەی لەپرۆسەی پرسیارنامەدا دێن**

پرۆسەی پرسیارنامە وەك هەر هەنگاوێك لە هەنگاوەكانی توێژینەوە چەندین تەوەری تێدایە، هەندێكیان پەیوەندی بە تەكنیكی پرسیارنامە هەیە، وەك دارشتنی پرسیار و شێوازی دابەشكردن، هەندێكی دیكەیان پەیوەندییان بە كەسەكان هەیە، واتە بابەتییبوون لە لایەنی خودی توێژەر یان لە لایەن لێتوێژراوەكان.

**ئێستاش هەندێك لەو كەموكوڕ و هەڵانە دیاری دەكەین:**

١. جیدینەبوونی پرسیارەكان، بۆ نموونە پرسیارەكان لە بارەی بابەتەكەوە بێت هەموو كەس بزانێت یان لە سەرچاوەكانی دیكە دەستی بكەوێت، ئەمەش دەبێتە هۆی بیزاربوون ونا بەدڵی لێتوێژراوەكان، بەتایبەتی ئەگەر زانیارییە داواكراوەكان سادە یان بێمانا بێت و لەگەڵ بیركردنەوەی لێتوێژراو نەگونجێت.

٢. دارشتنی پرسیارەكان بە زمان و شێوازێكی ئاڵۆز ومایەی تێگەیشتن نەبێت، یاخود ئەگەری وەڵامی دژییێكی تێدا بێت.

٣. بەكارهێنانی پرسیارنامەی درێژ كە لێتوێژراو لە پركردنەوەی بێزا دەبێت، یان زیاتر لە پرسیارنامەیەك بۆ هەمان لێتوێژراو بنێردێت.

---

[٢٧٥]- رودولف غیفلیون، سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٩.

٤. لایەنگیری ئەو کەسەی کە پرسیارنامە ئەنجام دەدات، یان بیەوێت چەند وەڵامێکی بەدەست بکەوێت کە سروشتێکی تایبەتیان هەبێت لە پێناو سەلماندنی دروستی گریمانەکانی.

٥. سپۆنسەرەکان یان سەرپەرشتیارەکانی توێژینەوە رۆڵ دەبینن لە لادانی ئەنجامەکان لە خزمەتی بەرژەوەندی سپۆنسەرەکان.

٦. دیزایینکردنی پرسیارنامە بەشێوەیەکی ورد، ڕەنگە ببێتە هۆی ناوردی لە وەڵامەکان.

٧. ئەگەر سستیەك لای لێتوێژراوەکان هەبوو لە وەڵامدانەوەی پرسیارنامەدا.

٨. جێگیرنەبوونی وەڵامی وەڵامدەرەوە، زۆرجار وەڵامی وەڵامدەرەوەکان جیاوازە بۆ هەمان پرسیار دوای بەسەرچونی ماوەیەکی کورت.

٩. لە کاتی بەتاڵکردنی پرسیارنامەکان، ڕەنگە توێژەر مەبەستدارانە هەندێك لەو وەڵامانە فەرامۆش بکات کە لەگەڵ گریمانە و بیروبۆچونەکانی نەگونجێت.

کەموکورییەکانی نێو پرسیارنامەکان لە پرسیارنامەکانی ڕای گشتی ڕوونتر بەدەردەکەوێت، کە سروشتێکی سیاسی هەیە، بەشێوەیەك ئەوانەی ڕاپرسی ئەنجامدەدەن لە ژێر پەردەی زانستی و زۆرینەی بۆچوونەکان سیاسەت و هەڵوێستەکانی خۆیان دەسەپێنن، بەڵکو هەندێك جار ڕای گشتی دەشێوێنن، ئەو پرسیارانەی کە لە خۆیاندا حوکمی بەهایی یان ڕوانگەی لایەندار، یان هەڵوێستێکی دیاریکراو دروستدەکەن، وەڵامدەرەوە سنوردار دەکات لە نێویدا لە میانەی بەشداریکردنی لە هەمان پرۆسەی ڕاپرسیدا، گرنگتریش لەمە کاریگەری ئەمەیە لەسەر ڕێکارەکانی زانیاری کۆکردنەوە،

بەشداربووانیش تێدەپەڕێنێت لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، گەلێك دەخاتە ژێـر کاریگـەری ئـەو ئەنجامانـەی کـە لـەم ڕاپرسـییەدا بـۆ ڕای گشـتی بەدەستهاتووە(٢٧٦).

لە هەمان نێوکۆدا نۆمان نای تێبینی ئەوە دەکات کە "لەسـەرمان پێویسـتە دەرك بە ئەفزەڵیاتەکانی نێو پرسیارنامە لـە میانـەی نموونـەی هەڵبـژێردراو، ئینجا چ ئەلیکترۆنی یان نائەلیکترۆنی بکەین، بەمەش بە تەواوی جیـاوازە لـە ڕووی سروشتی ئەوانەی کە بژاردن پێشـکەش دەکـەن ئەوکاتـەی هاووڵاتیـان خۆبەخشانە هاوکاریت لەگەڵ دەکەن".

لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونانەی کە پرسیارنامە گوزارشتی لێدەکات، بریتییـە لـە وەڵامدانەوەیەکی ڕووکەشی کێشە، یان پرسەکانن هـیچ کـاتێکیش بابـەتێکی بە بایەخ نەبووە لای وەڵامدەرەوەی پرسیارەکان.

زۆرجـار بـە ڕادەی پێویسـت پرسـەکە بـۆ ئـەو ڕوون نییـە، هـەروەك ئـەو بۆچـوونەی کـە دەیخاتـەڕوو لەسـەر توانایـەکی سـنووردار دروسـتبووە، یـان زانیاری تەواوی تێدا نییە(٢٧٧).

---

٢٧٦- هربرت شیللر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١٦.

٢٧٧- هەمان سەرچاوە، لا ٢١٦.

## بەشی شەشەم

# نووسینی راپۆرتی توێژینەوەکە

نووسینی راپـۆرتی توێژینەوەکـە هـەنگاوی کۆتاییـە لـە پرۆسـەی توێژینـەوە کردندا، لەم پرۆسەیەشدا پێوستە توێـژەر شـارەزاییەکی وای هـەبێت هیچـی کەمتر نەبێت لـەو شـارەزاییانەی کـە لـە هـەنگاوەکانی دیکـەی ئامـادەکردنی توێژینەوەکەی پێویسنی پێیەتی. لە ڕێگای راپۆرتی کۆتایی توێژەر پوختەی کۆشـش و هـەوڵ وتەقـەلاکانی دەخاتـەڕوو، خـەڵك چـاوی لـە هـەنگاوەکانی توێژەر و پرۆسەی توێژینەوە و گرفـت و ئاسـتەنگەکانی نیـە، تاکـە رایەڵـەی پەیوەنـدی نێـوان خـەڵك و توێـژەر راپـۆرتی توێژینەوەیـە، یـان بـاوەڕ بـە خوێنەرانەکانی دێنێت ،توێژەر لە دانانی گرفـت و گریمانـە و کـۆی کارەکـەی سەرکەتوو بوو، بەشێوەیەکی ڕوون چارەسەری بۆ دۆزیوەتەوە، یان لە کار و توێژینەوەیدا شکستی هێناوە و نەیتوانیووە شتێك بۆ مەعریفە زیاد بکات.

نووسینی راپۆرت پێویستی بەوە هەیە کە توێژەر وریا بێت و زۆر بایـەخ بـەم کارەی بدات و بە وردی شێوازی نووسین و زمان و ئەو شێوەیە هەڵبژێرێت کە لەگـەڵ مەرجـە زانسـتییەکانی نووسـین و ئاسـتی ڕۆشـنبیری ئـەو توێـژەری جەماوەر دەگونجێـت، کـە ڕەنگـە زیـاتر لـە ئـەوانی دیکـە بایـەخ بـە بابـەتی توێژینەوە بدەن.

ئەگەرچی نووسین لەڕوی شێواز و مەرجەکان جیاوازە لە نێوان نووسینی ئەکادیمی زانکۆیی کە پابەندە بە چەندین کۆتوبەند و دیسپلینی زانستی توند و نووسینی نائەکادیمی کە خەڵکانێك یان دامەزراوەیەکی جیاواز دەینووسین، ڕەنگە نوسین لە بواری دووەمدا زیاتر ئازاد بێت وەك لە جۆری یەکەم، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی نووسینی زانستی لەگەڵ نەخشەکە دەگونجێت لە چوارچێوە گشتییەکەی، ڕەنگە لە شتە بەشییەکاندا جیاوازی هەبێت، ئەم جۆرە نووسینەش لەسەر دابەشکردنی بابەتەکان بۆ توخم و پێکهێنەرە سەرەکییەکان دەوەستێت، ئەوانەش بابەتی بەرایی و ناوەڕۆکی بابەت و سەرچاوە و پەراوێزەکانن.

## باسی یەکەم
## بابەتە بەراییەکان

**١. ناونیشان**

لە هەڵبژاردنی ناونیشانی توێژینەوەدا دەبێت توێژەر ڕەچاوی ڕوونی و کورتی بکات، خۆی لە وشەی ناڕوون دووربخاتەوە، ناونیشانی باش و ڕوون سەرنجی خوێنەران ڕادەکێشێت و بیرۆکەیەکی ڕاستەوخۆی پێدەدات لە بارەی بابەتەکە، پێش ئەوەی سەیری لاپەڕەکانی دیکەی بکات. بەداخەوە هەندێکجار بەدوای ناوبانگ و فریودانی خوێنەر دەچن و توێژەر ناونیشانێکی بۆ توێژینەوەکە هەڵدەبژێرێت کە زەق و جێگای سەرنجە، بەلاّم ناوەڕۆکی باسەکە هیچ پەیوەندییەکی بە ناونیشانەکەوە نییە، ئەمەش شێوازێکە ئەوانە پەنای بۆ دەبەن کە تازەن لە نووسین و دەیانەوێت بەناوبانگ بن لەسەر حیسابی دەستپاکی زانستی و هەقیقەت، ئەمەش هاوشێوەی ئەو

پۆستەرانەیە كە بەسەر ڕووی دەرەوەی ماركێتەكان هەڵواسراوە، لە میانـەی خوێندنەوەی ئاشنا دەبین بە جۆری ماركێت و ئەو كاڵایانەی كە تێیدا هەیە.
هەرچی خەسڵەتی دووەمـی ناونیشـانی سـەركەوتووە، ئـەوا كورتبڕییـە، بـەو مانایەی ناكرێت ناونیشان لـە وشـەیەك یـان چـەند وشـەیەكی كەمـەوە ببێتـە چەندین ڕستە و پەرەگراف، ناونیشانی باش ئەوەیە كە تـا بكرێـت وشـەكانی لە دێرێك درێژتر نەبێت. لە حاڵـەتی ناونیشـانی درێـژدا بـە شـێوەی هـەرەمی سـەراوژێر دەنووسـرێت، وابـاوە ناونیشـان لـە ناوەڕاسـتی یەكـەم لاپـەڕە دەنوسـرێت، ئەگـەر توێژینەوەكـەش ببێـت بـە كتێـب لەسـەر بەرگەكـە دەنووسرێت.

## ٢. لاپەڕەی ناوەڕۆكەكان (ناوەڕۆك دروستكردن)

ئەمە لە سـەرەتای توێژینەوەكـە دادەنرێـت، هەنـدێك پێیانباشـە لـە كۆتـایی دابنرێـت، ئـەم بەشـە پوختەیـەكی كـورت و گشـتی لـە بـارەی نـاوەڕۆكی توێژینــەوە بــە خوێنــەر دەبەخشــێت، یارمــەتی خوێنــەر دەدات بــەخێرایی ئاشـنای بابەتـەكان بـێ و ژمـارەی لاپـەڕەكانی پێـدەدات. لـە لاپـەڕەی ناوەڕۆكەكان ناونیشانە سەرەكییەكە دەنوسرێت بە هێڵـی گـەورە و ڕوون لـە ناوەڕاسـتی لاپەڕەكـە، هەرچـی ناونیشـانە لاوەكییەكانـە ئـەو لـە تەنیشـتی لاپەڕە و بە هێڵی بچووك دەنووسرێن. لە هەردوو حاڵەتـدا دوای ناونیشـانەكە چەن خاڵێك دادەنرێـت و دوایـی ژمـارەی ئـەو لاپەڕەیـەی كـە ناونیشـانەكەی تێدایە.

## ٣. پێشەكی

سەرەڕای ئەوەی كە پێشەكی بەشێكی سەرەكییە لە نووسینی ڕاپۆرت، ئـەوا ئێمە پێمان باشترە تێكەڵی مادده بەراییەكانی بكەین، چونكە بـە ڕاسـتی لـە بەرایی و دەستپێكی بابەتەكەیە و پوختی دەكاتەوە بەوەی كـە بیرۆكەیـەكی چڕی پێدەبەخشێت لە بارەی ڕەهەندەكانی توێژینەوەكەی.

لە پێشـەکیدا توێـژەر گرفتی توێژینەوەکـەی دەخاتـەڕوو، خاڵـە سـەرەکی و لاوەکییەکان ڕووندەکاتەوە، لە پـاڵ ئـەو هۆکارانـەی کـە وای لێکـردووە ئـەم گرفتـە هەڵبـژێرێت لەگـەڵ ئامـانجی توێـژەر لـەم توێژینەوەیـەدا. هـەروەها پەیوەنـدی نێـوان گـرفتی توێژینەوەکـە و تیـۆرە زانسـتییەکانی لـە بـارەی بابەتەکە و ئـەو توێژینەوانـەی کـە لـە بـارەی هـەمان بابـەت بڵاوکراونەتـەوە ڕووندەکاتـەوە. هـەروەها توێـژەر هـەر سـێ بـواری توێژینەوەکـەی دیـاری دەکات: مرۆیی، شوێن، کات. ئەگەر سروشتی توێژینەوە پەیوەست بێت بـەم بوارانە و باس لەو گریمانانە دەکات کە داینـاون و دەیەوێت بیانسەلمێنێت.

لە پێشەکیدا توێژەر ئەو ئاستەنگانە ڕووندەکاتەوە کـە ڕووبـەڕووی بۆتـەوە، ئینجا چ لـە ڕووی کـەمی سەرچـاوە، یـان زۆری، یـان ئـەو ئاسـتەنگانەی کـە پەیوەستن بە دیاریکردنی نموونـە یـان هەڵبـژاردنی ئامرازەکـانی توێژینـەوە.

هەندێك پێشەکی هەیە سوپاسکردنی مامۆستای سەرپەرشتیار یان دەسـتەی سپۆنسەر یان هەر لایـەنی دیکـەی تێدایـە، کـە یارمـەتی توێـژەریان داوە لـە کارەکــەی، بــەڵام باشــتروایە بەشــێکی ســەربەخۆ تــەرخان بکرێــت بــۆ سوپاسکردن.

وەك بـاوە پیشــەکی چــەند لاپەڕەیــەکی کەمــە و هەنـدێکجار درێـژە، پێـی دەوترێت (بەرایی). لەم حاڵەتەدا پێشەکییەکی ئاسایی تێدایە و پەنا بـۆ ئـەو شێوازە دەبات کە توێژەری ناچار کردووە بە وردی بـاس لـەم پرسـانە بکـات کە لەگەڵ بەشەکانی توێژینەوەکەی ناگونجێـت، بەکـەڵك ئـەوە نایـەت ببێتـە بەشێکی سەربەخۆ، بۆیە باشترواپە لە دەستپێکی یان بەشێکی بەرایی دیکـە دابنرێت.

هەرچی پێشکەشکردنە، لەو حاڵەتەدا دەکرێت کەتوێژەر توێژینەوەکەی پێش چاپ کردن بە کەسایەتییەکی گرنگ یان تایبەتمەند بـە بابـەتی توێژینەوەکـە بدات، ئەو کەسایەتییەش ئامادەیی نیشاندا ئـەو توێژینەوەیـە بخاتـەڕوو یـان

بیخاتە بەردەم خوێنەران، بۆیە بەم پێشکەشکردنە دەستپێدەکات، کە وەك باوە کورتە.

## باسی دووەم
## ناوەڕۆکی بابەت (ڕاپۆرتی توێژینەوەکە)

**١. شێوازی نووسینەکە**

ئەو شێوازەی کە توێژەر توێژینەوەکەی پێ دەنووسێت بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، چونکە شێوازی نووسین لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت بە گوێرەی پێکهاتەکانی توێژەر و ڕۆشنبیری و پسپۆڕی خۆی و میتۆدی پەیڕەوکراو لە توێژینەوەکەیدا، بەڵام ئەمە ڕێگر نییە لەوەی کە توێژەر پابەند بێت بە چەند ڕێسا و بنەمایەکی ڕێکەوتن لەسەر کراو لە کاتی نووسیندا، کە وا لە ڕاپۆرتی نووسین دەکات ببێت بە ماددەیەکی زنجیرەکراو بۆ خوێنەر، هانی خوێندنەوە و تێگەیشتنی بدات، هەرچەند توێژەر سەرکەوتوو بوو لە پەیڕەوکردنی باشترین شێواز هێندە توێژینەوەکەی دەبێتە جێگای ڕەزامەندی و بە باشی دەڕوانن.

توێژینەوە زانستییەکان لە لایەن کەسە ئاساییەکانەوە ناخوێنرێنەوە، بەڵکو ئەو کەسانە دەیخوێننەوە کە بایەخ بەم جۆرە توێژینەوانە دەدەن، وا باوە ئەمانەش مرۆڤی خوێندەوارن، یان پسپۆڕن لەو کایەیەی کە توێژینەوەکەی تێدا ئەنجامدراوە، ئەم توێژە خوێنەرە هەستی تایبەتییان هەیە بەرامبەر شێواز و زمان، چونکە بە وردی دەیخوێننەوە و هەر هەڵەیەك لە شێوازی یان لە شیکردنەوە و بەڵگاندن کاریگەری دەبێت لەسەر هەڵسەنگاندنی توێژینەوەکەی.

وەك لە پێشودا باسمان کرد پرۆسەی توێژینەوەی زانستی بەشێوەیەکی گشتی کارێکی پسپۆرییە و ناکرێت هەر کەسێك ئەنجامی بدات، بەڵکو دەبێت توێژەر چەند توانایاکی هەبێت کە لە کەسی ئاساییدا نییە، هەروەها دەبێت زانیاری پێویستی هەبێت لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەی، ئەگەرچی ئەمە هەنگاوێکی گرنگە لە توێژینەوە، بەڵام بە تەنیا ناتوانێت توێژینەوە ئەنجام بدات، بەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بەکاربهێنرێت بۆ ئەوەی بە خوێنەران بگات.

ئەوەی کە توێژەر بڕێك زانیاری هەبێت ئەگەر ئەو زانیارییانەش ڕاست بێت، ئەوا بەس نییە بڵێین کە ئەمە توێژەرێکی سەرکەوتووە، چونکە گرنگ ئەوەیە توێژەر ئەو زانیاری و ئەنجامانەی کە بەدەستی هێناوە بە خوێنەرانی بگەیەنێت. بەتاڵکردنەوەی بڕی زانیاری و خشتەکان لەسەر لاپەڕەکان کێشەکە چارەسەر ناکات، ئەگەر توێژەر بە باشی ئەو زانیارییانە ڕێك نەخات بەشێوەیەکی بابەتی و لۆژیکی، کە وای لێبکات تێگەیشتنی ئاسان بێت لای خوێنەران.

پرۆسەی نووسینی زانستی وەك کێشەیەك تەنیا بەسەر توێژەرەکان کورت نەبۆتەوە، بەڵکو ڕووبەڕووی ئەوانەش دەبێتەوە کە هێشتا لە قۆناغەکانی خوێندندان، ڕەنگە ڕوو بدات قوتابییەك وەڵامی تەواوی پرسیارێکی تاقیکردنەوە بزانێت، لە مێشکیدا زانیاری پێوستی هەبێت، بەڵام ڕەنگە نەزانێت لە کوێ دەستپێبکات، بۆیە وەڵامەکەی تێکەڵەیەك دەبێت لە زانیاری شێواوی نارێکخراو، یان نازنجیرەکراو، ئەمەش بە نێگەتیڤی کاریگەری دەبێت لەسەر ئەو نمرەیەی کە بەدەستی هێناوە، بۆیە ئەنجامەکەی بە دڵ نابێت، ئەو پێیوایە

وەڵامەکە دەزانێت و بە تەواوی زانیارییەکانی لەسەر لاپەڕەی تاقیکردنەوە نووسیوە، ئەمەیە گرنگی شێواز و میتۆدی شیکردنەوە و نووسین.
توێژەر لە کاتی نووسیندا دووچاری کێشەیەکی ڕاستەقینە دەبێتەوە، ئەویش چۆنییەتی نمایشکردنی هزرە ئەبستراکتەکانە بۆ خوێنەرەکان بەشێوەیەکی ڕوون و بێ تەمومژی، بەمەش گرفتی چارەسەرکردنی هزرە ئەبستراکتەکان بەشێوەیی ڕوون دێتە ئاراوە لە ئەنجامی بەدوایەکداهاتنی هزرەکان پێش وشەکان، لەمبارەیەوە جۆرج ئۆرێل دەڵێت (ئەوکاتەی ئێمە بیر لە شتێکی بەرهەست دەکەینەوە ئەوا مومارەسەری بیرکردنەوەیەکی ئەبستراکت دەکەین لە وشەکان، ئەگەر بمانەوێت ئەو شتە وێنا بکەین کە بەزیهن بیرمان لێکردۆتوە، ڕەنگە هەندێك جار بەدوای وشەیەکی تەواوی یگەڕێێن بۆ بەرجەستەکردنی وێناکەمان بە شێوەیەکی تەواو، بەڵام ئەگەر بیر لە شتێکی ئەبستراکت بکەینەوە زۆرجار سەرەتا وشەیەك بەکاردەهێنین، ئەگەر هیچ کۆششیکی مەبەستدار بەکارنەبەین بۆ خۆ دوورگرتن لەمە، ئەوکات خێرا چەندین چەمك یان دەستەواژە بە مێشکمان دادێت کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەکاریان دەهێنین و بە ڕۆڵی خۆی هەڵدەستێت، بەڵام لەسەر حیسابی شلەژانی مانا یان تەنانەت گۆڕانیشی).
زمان ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پرۆسەی توێژینەوە، وشە ڕەق و بەکارهاتووەکان پێگەی شێواز و جیدییەتی توێژینەوە لەق دەکات، هەروەها ئەمە بۆ شێوازی ئاڵۆزیش ڕاستە، کە کاریگەری نێگەتیف بەسەر نووسینەوەکە بەجێدەهێڵێت، وشەکان بۆ گەیاندنی بیرۆکەیەکی دیاریکراو بە خوێنەر بەکاردەهێنرێن نەك بۆ دەرخستنی توانای ڕەوانبێژی توێژەرەکە.

لێرە لەسەر توێژەر پێویستە وشە و ڕستە سادە و دروستەکان هەڵبژێرێت، خۆی لە وشەی جیڕ و رازاوە و زمانی لاواندنەوە یاخود شێوازی تۆقاندن و زیادەڕۆیی بە دوور بخاتەوە.

لەسەر توێژەر پێویستە میانڕەو بێت لە شێوازەکەی، پەنا بۆ زمانی بەکارهاتوو و حەشوو نەبات، بەوەی کە پێیوایە هەرچەندە قەبارەی توێژینەوەکە گەورە بێت، هێندە باشترە، ئەم باوەڕە هەڵەیە چونکە پەند لە قەبارە نییە بەڵکو لە ناوەڕۆکە. ئەلتەرناتیڤەکەش کورتکردنەوەی توێژینەوە نییە تا ئاستێك کە تێگەیشتنی دژوار بێت و ئاڵۆزی بکات، بەتایبەتی لەو توێژینەوە کۆمەڵایەتییانەی کە خاوەن شێوازی شیکارییە و پێویستی بە توانایەکی رازیکردنی مەزنە.

لە لایەکی دیکەوە، ڕێکخستن و دابەشکردنی گونجاوی ناونیشانەکان، یارمەتیدەرە لە ڕوونکردنەوە هزر و ڕیزبەندیکردنی، زورجار توێژینەوە بۆ چەند دەروازەیەك دابەشدەبێت، دەروازەکانیش بۆ چەند بەشێك، بەشەکانیش بۆ چەند باسێك، باسەکانیش بۆ چەند لقێك، لقەکانیش بۆ چەند وردە لقێك دابەشدەبێت، بەڵام هەندێك هەن توێژینەوە تەنیا بەسەر چەندین بەش دابەش دەکەن، هەر بەشێکیش بۆ ناونیشانی لاوەکی، لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێت ناونیشانە سەرەکییەکان لە ناوەڕاستی لاپەڕە بنووسرێت، ناونیشانە لاوەکییەکانیش لە تەنیشتی ڕاستی لاپەڕەکە، باشتروایە ناونیشانەکە سەربەخۆ بێت لەسەری دێر.

سەرەڕای ئەوانەش دابەشکردنی توێژینەوە بۆ بەش یان ناونیشانەکان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ئەنجام نادرێت، بەڵکو دەبێت هەموو بەش یان باسێك

پەیوەست بێت بە کێشەی سەرەکی توێژینەوەکە، وەڵامی لایەنێك دەداتەوە و دەبێت پەیوەست بێت بە پێش و پشتی بەشەکان، بەشێوەیەك خوێنەر هەست بە زنجیرەبەندی هزرەکان بکات، هەرچەندە خوێنەر بەرەو پێش چوو لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی دیکە و زیاتر وێنەکەی بۆ روونتر دەبێتەوە، هێندەش لە وەڵامەکانی ئەو گریمانانە نزیك دەبێتەوە کە توێژەرەکە لە سەرەتای توێژینەوەکەی دایناوە.

**٢. وەرگرتنەکان (الاقتباسات)**

وەرگرتن بەشێکە لە توێژینەوەی زانستی، چونکە توێژەر پلەکەی هەرچیەك بێت و مەعریفەی چەند کەڵەکەبوو و فرەلق بێت، ناتوانێت دەستەبەرداری ئەزموون و شارەزایی ئەوانی دیکە بێت، ئەو توێژەرەی کە پێیوایە هیچ زانستێك لە هی خۆی و هیچ مەعریفەیەك جگە لە هی خۆی نییە توێژەرێکە و نازانێت یان خۆی لە زانینی ئەوە بەدووردەخاتەوە کە هیچ سنوورێك بۆ زانست نییە و ناکرێت یەك مرۆڤ هەموو شتێك بزانێت.

وەرگرتن دیاردەیەکی تەندروستە لە توێژینەوە زانستییەکاندا، لە رێگای وەرگرتنی توێژەر دەتوانێت هزر و بۆچوونی ئەوانی دیکە تێکەڵ بە توێژینەوەکەی بکات، بەڵام دەبێت ئاماژە بکات بە خاوەنی و ئەو سەرچاوەیەی کە لێی وەرگرتووە. توێژینەوە زانستییەکان پشت بە یەکتر دەبەستن و پەنا بۆ هزر و ئەزموون و نووسینەکانی ئەوانی دیکە دەبەن و پرۆسەی توێژینەوە دەوڵەمەند دەکات و هەروەها لە نێو لاپەڕەکانی دیکە راپۆرتی توێژینەوەکەی گفتوگۆش چڕتر و دەوڵەمەندتر دەکات. بەڵام دەبێت وریابین لە زیادەڕۆیی لە وەرگرتن تاوەکو لاپەڕەکانی توێژینەوەکەی نەبێتە تەنیا کۆکردنەوەی وتە و

هزری ئەوانی دیکە، بەمەش کۆشش و هزری توێژەر لە دوو تـوێی وەرگرتنـەکان ونـدەبێت[٢٧٨].

وەرگرتنـی زانسـتی دروسـت دەوەسـتێتە سـەر تێگەیشـتنی توێـژەر لـە وتـە و نووسینەکانی ئـەوانی دیکـە لـە بـارەی بابـەت و زیـادکردنی بـۆ سـەر زانیـاری و هزرەکانی خۆی، دواتریش دووبارە نووسینەوە بەزمانێکی تایبەت، بەشـێوەیەك ئاوێزان دەبێت لە شیکردنەوە و نابێت پەنا بۆ وەرگرتنـی حـەرفی بـەرێت تـەنیا لە بەرتەسکترین سنووردا نەبێت.

تەنیا بە کۆکردنەوەی وتەکانی پسپۆڕەکان لە بارەی بابەتەکە توێژینەوەیـەکی زانستی بەرهەم ناهێنرێت، لەسەر توێژەر پێویستە پـەنا بـۆ وەرگرتنـی حـەرفی نەبات تەنیا لە بەرتەسکترین سنووردانەبێت و دەبێت ئەو دەقە وەرگیراوانـە بـە شـێوەیەك بـەکاربهێنێت کـە هـزر و بۆچـوونەکانی پشتراسـت بکاتـەوە نـەك بەشێوەیەك بەکاری بهێنێت کە تەمبەڵی و نەزانی بشارێتەوە.

دەکرێت مەترسییەکانی زۆری وەرگرتن دیاری بکەین سەبارەت بە خوێنـدکارانی زانکۆ بەمشێوەیە:

١. نەبێتە هۆی بێزاری لە خوێندنی ڕاپۆرتەکانی توێژینەوەدا.

٢. زۆری وەرگـرتن، خوێنـدکار بـێ بـەش دەکـات لـە هـەڵی مومارەسـەرکردنی نووسین.

[٢٧٨]- باشترایە ئەو پەرەگرافەی کە وەردەگیرێت لە شەش دێر زیاتر نەبێت لە یەك لاپەڕەدا، تەنیا لە کاتی پێویستدا نەبێت، هەروەها نابێت تەنیا پشت بەیەك سەرچاوەی ببەسترێت یاخود چەند بەرنامەیەکی کەم بکرێتەوە سەرچاوەی بۆ وەرگرتن بەڵکو دەبێت سەرچاوەکان زۆر بن، لە زانکۆ ئەمریکییەکاندا، ڕێگا نادرێت لە هەزار وشە زیاتر لە چاپکراوەکانیان زیاتر وەربگیردرێت، بەڵام ئەگەر زیاتر لە هەزار وشە لە یەك سەرچاوە وەبگیرێت، ئەوا پێویستە مۆڵەت لە خاوەنی مافی بڵاوکردنەوە وەربگیرێت.

٣. دەبێتــە هــۆی لاوازکردنــی شــێوازی کەســی خوێنــدکار لــە نووســین و بەدەرنەخستنی توانـای بـەکارهێنانی ڕسـتە و بڕگـەی وەرگـیراو، بەمپێیـەش پەرەنەسەندنی شێوازێکی تایبەت بە خۆی.

٤. هەستدانەوەیەك دەدات بەوەی خوێنـدکار نـەیتوانییوە بەسـەر ئـەو بابەتـەدا زاڵ بێت، کە لە بارەیەوە نووسیویەتی[279].

## جۆرەکانی وەرگرتن

زۆربەی جار لە توێژینەوە تیۆرییەکاندا پەنای بۆ دەبردرێت، ئینجا چ لـە کتێـب یـــان لـــە گۆڤارەکـــان یـــان ڕۆژنامـــەکان، یـــان لـــە فەرهـــەنك و ئینسـکلۆپیدیاکان.....هتد وەردەگیرێـت، بـەڵام توێـژەر لـە کـاتی نووسـینی ڕاپـۆرتی نووسـیندا ڕاسـتەوخۆ مامەڵـە لەگـەڵ سەرچـاوەکان ناکـات، بـەڵکو هەنگاوێك هەیە دەکەوێت نێوان بەکارهێنانی سەرچاوەکان و ئەم هەنگاوە، ئـەم هەنگاوەش پێی دەوترێت پشکنین

پشـکنین :دوای ئـەوەی توێـژەر ئـەو سەرچـاوانە تۆمـار دەکـات کـە پێویسـتی پێیەتی لە توێژینەوەکەیدا، دەستدەکات بە خوێندنەوە، بەشـێوەیەك زانیارییـە بە سوودەکان دادەبڕێت کە بەکەڵك توێژینەوەکەی دێت، ئەو زانیارییانە لەسـەر چەند کاغەزێکی تایبەت دەنووسێت و لە کاتی نووسیندا پەنایان بۆ دەبات. ئەم پرۆسەیە پێی دەگوترێت پشـکنین ، زانایـانی کـەلام لـە یەکـەمین ئـەو کەسـانە بوون کە باسیان لەم ڕێگایە کردووە و پێیان گوتووە پشکنین، یان کۆکردنـەوە، ئەمـەش لـە فەرهەنگەکانـدا هـاتووە و دەڵێـت پشـکنین یـان گـەڕان بـە دووای زانیاریدا بریتیە لە کۆکردنەوەی شت لەملا و لەولا).

[279]- بڕوانە : فوزي عبدالله العكس، البحث العلمي، المناهج و الاجراءات، الامارات العربية المتحدة، جامعة الامارات، ١٩٨٦.

چەندین شێواز بۆ پشکنین هەیە

**١. کورتکردنەوەی زانیارییەکان**

بریتییە لە پوختکردنەوەی سەرچاوەکان لە لایەن توێژەرەوە، پابەندە بە شێواز و گوزارشتەکانی نووسەر، توێژەر ئەوە دەسڕێتەوە کە پێیوایە جەوهەری نییە، هەندێکجار سێیەکی سەرچاوە ڕەسەنەکە دەسڕێتەوە.

**٢. کۆی زانیارییەکان**

ئەمەش کورتکردنەوەی زانیارییە هەبووەکان لە سەرچاوە، بەڵام توێژەر بە شێواز و زمانی خۆی پوختی دەکات، لەمەشدا یان بە هۆی خاڵی بە ژمارەیە و هەر خاڵێك بیرۆکە یان رستەیەکە، یان بڕگەیەکە و گرنگترین زانیاری لەخۆ دەگرێت.

**٣. ڕوونکردنەوەی زانیارییەکان**

لەم شێوازەدا توێژەر تەنیا بە خوێندنەوە و کورتکردنەوەی سەرچاوەکان ناوەستێت، بەڵکو تێبینی لەسەر دەنووسێت و هەندێك شت ڕووندەکاتەوە، گفتوگۆ لەسەر هەندێك شتی دیکە دەکات و بۆچوونی خۆی لە کاتی پێوست دەخاتەڕوو، ئەم شێوازەش پێویستی بەوە هەیە کە توێژەر ئاگاداری بابەتەکە بێت و بە وردی شارەزایی بێت.

**٤. وەرگرتنی زانیارییەکان وەکو خۆی یان وەرگرتنی حەرفی**

تیایدا توێژەر بە تەواوی و بە حەرفی دەقەکە دەگوازێتەوە بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی تێدا بکات، یاخود تەنانەت هەڵەکانی دەقە ڕەسەنەکەش ڕاست دەکاتەوە.

## ڕێساکانی وەرگرتن

کەواتە توێژەر پرۆسەی وەرگرتن لەو زانیارییانە ئەنجام دەدات کە بەرهەمی پشکنینەکەی کۆی کردووەتەوە، ئەوە قبوڵکراو نییە توێژەر لە کاتی نووسیندا چەندین سەرچاوە لە بەردەم خۆی دابنێت بۆ ئەوەی لە توێژینەوەکەیدا پشتی پێ ببەستێت.

توێژەر پەنا بۆ شێوازێك یان زیاتر لە شێوازێك لەوانە دەبات کە ئاماژەیان پێکرا، لەوکاتەی پێوستی بە پشتراستکردنەوەی هزرەکانی هەیە بە چەند وەرگرتنێك.

حاڵەتەکانی وەرگرتنی حەرفی ڕاستەوخۆ بەمشێوەیە:

١. بۆ دووپاتکردنەوەی ڕوانگەی توێژەر، بە تایبەتی ئەگەر دەقە وەرگیراوەکە ڕوانگەی ئەو و نووسەرەکە دووپات بکاتەوە.

٢. ئەوکاتەی توێژەر بێتوانایە لە گوزارشتکردنی مانای نێو دەقە ڕەسەنەکە بە زمانی تایبەتی خۆی.

٣. ئەوکاتەی ئەو دەقەی کە دەمانەوێت وەری بگرین چەندین بۆچوونی دژپێکی تێدایە، ئەمەش پێویست دەکات وشەکانی خودی نووسەری خاوەن سەرچاوەکە بەکاربهێنین، زۆجار ئەمە ڕوو دەدات ئەگەر توێژەر بیەوێت بۆچوونی دژەکانی پوچەڵ بکاتەوە، بۆیە بۆچوونی دژەکەی خۆی بە حەرفی دەهێنێت، پاشان باسی دەکات لە میانەی دەرخستنی دژپێکەکانی نێویدا.

٤. ئەگەر ئەو دەقەی کە دەمانەوێت وەری بگرین ئایاتی قورئان یان وتەکانی پەیامبەر بێت، یان وتە و نموونە و حیکمەت بێت.

ئەو چوار شێوەیەی وەرگرتن دەبێت هاوپێچ بکرێت بە نیشانەیەك، دواتر ژمارەیەك، یان ژمارەیەك لە نێو دوو کەوانەی بچووك دابنرێت، ژمارەکە لە پەراوێز دادەنرێت، لە بەرامبەریشیدا تەواوی زانیارییەکانی سەرچاوەکە دەنووسرێت کە بابەتی لێ وەرگیراوە. ناوی نووسەر و ناوی کتێب و بەروار و شوێنی بڵاوکردنەوە، لەگەڵ ئەو لاپەڕەی کە وەگرتنەکەی تێدایە.

بەڵام وەرگرتنی حەرفی ڕێسا و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و دەبێت ڕەچاو بکرێت:

أ. ڕەچاوکردنی کورتی لەوەرگرتندا، باشتروایە دێڕەکانی وەرگیرانەکە لە شەش دێڕ لە یەك لاپەڕە زیاتر نەبێت، لەم حاڵەتەدا دەقی وەرگیراو ئاوێزانی دەقی ڕاپۆرتەکە دەبێت.

ب. دانانی دەقی وەرگیراو لە نێوان دوو کەوانە دولایەنە واتە (())، لەگەڵ دانانی ژمارە لە کۆتایی دەق، هەمان شتیش لە پەراوێزدا دەکرێت بۆ تۆمارکردنی زانیارییەکان لەو سەرچاوەی کە وەرگیراوە.

ت. لەوحاڵەتەی کە دەقی وەرگیراو لە شەش دێر زیاتر بوو، ئەوا لە دەق جیادەکرێتەوە و لە یەکەم دێر دەست پێدەکەین و دەبێت لە پەراوێزی لای ڕاست و چەپی لاپەڕەکە دووربێت، هەندێك جار دێرە وەرگیراوەکان فۆنتی نووسینەکەی جیاوازە، یان هێڵەکانی لە یەکتر نزیکە.

پ. لەو حاڵەتەی کە وشەیەك یان چەند وشەیەك یان چەند ڕستەیەك لە دەقی وەرگیراو دەسڕدرێتەوە ئەوا لە جێگایدا سێ خاڵ دادەنرێت ... بۆ ئەوەی ببێتە نیشانەی ئەوەی کە سڕینەوە هەیە  و لە حاڵەتی بوونی کۆما یان فاریزە پێش یان دوای ماددەی وەرگیراو دەبێت ئەویش دابنرێت، بەڵام ئەگەر ماددە

سڕاوەکە کەوتبوە دوای ڕستە یان بڕگەکە، ئەوا خاڵی چوارەم دەخرێتە سەر سێ خاڵەکە بۆ ئەوەی نیشانەی کۆتایی بێت....).

ج. لە حاڵەتی زیادکردنی وشەیەك یان ڕستەیەك یان ژمارەیەکدا، ئەوەی زیادکراوە کە دەخرێتە نێوان دوو کەوانە ()، بۆ ئەوەی بزانێت کە ئەوەی نێو کەوانەیە بەشێك نییە لە دەقە ڕەسەنەکە.

ح. لە حاڵەتی بوونی هەڵەیەکی تایپ لە دەقە وەرگیراوەکە، ڕاست ناکرێتەوە و وەك خۆی بەجێ هێڵدرێت، بەڵام لە پەراوێزدا ئاماژەی بۆ دەکرێت.

لە هەموو حاڵەتەکاندا لەسەر توێژەر پێویستە وردبونی زانستی و دەستپاکی ڕەچاو بکات لە کاتی وەرگرتندا، هەروەها ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوەیە بکات کە لێی وەرگرتووە، نابێت نکوڵی لە چاکەی ئەوانی دیکە لەبواری نووسین و توێژینەوە بکات.

**٣. نیشانەکانی وەستان و بەکارهێنانەکانی**

بۆ ئەوەی شێوازەکە تۆکمە بکرێت ولێی تێبگەین، چەندین نیشانە بەکاردێت بۆ ئەوەی وشە یان ڕستەکان لە یەکتر جیابکرێنەوە، ئەمەش پێی دەوترێت وەستان، هەر نیشانەیەکیش لە نیشانەکان لە چەندین حاڵەتی دیاریکراو بەکاردەهێنرێن، نیشانەکانیش ئەوانەن:

**١. فاریزە، یان کۆما (Comma) (،)**

ئەمە زۆر بەکاردەهێنرێت، لە نێوان دوو ڕستە دادەنرێت کە مانا بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، ئینجا چ ڕستەی هاوسۆز یان دژ بن، دوای دابەشکردنەکە دادەنرێت، هەروەها لە نێو چەندین وشە یان خەسڵەت، یان ناو، یان کار، یان پیتەکان، هەروەها دەخرێتە نێو وشە هاوماناکان، یان دەخرێتە دوای بەڵێ یان

نەخێر کە وەڵامە بۆ پرسیارێك کە ڕستەیەکی لە دوایدا دێت، یان دەخرێتە دوای ژمارەی ساڵ ئەوکاتەی ڕستەی پێ دەست پێدەکات، یان دوای مانگ یان ڕۆژ، دەخرێتە نێوان مەرج و وەڵامەکەی، لە پەراوێزەکانیشدا دەخرێتە نێوان ناوی نووسەر و ناونیشانی کتێب و زانیارییەکانی بڵاوکردنەوە.

**٢. خاڵ (.)**

ئەمەش دەخرێتە کۆتایی ڕستە تەواوەکان.

**٣. دوو خاڵ لەسەر یەکتر (:)**

دەخرێتە دوای گوزارشتەکانی گێڕانەوە دوای ئەوەی مەرجی بۆ زیاد دەکرێت، وەك (بەمشێوەیە: ) یان (ئەمەی خوارەوە)، دەخرێتە دوای قسە و ئەوەی لێ وەرگیراوە، دەخرێتە پێش کۆمەڵێك نموونە، یان پێش ڕستە یان چەند ڕستەیەکی وەرگیراو، هەروەها دەخرێتە دوای شار لە کاتی تۆمارکردنی سەرچاوەکانی لە پەراوێزدا.

**٤. داش (_)**

دەخرێتە دوای ژمارەکان یان پیتەکان، یان وشەکان، بەڵگەیە لەسەر کەموکورییەك تێیدا، هەروەها دەخرێتە پێش ڕستە یان چەند خاڵێکی ئاماژەپێکراو بە ژمارە، هەروەك دەخرێتە سەر دوو ژماری ڕیزبەندیکراو.

**٥. جوتکەوانەی لار (())**

لە نێویاندا چەند وشەیەك دادەنرێت کە لەپێشودا گوزارشتێك یان چەمکێك هاتووە کە پێوستی بە ڕاڤەکردن هەیە، هەروەها دەخرێتە دوای ئەو ژمارانەی کە لە ڕستەدا هاتون، یان لەگەڵ نیشانەی پرسیار لە هەواڵێك یان وشەیەك یان

نەریتکی جێگای گومانە، یان دەخرێتە سەر ناوە بیانییەکانی نێو دەق، تەنانەت ئەگەر بە پیتی بیانیش بێت.

**٦. دوو کەوانە ()**

بەکارهێنانی تەنیا بەسەر ئەو حاڵەتە کورتبۆتەوە ئەگەر توێژەر ویستی گۆڕانێك بەسەر دەقێکی وەرگیراو بکات، بەمەش زیادەکە دەخاتە سەر لە کۆنتێکستە ڕەسەنەکەدا.

**٧. جوت کەوانەی دووانە ""**

بۆ سنووورداکردنی قسەی وەرگیراو دادەنرێن ، یان لە ڕستەی وەرگیراودا، یان ناونیشانی کتێب و شیعر و وتارەکان بۆ ڕوونکردنەوەیان.

**٨. خاڵە ئاسۆییەکان (...)**

بوونی لە دەقی وەرگیراودا بەڵگەیە لەسەر بوونی سڕینەوە لەم دەقە، هەروەك دەخرێتە جێگای (هتد...) لە کۆنتێکستی قسەکردن لە بارەی شتێك، هەروەها دەخرێتە دوای ئەو ڕستەیەی کە هەڵگری زیاتر لە مانایەکە بۆ هاندانی خوێنەر لەسەر بیرکردنەوە.

**٩. نیشانەی سەرسوڕمان یان هەڵچوون (!)**

بۆ گوزارشتکردن لە سەرسوڕمان لە تووڕەیی یان ڕەزامەندی دادەنرێت ، دەخرێتە دوای ئەو ڕستەیەی کە بە باشە یان بە خراپە دەستپێدەکات، دەخرێتەر دوای هاوارکردن و بانگکردن، یان دوای ئەو ڕستەیەی کە بە وشەی سەرسوڕمان دەستپێدەکات.

**١٠. نیشانەی پرسیار (؟)**

دەخرێتە سەر ڕستەی پرسیاری؟ لە نێو دوو کەوانەدا، بۆ ئامـاژە کردن بە گومان لە ژمارە یان وشە یان هەواڵێك.

# باسی سێیەم
# پەراوێز وژێدەرەکان

### ١. پەراوێزەکان

**هیچ توێژینەوەیەکی زانستی بێ پەراوێز نابێت، پەراوێزیش دوو جۆرە:**

**أ. پەراوێزی ژێدەرەکان**

بۆ ئامـاژەکردن بـەو سەرچـاوانەی کـە لـە دەقـی توێژینەوەکـەدا پـەنای بـۆبراوە بـەکاردەهێنرێت ، بـە شـێوەیەك نووسـەر ژمارەیـەك دەداتـە دەقەکـە یـان بیرۆکـە وەرگیراوەکـە ، لـە پـەراوێزدا هـەمان ژمـارە دەنوسـێتەوەو نـاوی سەرچـاوەکەو وردەکاریـەکانی بەرامبـەر ئـەو ژمارەیـە دەنووسێت.

**ب. ئەو پەراوێزانەی بۆشیکردنەوەی ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە دادەنرێن**

لـەم حاڵەتـەدا پـەنا بـۆ پـەراوێز دەبردرێـت ئەگـەر شـتێك لـە دەقەکـە هـەبوو کـە نـاڕوون یـان پێوسـتی بـە ڕاڤـەکردن هـەبوو، ناکرێـت ڕاڤـەکردن لـە دەقەکـە دابنرێـت نـەوەك نێوکـۆی گشـتی دەقەکـە بشـێوێنت، بۆیـە نووسـەر پـەنا بـۆ دانـانی پـەراوێزی شـیکاری دەبـات، ڕەنگـە ئـەو شـیکردنەوەیە پەیوەسـت بێـت بـە نیشـانەیەك لـە نیشـانەکان، نـاوی شـار، یـان کەسـایەتییەکی گـرنگ، یـان دیاردەیـەکی دیـاریکراو بێـت، هـەروەها پـەراوێز بـەکاردەهێنرێت بـۆ گەڕاندنـەوە بـۆ خاڵێـك کـە لـە پێشـووتر لـە لایەن توێژەرەوە ئامارەی بۆ کراوە، یاخود لە داهاتودا باسی دەکات.

سێ شێواز هەیە بۆ دانانی پەراوێز: هەندێکیان پێیانباشە پەراوێز لە کۆتایی هەر لاپەڕەیەك هەبێت، لەم حاڵەتەدا هێڵێکی جیاکراوە دادەنرێت بۆ جیاکردنەوەی دەق لە پەراوێز، هەندێکجاریش پەراوێزەکە بە فۆنتی بچوکتر دەنووسرێت لەو فۆنتەی بۆ نووسینی دەقەکە بەکار دەهێنرێت. شێوازە دووەم: ئەمەش کۆکردنەوەی پەراوێزەکانی هەر بەشێکە بە جیا، یان باسێك و دانانی لە کۆتایی بەش یان باسەکە. لەم حاڵەتەدا پەراوێزەکان بە ڕیزبەندی ژمارەیان بۆ دادەنرێت لە سەرتای بەشەکە تا کۆتایی، نەك وەك شێوازی یەکەم بەشێوەیەك هەر لاپەڕەیەك پەراوێز و ژمارەی تایبەتی خۆی هەبێت. شێوازی سێیەمیش: دانانی سەرچاوەیە بە ژمارە لە کۆتایی توێژینەوەکە، دەبێت لە نێو دەقدا ئاماژە هەبێت بۆ ژمارەی سەرچاوە و ژمارەی لاپەڕە.

ئەگەر ئەو پەراوێزانەی کە سەر بە جۆری یەکەمە هیچ کێشەیەکی نەبێت، جۆری یەکەم واتە پەراوێزەکانی سەرچاوە، پێویستی بە وردی هەیە لە کاتی بەکارهێنانـدا، چونکە تۆمارکردنی سەرچاوەیەك بۆ یەکەمجار جیاوازە لە بەکارهێنانی بۆ چەندین جاری دیکە لە داهاتودا.

**دۆکیۆمێنتکردنی زانیاری لە بارەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەکان :**

**کاتێك بۆ یەکەمجار ژێدەرێك بەکاردێت ،ئەگەر هاتوو کتێب بوو، هەموو وردەکاریەکانی بەتەواوەتی بەم شێوەی خوارەوە دەنوسرێت :**

**ناوی نوسەرەکە:**

بەوشێوەیە دەنووسرێت کە لە ناونیشانی کتێبەکەدا نووسراوە (ناوی سیانی یان دووانی)، لەو حاڵەتەی کە ناوی زیاتر لە نووسەرێك هەبوو، بە هەمان ڕێکخستنی نێو کتێبەکە دەنووسرێت، ئەگەر لە سێ نووسەر زیاتر بوون، توێژەر تەنیا ناوی یەکەم کەس دەنووسێت، پاشان وشەی (ئەوانی تر) و لە نێوانیشیاندا فاریزە، لەو حاڵەتەی کە کتێبەکە وەرگێڕان بێت ناوی وەرگێری دوای ناوی نووسەرەکان دێت.

**ناونیشانی کتێب**: ئەوە دەنووسرێت کە لە دەقە ڕەسەنەکەدا هەیە.

**ناوی زنجیرە و ژمارەی کتێب**.

ئەگەر کتێبەکە بەشێك بێت لە زنجیرەیەك کە لە دامەزراوەیەکدا دەوەشێنرێت.

ئەگەر کتێبەکە لە چەند بەرگێك پێکهات بێت، توێژەر تەنیا ئامارە بۆ ئەوە بەرگە دەکات کە بەکاریهێناوە.

## زانیارییەکانی بڵاوکردنەوە

ئەمەش یان لە نێو دوو کەوانە دادەنرێت، فاریزەیەك دەخرێتە نێوان هەموو زانیارییەکان، یان نێوان دوو داشدا، مەبەستیشمان لە زانیارییەکانی بڵاوکردنەوە، وڵاتی بڵاوکەرەوەیە، دامەزراوەی بڵاوکەرەوەیە، بەروارەکەی، ئەگەر هەر زانیارییەك لەم زانیاریانە نەبوو، دەبێت ئامازەی پێ بکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت.

دوای ژمارەی لاپەرە یان ئەو لاپەڕانە دەنووسرێت کە لێی وەرگیراوە، بۆ نموونە:

_ عبدالباسط محمد حسن، اصول البحث العلمي، ط٨، القاهرة، مكتبة وهبة، ١٩٨٢، لا ٧٠.

بەڵام ئەگەر سەرچاوەکە وتارێك بێت لە گۆڤاردا، لێرەدا زانیارییەکان بەمشێوەیە ڕێکدەخرێن:

- ناوی نووسەر، یان نووسەرەکان
- ناونیشانی وتار، دەخرێتە نێوان دوو کەوانەی دووانە (()).
- ناوی گۆڤار و لە ژێریدا هێڵێك دەکێشرێت
- ژمارەی بەرگ و ژمارەی گۆڤارەکە.
- ژمارەی لاپەڕە یان لاپەڕەکان.

**بۆ نموونە**

- ابراهيم ابراش، (حدود استحضار المقدس في الامور الدنيوية، ملاحظات منهاجية)، مجلة المستقبل العربي، العدد ١٨٠، فبراير ١٩٩٤، لا ٤.

ئەمەی باسکرا پەیوەستە بە ئاماژەدان بە نووسینی پەراوێز بۆ ئەو سەرچاوانەی کە بۆ یەکەمجار بەکاردەهێنرێن، بەڵام ئەگەر ویستمان سەرچاوەکە بۆ جارێکی دیکە بەکاربهێنن، ئەوا جیاوازە و چەند حاڵەتێکیشی هەیە:

دیسانەوە بەکارهێنانی هەمان سەرچاو بێئەوەی هیچ پەراوێزێك لە نێوان وەرگرتنی یەکەم و وەرگرتنی دووەم هەبێت، لەم حاڵەتەدا گوزارشتی (هەمان سەرچاوە) یاخو (هەما ژێدەر) بەکاردەهێنین، ئەگەر

سەرچاوەکە بیانی بوو (Ibid) بەکاردەهێنن و دوای ژمارەی لاپەڕە، یان ئەو لاپەڕانە دەنووسین کە ئەمەی لێ وەرگیراوە[280].

ئەگەر ویستمان سەرچاوەیەك بەکاربهێنین کە لەپێشودا زانیارییەکانمان نوسیووە، دوای ئەو پەراوێزی سەرچاوەیەکی دیکە هەبێت، تەنیا ناوی نووسەرەکە دەنووسینەوە و پاشان دەنووسین (سەرچاوەی پێشوو) و دواتریش ژمارەی ئەو لاپەڕەی لێی وەرگیراوە، بەلام بەو مەرجەی نووسەر هیچ سەرچاوەیەکی دیکەی لە توێژینەوەکەدا بەکارنەهاتبێت، بۆ نموونە : عبدالباسط محمد حسن سەرچاوەی پێشو، لا ٩٢. بەلام ئەگەر نووسەر زیاتر لە کتێبێکی هەبێت و بەکاری بهێنین لە توێژینەوەکەدا و ناوی نووسەر و ناونیشانی کتێبەکەی یان وتارەکەی دەنووسین و پاشان ژمارەی لاپەڕە.

ئەگەر سەرچاوەکە بە زمانی بیانی بێت، لێرەدا ناوی نووسەرە و پاشان (op.cit)، پاشان ژمارەی لاپەڕە دەنووسین، لە کۆتاییدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەگەر پەراوێزەکان پێویست بن بۆ توێژینەوە زانستیەکە، لەسەر توێژەر پێویستە ورد بێت و کەم پەنای بۆ بەرێت، زۆری وەرگرتن و پەراوێز بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە توێژەر زۆر ئاگادارە، بەڵگانەمەیەکی باش نییە لەسەر چاکی ئەو توێژینەوەیەی کە ئەنجامی دەدا. تەنیا لە حاڵەتە پێویستەکان پەنا بۆ پەراوێزەکان دەبردرێت، هەروەك پێویستیش نییە پەراوێزێك یان سەرچاوەیەك بەکاربهێنرێت بۆ وتە و بیرۆکەیەك کە بەڵگەنەویستە و هیچ کێشەیەکی

---

280- هەمان سەرچاوە، لا ٣٠٥.

لەسەر نییە، مەعقولْ نییە لە دەقدا باس لەوە بکرێت کە کە دەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە و دواتریش توێژەر پەراوێزێك بنووسێت و ناوی ئەو سەرچاوەیە بنووسێت کە ئەوە دوپات بکاتەوە نەتەوە یەکگرتووەکان لەم ساڵەدا دامەزراوە، چونکە ئەمە ناسراوە و هیچ کێشەیەکی لەسەر نییە، هەمان شتیش بۆ شوێنەکان یان کەسەکان ڕاستە، نابێت لە پەراوێزەکاندا بناسێنرێت تەنیا ئەگەر کردارەکە، یان کەسەکە نەناسراو بوو بۆ خوێنەر یان زۆرینەی خەڵك.

**٢. نووسینی ژێدەرەکان**

دوای ئەوەی توێژەر کارەکەی تەواو دەکات و ڕاپۆرتی توێژینەوەکە دەنووسێت و کۆتاییەکی بۆ دەنووسێت و بە پوختی باسی کارەکەی دەکات، ئەو هەڵوێست و هزرە تازانەی تێدا باسدەکرێت کە توێژەر هێناویەتییە کایەوە لە بارەی بابەتی توێژینەوەکە، دواقۆناغ دەمێنێت کە جێگیرکردنی لیستی ئەو ژێدەرانەیە کە لە توێژینەوەکەیدا بەکاری هێناوە، چونکە تەنیا بەوەندە ناوەستێت لە پەراوێزەکاندا ئاماژە بە سەرچاوەکان بکات، بەڵام دەبێت لیستێکی دیکەی ئەو سەرچاوانە بنووسێت کە لە توێژینەوەکەیدا پەنای بۆ بردووە، هەندێکجاریش لیستێکی دیکە دەنووسێت بەو سەرچاوانەی کە ئامازەی بۆ نەکردوون، چونکە ڕاستەوخۆ بەکاری نەهێناون یان ئامازەی پێکردوون بێ ئەوەی ڕاستوخۆ وەریانبگرێت، بەڵام سوودی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت لە توێژینەوەکردنی بابەتەکە فراوانتر کار بکەن، ئەمەش پێی دەوترێت (لیستی ژێدەرە بژاردەکان).

جـــۆرد شـــایدەر پێیوایـــە: (تۆمـــارکردنی سەرچـــاوەکانی بابەتەکـــە بەشـێوەیەکی ڕوون و زانینـــی ڕێگـای گەیشـتن پێـی، گرنگـی کـەمتر نییـە لـــەو قیبلەنمایـــەی کـــە کـــاپتن یـــان دەریـــاوان بـــەکاری دێنێـــت بـــۆ ئاڕاستەکردنی ڕۆیشتی کەشتییەکەی).

ئەگـەر توێـژەر پـەنای بـۆ سەرچـاوەی بیـانی و خۆمـاڵی بـرد، لەسـەری پێویسـتە جیایـان بکاتـەوە، یەکـەمجار سەرچـاوە خۆماڵییـەکان بنووسـێت و دواتـریش سەرچـاوە بیانییـەکان، هـەروەها ئەگـەر توێـژەر پـەنای بـۆ کتێـب و گۆفـار و بەڵگەنامـە و فەرهەنگـەکان بـرد، لەسـەری پێویسـتە ئەوانـەش لـە یـەکتر جیابکاتـەوە. یەکـەمجار کتێـب و دواتـر وتـار و دواتـر بەڵگەنامە حکومییەکان و دواتر توێژینەوە بڵاونەکراوەکان...هتد.

هـەرچ نووسـینی ژێدەرەکانـە لـە کۆتـایی توێژینەوەکـە ئـەوا بـە هـەمان شـێوازی تۆمارکردنییـەتی لـە پـەراوێزدا بـۆ یەکـەمجار، بـەڵام ئێمـە ژمـارەی لاپەڕە لە نووسینی ژێدەرەکانی کۆتایی دانانێین.

دەکرێـت لـە کـاتی نووسـینی نـاوی نووسـەرە بیانییـەکان نـاوی خێـزان بخرێتـە پـێش نـاوی کەسـەکە، بـەڵام لـە نووسـەرە خۆماڵییەکانـدا دەکرێـت بـە شـێوەی ئاسـایی خـۆی بینووسـین کـە لەسـەر بـەرگی کتێبەکـەدا هـاتووە، نـاوی کەسـی و دواتـر نـاوی خێـزان، ئەگەرچـی هەنـدێك هـەن نـاوی خێزان دەخەنە پێش ناوی کەسەکە.

# کۆتـــایی

بـــە دڵنیبیایـــەوە لـــەم نوســـینەدا هەوڵمانـــداوە گۆشـــەنیگایەك بـــــدەین بـــــە میتۆدەكـــــانی توێژینـــــەوە لـــــە زانســـــتە كۆمەڵایەتییەكانـــدا ، لـــە دەســـتپێكدا بـــە توێژینەوەیـــەكی فـراوان لـە بـارەی زانسـت و توێژینـەوەی زانسـت لـە ڕوانگـەی بـــە یەكـــەوە بەســـتان و پەیوەنـــدی نێـــوان زانســـت و میتۆدەكـــانی توێژینـــەوەوە ڕێگـــای ئـــەم كارەمـــان خۆشـكردووە، ئەمـەش مانـای ئـەوە نییـە كـە ئێمـە لـەم كارەمانـــدا ڕۆمـــاڵی ســـەرجەم میتۆدەكـــانی زانســـتە كۆمەڵایەتییـــەكانمان كردبێـــت، بـــەڵكو ددان بـــەوەدادەنێین كـە چـەندین میتـۆد و شـێوازی توێژینـەوە هـەن كـە بـە مەبەســت باسمــان نــەكردووە، بــەهۆی دژواری باســكردنی هـەموو میتۆدەكـان، تـاوەكو باسـكردنی هـەموو میتۆدەكـان لەســەر حیســابی باســكردنی بەشــەكانی دیكــەی توێژینــەوە نـــەبێت، وەك پێناســـەكردنی زانســـت، پێناســـەكردنی

توێژینـــــەوەی زانســـــتی و نەخشەســــازی توێژینـــــەوە کۆمەڵایەتییـــەکان، کــە بــە پێویســـتمان زانیـــوە بـــۆ ئـــەو خوێندکارانـــەی ســـەرقاڵی ئامـــادەکردنی تێـــزی زانکـــۆیین، یان بۆ توێژەرە کۆمەڵایەتییە بەراییەکان.

لـە میانـەی وانـەکانمان لـە بابـەتی میتۆدەکـانی توێژینـەوە لـە زانســـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا، گەیشـتن بـەوەی کـە یـەك میتـۆدی زانســـتی هەیـــە و ڕێســـا و پرەنســـیپی تایبـــەتی هەیـــە، دەکرێـــت بەســـەر تـــەواوی زانســـتە سروشـــتی و کۆمەڵایەتییەکانـدا پراکتیـزە بکرێـت، بـەڵام ئەمـە ڕێگـای لـەوە ناگرێـت بڵـێن کـە چـەندین میتـۆدی دیکـە هـەن لـە چوارچـــێوەی ئـــەو میتـــۆدە گشـــتگیرە، میتۆدگـــەلێك هـەمواردەکرێت و دەگونجێنـدرێت بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ هـەموو لقێـــك لـــە لقـــەکانی زانســـتەدا بگونجێـــت، لێـــرەوە هـــیچ دژێکێـك نییـە ئەگـەر بڵێـێین میتـۆدی توێژینـەوەی زانسـتە لـــە زانســـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا یـــان میتۆدەکـــانی زانســـتە کۆمەڵایەتییەکان.

ئەگـەر لـە لایـەنی تیـۆری بچـین بـەرەو لایـەنی پراکتیکـی، پرســـیارەکان زۆردەبـــن و کـــەلێنی نێـــوان چـــەمکە ئەبســـتراکتەکانی توێژینـــەوەی کۆمەڵایـــەتی و واقیعـــی توێژینـــەوەی کۆمەڵایـــەتی و واقیعـــی کۆمەڵایـــەتی بـــە شێوەیەکی گشتی زۆر دەبێت.

کێشـەی توێژینـەوەی کۆمەڵایـەتی لـە جیهـانی عـەرەبی بەشـێکە لـە کێشـەیەك یـان قـەیرانی زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان، ئەمـەی دوایـیش بـە ڕۆڵـی خـۆی دەرهاویشـتەی کێشـەگەلێکی کۆمەڵایـەتی گشـتگیترە. تـازەیی بیرکردنـەوەی زانسـتی و پاشـکۆیی میتۆدەکـانی توێژینـەوە بـۆ سـەنتەر و میتـۆدە بیانییـەکان، لاوازی سـەنتەرە و دامـەزراوە تایبەتـەکانی توێژینـەوەی کۆمەڵایـەتی لـە لایـەك، فشـەڵی کۆمـەڵگای عـەرەبی و پاشـکۆیی بـۆ ڕۆژئـاوا و قورسـایی هـەژموونی ئایـدیۆلۆجیا و دژواری پابەنـدبوون بـە بابـەتیبوون، لـە لایـەکی دیکـەوە، لـە پـاڵ شـێوازی بیرکردنـەوەی بـاو و عـەقڵی هەژمونـدار کـە مامەڵـە لەگـەڵ کێشـە کۆمەڵایەتییـەکان دەکـات لـە ڕوانگـەی پێشـینیەی ئـایینی یـان کەلـەپوری، کـە ناکرێـت دووبـارە لێـی بـڕوانین و چـاوی پێبخشـێنین، هـەموو ئەوانـە وایکـردوە توێژینـەوەی کۆمەڵایـەتی لـە نیشـتیمانی عـەرەبی تـەنیا بـۆ تیرکردنـی پێداویسـتییەکان کورتبێتـەوە، بێتوانـا بێـت لـە ڕۆچـوون بـە نـاوی قـوڵایی ئـەو کێشـە کۆمەڵایەتییانـەی کـە کۆمـەڵگای عـەرەبی لـە دەسـتی دەناڵێنێـت، بـە تایبـەتی ئـەوەی کـە پەیوەنـدی هەیـە بـە سیسـتەمی سیاسـی و ئایـدیۆلۆجی و کولتـوور و شوناسـی عـەرەبی. کێشـەی کۆمەڵایـەتی وەك بـە کۆمەڵایـەتیبون و پـەرگیری ئـایینی و

پـــەیامی ڕۆشـــنبیران و قـــەیرانی دیموکراســـی و قـــەیرانی شـــوناس و ئینتیمـــا و دەســـتکەوتەکانی دەســـتەبەربوونی دیموکراســـی کێشـــەی لـــەمجۆرە پێویســـتی بـــە توێژینـــەوەی کۆمەڵایـــەتی هەیـــە، کـــە توێـــژەرە پابەنـــدەکان ئـــەنجامی دەدەن، ئـــازادیش بـــووە لـــە کاریگەرییـــەکانی دەســـەڵات و کۆتوبەنـــدەکانی ئایـــدیۆلۆجیا، میتـــۆد و ئامرازەکانیشـــیان خستۆتە بەرزترین ئاستی توندی زانستی.

هـــەموومان هیوامـــان بـــەوە هەیـــە کـــە قـــەیرانی زانســـتە کۆمەڵایەتییـــەکان لـــە نیشـــتیمانی عـــەرەبی قـــەیرانێکی ڕاگـوزەرە و بوونیشـی پەیوەسـتە بـە تـازەیی ئـەو زانسـتانە و تـــازەیی زانکـــۆ و ســـەنتەرەکانی توێژینـــەوە، ئێمـــەش هیـــوادارین بڵاوبوونـــەوەی پـــەروەردە و فێرکـــردن و ســـەنتەرەکانی توێژینـــەوە و هاتنـــە ئـــارای میتۆدەکـــانی زانســـتە کۆمەڵایەتییـــەکان و پەرەســـەندنی توێژینـــەوەی کۆمەڵایـــەتی و بـــە تایبـــەتی هەوڵـــە ســـەرکەوتووەکانی دیموکراســـی لـــە زیـــاتر لـــە شـــوێنێکی جیهـــانی عەرەبیـــدا بەدەربکەوێت.

## پاشکۆ ژمارە ٢

### پرسیارنامە لەبارەی تەلاق

### هۆکار و ئاسەوارە کۆمەڵایەتییەکان

**زنجیرەی فۆرمی راپرسی**

١. شوێنی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن

٢. مێژوویی چاوپێکەوتن

٣. واژووی توێژەر

**تێبینی:**

ئەو زانیارییانەی کە دەیبەخشیت نهێنییە و هچ کەس و لایەنێکی تر نایبینێت بەهەر هۆکارێك لە هۆکارەکان، تەنیا بۆ مەبەستی توێژینەوە بەکاردەهێنرێت.

**داتای تایبەت بە هەردوو هاوسەر**

١. رەگەز نێر ( ) مێ ( )

٢. شوێنی سەرەکی نیشتەجێبوون

شار(   )   ناحیە(   )

٣. شوێنی دانیشتن

لادێی (   )   شارنشین(   )

٤. تەمەن لەوکاتەی هاوسەرگیرت کردووە؟

(   )

٥. ژمارەی منداڵەکان لەکاتی روودانی تەلاق؟

نێرەکان (   )   مێیەکان   (   )   کۆی گشتی (   )

٦. باکگراوندی کۆمەڵایەتی و چینایەتی؟

باڵا(   ) ناوەند (   )   کرێکار(   )   جوتیار (   )

٧. ئاستی رۆشنبیری و پەروەدەیی؟

نەخوێندەوار   (   )

خوێندنی سەرەتایی   (   )

خوێندنی ناوەندی   (   )

خوێندنی ئامادەیی   (   )

پەیمانگا   (   )

خوێندنی باڵا   (   )

٨. پیشە

پیشەی ئازاد (بازرگانی ئاسنگەری، کشتوکاڵ_کڕین و فرۆشتن)   (   )

پیشەی کرێکاری و جوتیاری لە کەرتی گشتی   (   )

ئەو پیشانەی کە پێویستیان بە خوێندن هەیە لە پەیمانگا   (   )

ئەو پیشەیەی کە پێویستی بە خوێندنی زانکۆیی هەیە ( )

سەربازی ( )

ژنی ماڵەوە ( )

هەر پیشەیەکی تر ( )

## پرسیاری گشتی

٩. داهاتی مانگانە بە درهەم ( )

١٠. ئایا داهاتی مانگانەتان بەشی دابینکردنی پێداویستییەکانی خێزانی دەکرد

بەڵێ ( ) نەخێر ( ) تاڕادەیەك ( )

١١. ئایا خانوی نیشتەجێبونت هەیە؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

١٢. ئایا خێزانەکەتان لە خانوێکی سەربەخۆدا دەژیت بە دوور لە ماڵی هەردوو باوانی هاوسەر؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

١٣. ئەگەر وەڵامەکەت (نەخێر)ە ئەوا کێ لەگەڵیاندا دەژیت؟

خزمەکانی هاوسەر (نێر) ( )

خزمەکانی هاوسەر (مێ) ( )

هاوسەرێکی تر ( )

بێگانەکان ( )

١٤. ئایا یەکێك لە هاوسەرەکان یارمەتی خێزان دەدات لەڕووی داراییەوە؟

بەڵێ (   )                    نەخێر (   )

١٥. ئایا ئەو پارەمەتییە کێشەی لە نێوانتاندا دروستکردووە؟

بەڵێ (   )                    نەخێر (   )

١٦. ئەگە هاوسەرەکەت (مێ)فەرمانبەرە ئایا لەگەڵ تۆدا بەشداری دەکات لە خەرجییەکاندا؟

بەڵێ (   )                    نەخێر (   )

١٧. ئەگەر بەشداری ناکات، ئایا پێتوایە ئەمە هۆکارێك لە ڕوودانی ئەو کێشانەی بۆتە هۆی تەلاق؟

بەڵێ (   )          نەخێر (   )          تارادەیەك (   )

١٨. ئایا ئاستی ڕۆشنبیری و زانستیت یەکسانە بە ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی هاوسەرەکەت؟

بەڵێ (   )          نەخێر (   )          تارادەیەك (   )

١٩. ئەگەر وەڵامەکەت (نەخێر)ە ئایا ئەمە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی خراپ لەیەك تێگەیشتن و بێزاری لە نێوانتاندا؟

بەڵێ (   )                    نەخێر (   )

٢٠. ئایا ئاستی ڕۆشبیری و زانستیت بەرزترە لە ئاستی هاوسەرەکەت (نێر) ئەمەش هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بێزار ی و ڕودانی کێشە لە نێوانتاندا؟

بەڵێ (   )                    نەخێر (   )

٢١. ئایا تەمەنت یەکسانە بە تەمەنی هاوسەرەکەت؟

بەڵێ (   )          نەخێر (   )          تارادەیەك (   )

٢٢. ئایا جیاوازی لە تەمەن هۆکارێکە لە هۆکارەکانی تەلاقدان؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

٢٣. ئایا پەیوەندیت بە خزمەکانت بەهێزە؟

باش ( ) ئاسایی ( ) خراپ ( )

٢٤. ئایا هیچ کەسێك لە خزمەکانتان دەستی وەرداوەتە کاروباری خێزانی تۆ؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

٢٥. ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ)یە ئەوا جۆری ئەو دەستێوەردانە چییە؟

لەدایکبوونی منداڵ ( )

جێبەجێکردنی کاروباری ماڵ ( )

ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەڕێگای هەمو ئەندامانی خێزان ( )

دەستێوەردان لە کاروباری دارایی ( )

هەر دەستێوردانێکی تر ( )

٢٦. ئایا ئەو دەستێوەردانە لە کاروباری خێزانەکەت کاریگەری هەبوو لەسەر ڕودانی کێشە لە نێوانتاندا؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

٢٧. ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ)یە ئەو ڕێکارانە چیین کە هەریەکەتان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێش چونتان بۆ دادگا وەرتانگرتووە؟

لێکگەیشتن بۆ چارەسەری گرفت و ناکۆکیەکانی نێوانتان

پەنابردن بۆ کەسوکاری خۆت( )

پەنابردن بۆ کەسوکاری هاوسەرەکەت( )

پەنابردن بۆ هاوڕێییەکانی خێزان ( )

هەر ڕێکارێکی ترتان گرتۆتەبەر باسیان بکە.........

٢٨. لەو حاڵەتەی کە کێشە و ناکۆکییەکانتان چارەسەر نەبوبێت و کارەکە بە دادگا گەیشتبێت بۆ وەرگرتنی تەلاق، ئایا هەستتان کردووە کە ئاسانە ئەمە بەدەست بهێنێنن؟

بەڵێ ( )　　　نەخێر( )

٢٩. ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ)یە، ئایا پێتوایە ڕێگا پێدانی یاسا بۆ وەرگرتنی داواکاری تەلاقدان بەو کەسانەی ئارەزووی تەلاقدانیان هەیە هۆکارێك بووە لەو هۆکارانەی کە پاڵی پێوەناون بۆ وەرگرتنی تەلاق و جیابونەوە؟

بەڵێ ( )　　　نەخێر( )

٣٠. ئەگەر وەڵامەکە (نەخێر)ە ئایا دادگا هەوڵیداوە یارمەتیان بدات لە چارەسەرکردنی کێشەکانتان و بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەریتان؟

بەڵێ ( )　　　نەخێر( )

٣١. ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ)یە ئەو ڕێکارانە چین کە دادگا گرتوتیە بەر لە هەمبەر ئەو بابەتە؟

دیاری بکە........................

## داتای دوای تەلاق

٣٢. هەست بەچی دەکەیت دوای ڕودانی تەلاق؟

ڕەزامەندی ( )　پەشیمانی و دڵتەنگی ( )

٣٣. ئایا دوای تەلاق هاوسەرگیرت کردۆتەوە؟

بەڵێ ( ) نەخێر( )

٣٤. ئەگەر وەلامەکە (بەڵێ)یە ماوەی نێوان تەلاق وەرگرتن و هاوسەرگیرییە تازەکە چەندە:

ماوەکە دیاری بکە........

٣٥. ئایا پاڵنەرەکانی هاوسەرگیری چییە؟

نەتوانینی ژیان بێ هاوسەر ( )

فەراهەمکردنی چاودێری منداڵان ( )

بە مەبەستی یارمەتی دارایی و لە ئەستۆگرتنی خەرجییەکانی خێزان( )

هۆکاری تر دیاری بکە...........

٣٦. دوای رودانی تەلاق ئەو لایەنە کێ بوو کە ئەرکی چاودێریکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانی لە ئەستۆ گرتووە؟

باوك یان خێزانە رەسەنەکەی خۆی ( )

دایك یان خێزانە رەسەنەکەی خۆی ( )

رۆڵی چاودێری منداڵ کە دەوڵەت لە ئەستۆی گرتووە( )

لایەنی تر دیاری بکە..........

٣٧. ئایا پێتوایە تەلاق کاریگەری نێگەتیڤی هەبوو لەسەر کەسایەتی و بەکۆمەلایەتیبوونی منداڵەکان؟

زۆر ( ) تا ئاستێك( ) کاریگەری نەبووە ( )

٣٨. ئەگەر تەلاق کاریگەری لەسەر منداڵەکان هەبووە ئایا جۆری ئەو کاریگەرییە چییە؟

دەبەدەربوونی منداڵەکان (       )

بایەخ نەدان بە منداڵەکان (       )

بێبەشبوونیان لە سۆزی یەکێك لە باوان(       )

کاریگەری تر دیاری بکە......

٣٩. ئەگەر کاریگەری نێگەتیڤی هەیە ئەوان چین باسیان بکە؟

.١

.٢

.٣

٤٠. ئایا پێتوایە تەلاق کاریگەری پۆزەتیڤی هەیە لەسەر منداڵەکان؟

بەڵێ(       )   نەخێر(       )   تارادەیەك(       )

٤١. ئەگەر وەڵامەکە(بەڵێ)یە ئەوا کاریگەرییە پۆزەتیڤەکان چین؟

فەراهەمکردنی دڵنیایی دەروونی بۆ منداڵەکان (       )

دووکەوتنەوە لە ناکۆکی و کێشە لە نێوان باوان (       )

کاریگەری تر چین دیاریان بکە................

٤٢. ئایا پێتوابە تەلاق کاریگەری پۆزەتیڤی هەبووە لەسەر خود هاوسەرەکە؟

بەڵێ (       )   نەخێر(       )

٤٣. ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ)یە ئەوا ئەو کاریگەرە پۆزەتیڤانە چین؟

چارەسەرکردنی کێشە خێزانییەکان(       )

فەراهەمکردنی ئارامی دەروونی بۆ هاوسەرەکە ( )

دوورکەوتنەوە لە بەریەککەوتن و ناکۆکی خێزانی

کاریگەری تر دیاری بکە..............

پاشکۆی ژمارە ١
هەنگاوەکانی پلاندانانی توێژینەوەی ڕووپێو




ئەم وێنەیە لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: مناهج البحث في العلوم الاجتماعية و التربية، لويس كوهين و لورنس مانيون ، سەرچاوەی پێشوو